



# میژوو



گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە
کۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژوویی
کوردستان دەریدەکات

- باروودۆخی سیاسی هەولێر و ڕۆڵی هەولێر لە پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکان و ڕووداوەکاندا ١٩٣٩ - ١٩٥٨
- باروودۆخی بازرگانی و دارایی کوردستان لەسەردەمی عەباسیدا
- دۆزی کورد لەجەنگی یەکەمی جیهانی یەوە تاکو پەیماننامەی لۆزان
- من مفكرتي، ذكريات ضابط عراقي في الحرب العالمية الأولى
- بەهەشتی شوکور مستەفا لەچەند نامەیەکدا



ژمارە ١٨
ساڵی پێنجەم
بەهاری ٢٠١١

# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی کوردستان دەریدەکات

**خاوەنی ئیمتیاز**

پرۆفیسۆر د. ئەرسن موسا رەشید

**سەرنوسەر**

د. محەمەد عەبدوڵلا کاکەسوور

٤٧٨٠٥٢٨

makakasur@yahoo.com

**سکرتێری نووسین**

م. فارس قادر فەقێ عەبدوڵلا



**تایپیست**

احمد عمر علی

٠٧٥٠٣٠٣٠٥٠٥

**بەرگ و نەخشەساز**

هیمداد محەمەد ئەرگوشی

ژمارە (١٨) سالی پێنجەم بەهاری ٢٠١١






| **هەموو ئەو بابەتانەی لە گۆڤاری مێژوو بلاودەبنەوە نوسەرەكانیان لێیان بەرپرسیارن تەنیا سەروتار نەبێت كە گۆڤاری مێژوو لێی بەرپرسیارە** |
|---|

- **گۆڤار : مێژوو**
- **ژمارە : ( ١٨ )**
- **تیراژ : (٧٠٠) دانە**
- **چاپخانە : رۆژهەلات**

**كوردستان / هەولێر - كۆلانی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێر**

g.mezhu@yahoo.com

g.mezhu@hotmail.com

# پێرست

## ◂ سەروتار

## ئێستا و ئەو كات

## بەرەو كۆنگرە

## ◂ توێژینەوە



## ◂ القسم العربی



## ◂ كەشكۆڵی گۆڤار

# ئێستا و ئەو کات

**سەرنووسەر**

لەدوای دەرچوونی ( ١٨ ) ژمارە لە گۆڤاری مێژوو و ئەو ماوەی تەمەنی کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان لە نێوان ژمارە ( ١ ) و ژمارە ( ١٨ ) دا چەندین هەنگاوی باش نراوە , ئێستا دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە لە کوردستان خەریکن کێ بڕکێ ی کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەکەن لە دەرکردی زنجیرە کتێبی مێژوویی و گرنگی دان بە بابەتی مێژوویی .
دەزگای ڕۆژهەڵات پرۆژەیەکی نەتەوەیی گرنگی لە ئامێز گرتووە ئەویش وەرگێرانی کتێبە پرۆگرامییەکانی چوار ساڵی بەشی مێژووە بۆ زمانی کوردی یان چاپ کردنی کتێبی دانراو لەسەر بابەتەکانی پرۆگرامی خوێندن لە بەشەکانی مێژوودا .
ئەمە دوای ئەوەی کە بینیان خەڵك پێشوازییەکی گەرمی لە کار و چالاکییەکانی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژوویی کوردستان کرد تەنانەت دوای دەرچوونی هەر ژمارەیەکی گۆڤاری مێژوو کتێب فرۆش لە زۆربەی قەزاو ناحیەکانی کوردستان داوای گۆڤارەکە دەکەن , ئەمەش ئەوە بە دەر دەخا کە پەیتا پەیتا ڕۆشنبیریی مێژوویی پتر لە کوردستان بڵاو دەبێتەوە . بەمەش دەتوانین بڵێین کۆمەڵەکەمان تا ڕادەیەك سەرکەوتوو بوو لەو ئامانجەی کە بۆی دامەزراوە ئەویش بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی مێژوویە لە کوردستان دا
هیوادارین کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵە گوروتینێکی زیاتر بە کارو چالاکییەکانی

خزمـەت کردنـی بـواری مێـژوو لـە کوردسـتان بـدات بـە تایبـەتی کـە تـاکو ئێـستا توانیومانە پەیوەندی لە نێـوان مێـژوو نووسـانی کـورد و وڵاتـی لوبنـان و بریتانیـا دروسـت بکـەین و بـە پێـشنیارو بەشـداری هـەموو ئەنـدامانی کۆمەڵـە چاوەڕوانی پێشکەوتنی پترین .

# بەرەو کۆنگرە

م.شوان محمدامین خۆشناو

بۆ هەر پارت رێکخراو و کۆمەل و دەستە و گروپێکی کۆمەلایەتی، سیاسی، مەدەنی، ئابوری، پیشەیی و رۆشنبیری و...هتد کەتێیدا ئەندامانی ئەو بوارە کۆدەکاتەوە و لەچوارچێوەی رێکخراویکدا رێکیان دەخات لەگەل روودانی گۆرانکاری لە بارودۆخ و هاتنەکایەی هەل ومەرجی نویَ و بەگوێرەی پەیرەو و پرۆگرام و برگە یاساییەکانی کەلە کۆنگرەدا بریاری لەسەر دەدری و سەقفیکی زەمەنی بۆ ماوەی نێوان بەستنی کۆنگرەکان دادەنریَ ، ئیتر کۆنگرە جگە لەشەرعیەتدانی زیاتر بەو کۆمەلەیە خوێنێکی نویَ دەخاتەوە بەر گیانی کۆمەڵەکە و ئەندامانی لەپرۆسەیەکی دیموکراسیدا دەستەیەکی نوی بۆ بەرێوەبردن و ئاراستەکردنی کۆمەڵەکە بەرەو قۆناغێکی نوێتر هەلدەبژێرن.

ئیمەش وەکو کۆمەلەی رۆشنبیری مێژویی کوردستان بریارە کۆنگرەی دووەمی خۆمان لە لە٢٠١١/٥/٢دا ببەستین لەپێناو سەر لەنویَ دارشتنەوەی مێژووی کوردستان و پاککردنەوەی لە چەواشەکاری و بلاوکردنەوەی وشیاری مێژوویی لای تاکی کورد و برەودان بەبواری مێژوودا لە ژێر دروشمی (لەبەر رۆشنایی مێژوو بەرەو ئایندە هەنگاو دەنێین) ئیتر بەو هیوایەی کۆنگرەی دووەمی کۆمەلەکەمان ببێتە هەنگاوێکی ئەرێنی بۆ بەدیهاتنی ئەو ئامانجانەی کۆمەلەکەمان لە پێناوی دامەزراوە و خۆبەخشانە هەوڵی بۆدەدات.

# بارودۆخی بازرگانی و دارایی کوردستان لەسەردەمی عەباسیدا

پ.ی.د. ئاکۆ برهان محمد

**یەکەم / بارودۆخی بازرگانی :-**

**أ- پەیوەندیە بازرگانیە ناوخۆییەکان :**

مەبەستمان لە بازرگانی ناوخۆیی بزاوتی ئاڵوگۆڕی بەرهەمە تایبەتیەکانی بەکاربردنی ناوخۆییە جا جۆرەکانی خواردەمنیەکان بێت یاخود دروستکراوەکان کە لە چوارچێوەی شارەکان و گوندەکانی کوردستان ئەنجام دەدرا ، ئەم بازرگانیەش زیاتر پشتی بە ڕێگەی ووشکانیەوە دەبەست ، وە هەرچەندە بەروبومی کشتوکاڵی و زەوی تایبەتمەندێتی لە پیشەگەری و دروستکراوەکانی زیاتر بێت چ لە گوند یاخود لە شارەکان ئەوا زێدە بەرهەم دێتە کایەوە واتە فایز کە بۆ ساغکردنەوەی بازرگانی پێدەکرا .

بازرگانی ووڵات لە بەرهەمە کشتوکاڵی و پیشە گەریەکانی ناوخۆیی لە مەڵبەندەکانی بەرهەم هێنان دەبردران بۆ ناوچەی بەکاربردن بە گوێرەی پێویستی ئەم ناوچانەو بازارەکانیان بۆ کاڵاکان .

بەشێك لە بەرهەم و کاڵا هاوردەکانی دەرەوەی کوردستان بازرگانی ناوخۆشی پێدەکرا ، بۆ خۆماڵیکردنی پێداویستی بازارەکان هەروەکو هاوردەی شەکر کە بەشێکی بۆ جارێکی تر بازرگانی ناوخۆییان

پێــدەکرد (١) ، چــونکە بازرگــانی نــاوخۆیی ڕێگــە چــارەیەکە بــۆ دابەشکردنی کاڵا هاوردەکان بۆ سەرجەم ناوچە پێداویستیەکان .

لە دیارترین فاکتـەرەکانی چالاکیەکانی بازرگانی ناوخۆیی بوونی بەروبوم لە هەندێ شوێنی تایبەت و نەبوونی یاکەمی لە هەندێ شوێنی تر کە خواستی لەسەر دروست دەکرد ، وەکو زۆری گوێزو هەنجیرو تریێ لـە ناوچـە شـاخاویەکان بەرامبـەر کـەمی لـە ناوچـەی تـردا ، جگـە لـە فاکتەری خواستی بەردەوامی دانیشتوانی شارە گەورەکان کە بازاڕیان هەمیشە ئاوەدان بوو ، بەم جۆرە چەندین بازرگان توانیان سامانی زۆر کەڵەکە بکەن بە هۆی بازرگانی ناوخۆییەوە (٢) .

جێی ئاماژەیـە کـە ئـافرەتیش کـاری بازرگـانی ئـەنجام داوە هـەروەك مێژوونووس (الصفدي) ئامـاژە دەکـات کە ئـافرەتێکی خـەڵکی گونـدێکی ڕۆژئـاوای هـەرێمی چیا بـۆ فرۆشـتنی بەرهەمـەکانی ڕووی لـە شـارەکان دەکرد (٣) .

دیارترین و گرنگترین کاڵاکانی بازرگانی ناوخۆیی ئەمانەن :

١- کاڵا خۆراکیەکان :

هـەروەك لەمـەوپێش ئاماژەمـان پێکـرد کـە کوردسـتان وڵـاتێکی بـە پیت بووە یارمەتی داوە بۆ بەرهەم هێنانی کاڵای خۆراکی جیاواز ، بەڵام هەندێ ناوچە زێدە بەرهەمی بەرهەم دەهێنا بەرامبەر هەندێ ناوچەی تر ، وەکو دانەوێڵـەی گـەنم و جـۆ کـە لـە ناوچـەی (تـەل فافـان ) زۆر بەرهـەم دەهێنـرا و بازرگـانی پێـدەکرا لەگـەڵ ناوچـەکانی تـر ، هـەروەها شـاری (نـسێبین) بەرهـەمی ئـاردی زۆر بـووە و نـاردەی شـارەکانی تردەکـرا ، وە

لەبەئەوەی شەکر لە کوردستان بەرهەم نەدەهێنرا لە دوای هاوردەکردنی بازرگانەکان بازرگانی ناوخۆییان پێدەکرد بە تایبەتی لە نێوان شارەکانی (شەنگار ) و (سەرکانی) و (حەران ) ، شاری (حولوان ) کە بە هەنجیر ناسراوبوو ووشك دەکرایەوەو ناردەی شارەکانی تر دەکرا ، لە شاری (شەنگار) هوە تۆوی ووشککراوی هەناری گەورە ڕەوانی شارەکانی تر دەکرا ، زێدە بەرهەمی ترێ لەشاری (جەزیرە ) ناردەی شارەکان دەوروبەری دەکرا ، وەهەر لەو کاتەوە لە (شەقلاوە) ترێ ناردەی هەولێر دەکرا ، هەرمێ زێدە بەرهەمێکی (شنۆ) بوو دەنێردرایە شارەکانی دەوروبەری بۆ فرۆشتن ، سێوی هەندێ لە شارەکان ناردەی شاری دیکە دەکران وەکو سێوی (بەدلیس) (٤) .

سەبارەت بە کاڵاکانی تری وەکو هەنگوین شاری (جەزیرە ) پێی ناسراو بوو ناردەی شارەکانی دەوروبەری دەکرد (٥) ، وە پەیوەندیەکی بازرگانی بەتین هەبوو لە نێوان شارەکانی (بروجرد) لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان لەگەڵ هی تر کاتێك بەروبومی میوەی جۆراوجۆر و بەرهەمی کشتوکاڵی لەگەڵ شارەکانی (دینەوەر) و (هەمەدان) ئاڵوگۆڕ پێدەکرد (٦) ، گوندکانی ئەم دەڤەرەش ناودار بوون بە بەرهەم هێنانی پەنیر و بازرگانیان پێدەکرد لەگەڵ شارەکاندا بەتایبەتی (دینەوەر) (٧) .

٢- ماسـی :

کوردستان ماسی جۆراوجۆری هەبوو لە ناو ڕووبارو دەریاچەکانی ، شارەکانی نزیکیان زێدە بەرهەمی ماسیان ناردەی شارەکان تر دەکرد بەتایبەتی شاری (خەڵات) کە دەڕوانێتە سەر دەریاچەی (وان) بێ ژمار

ماسی بچوکیان لێ ڕاو دەکرد و دەیاناردە شارەکانی تر (٨) ، وە لەشاری (سەرکانی ) جۆرێکی تایبەت لە ماسی ناردەی شارەکانی تر دەکرا (٩) .

٣- بازرگانی مـەی :

بازرگـانی مـەی چـالاك بـوو بەتایبـەتی لـەم ناوچـانەی کەمەسیحیەکانی لێ دەژیا بە تایبەتی لە هەرێمی جەزیرە بازرگانی پێدەکرا ، بۆ نموونە لە دێرەکاندا دروست دەکراو دەنێردرایە شارەکانی وەکو (سەعەرد) و (ئەرزەن ) بۆ فرۆشتنی (١٠) ، دەقێکی مێژوویی هەیە باس لەمە دەکات کەلە باکوری هەرێمی جەزیرە دێرێك بە ناوی (ئەبو یوسف ) مەی لێ دروست دەکراو کاروانە بازرگانیەکان دەچوون بۆکڕینی و فرۆشتنەوەی لە شارەکاندا بە نرخێکی زۆر بەرز لەبەر نایابی جۆرەکەی (١١) .

٤- رستن و چنین :

ئامارژەی کەم هەیە لەسەر بازرگانی رستن و چنین ، وەکو ئەوەی کەلە (حەزە) ی نزیك (هەولێر ) دروست دەکراو لە شاری (هەولێر ) دەفرۆشرا (١٢) ، هەروەها لەشاری (ماردین ) ەوە کەجیاواز بوو بە بەرهەم هێنانی قوماش کەوا ناردەی شارەکانی تر دەکرا (١٣) .

٥- بازرگانی ئاژەڵ :

لە دیارترین جۆری بازرگانی ناوخۆی ئاژەڵ جۆری مەڕی شاری (ورمێ ) یە کە ناردەی شارەکانی هەرێمی جەزیرە دەکرا (١٤) ، بە هەمان شێوە مەڕو ئاژەڵی تر لە نێوان (شنۆ ) و شارەکانی هەرێمی جەزیرە بازرگانیان پێدەکرا (١٥) .

٦- بازرگانی شووشەوات :

شووشەوات لە دیارترین کاڵا بازرگانیە ناوخۆییەکانە ، وەکو ئەوەی لـە شـاری (نـسێبین ) دەردەهێنـراو پێداویـستی لێ بەرهـەم دەهێنـرا و ناردەی شارەکانی تـر دەکرا (١٦)، جگـە لـە بەرهـەم هێنـانی لـە ناوچـەی (ماردین) ناردەی ناوچەکانی تر دەکرا (١٧) .

٧- بازرگانی دەرمانی پزیشکی :

ئەمەشیان بازرگانی ناوخۆیی پێدەکرا وەکو دەرمـانی (خواردنـەوەی هلیۆن ) کە لەچیاکان دەردەهێنرا و بازرگانان لە شارەکاندا دەیانفرۆشت بەتایبـەتی شـاری (هـەولێر) کـە سـاڵانە کاروانـە بازرگانـەکان بازرگانیـان پێدەکرد (١٨) ، هەروەها لەنێو شارەکانی هەرێمی دیاربەکر بازرگـانی بە دەرمانی هەمە جۆر دەکرا (١٩) .

ب – بازرگانی دەرەکی :

کوردستان بەهۆی پێگـەی جوگرافی مەڵبەنـدێکی گرنگـی بازرگـانی دەرەکی بوو ، پەیوەندیە بازرگانیەکان قووڵ بوو لەگـەڵ هـەرێم و وڵاتـان بەتایبەتی وڵاتانی دراوسێ ، بازرگانانی وڵاتانی دوورو نزیـك ڕوویـان تێدەکرد بە مەسەلەی بازرگانی کردن ، پەیوەندیەکانی کوردسـتان لەگـەڵ عێراق زۆر بەهێز بووە بەهۆی نزیکی لە پایتەختی خەلافەتی عەباسی کە چەقێکی گرنگی بازرگانی دەرەکی بوو لەم کاتەدا ، بەهۆی ئاسانی ڕێگا بازرگانیـەکان پەیوەنـدی بازرگـانی هـەبوو لەگـەڵ سـەرجەم شـارەکانی عێـراق سـەرەتای پەیوەندیـەکانیش دەگەڕێتـەوە بـۆ ناوەڕاسـتی سـەدەی دووەمی کۆچی / هەشتەمی زایینی ، بەتایبەتی (حولـوان ) و (هەمـەدان )

و (قەرمیسین) ، پاشان پەیوەندیەکان زۆر بەر فراوان بوون و کاروانی بازرگانی بەرێك وپێکی کاریان ئەنجام دەدا ، هەروەها لەگەڵ وڵاتی شام پەیوەندی پتەوی بازرگانی هەبوو بەتایبەتی لەگەڵ دیمەشقدا ژمارەیەکی زۆری بازرگانانی کورد ڕوویان تێدەکرد بەمەبەستی ئاڵوگۆڕ.

لەگەڵ دەوڵەتی (بێزەنتی )پەیوەندی بازرگانی هەبوو بەتایبەتی شاری (نسێبین) کە نزیك بوو لەسنوورەکانی (بێزەنتیەکان) و بازرگانانی ئەوان ڕوویان تێدەکرد ، بەهەمان شێوە لەگەڵ وڵاتی (فارس)دا بازرگانان ئاڵوگۆڕیان دەکرد.

لەگەڵ وڵاتە دوورەکان پەیوەندی بازرگانی هەبوو وەکو هەرێمی ( خۆراسان) هاوردەو ناردەیان لەگەڵ کوردستاندا ئەنجام دەدا ، چەندین بازرگانی کورد بازرگانیان لەگەڵ کردووە ، هەروەها لەگەڵ وڵاتی (چین) کە چەندین بازرگانانی شارە کوردیەکان ڕوویان تێ کردووە وەکو نموونەی بازرگان (محمد بن عبدالرحمان بن اسماعیل الجزري ت٧٠٢ك/١٣٠٢ز) کە سێ جار بەمەسەلەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی چوویتە (چین) بەهۆیەوە زۆر دەوڵەمەند بوو کاتێك پارەکەی لەپێنج سەد هەزار دینار بووەتە پەنجا هەزار دینار ، جگە لە پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی (هیندستان) و(یەمەن) و (بەحرێن) و (میسر) (٢٠).

یەك/ کالاناردەکان : لە دیارترین و گرنگترین کالاناردەکان ئەمانەن :

١- رستن و چنین :

لەکوردستاندا رستن و چنین زۆربەرهەم دەهێنراو بەشێکی ڕەوانەی دەرەوە دەکرا وەکو جل و بەرگ و دەسەسرو پۆشاکی تایبەت بە زانایان

کـە لـە شـاری (ئامـەد ) ەوە نـاردەی دەرەوە دەکـرا (٢١) ، وە پۆشـاکی لۆکەیی لە شاری (سەرکانی ) یەوە ناردەی وڵاتی شام دەکرا (٢٢) ، وە قوماشی لۆکەیی (شارەزوور) رەوانەی (بەغدا ) (٢٣) و (وڵاتی شام ) و (میسر ) دەکرا (٢٤) ، یەك لـە مێـژوو نووسـان دەگێڕتـەوە کەوا کـورد لـە پێشەنگی ئەوانە بووینـە کـە لۆکـەیان ناردۆتـە (وڵـاتی شام) لەسەدەی چوارەمی کۆچی /دەیەمی زایینی (٢٥) .

ڕایەخ وفەرش لە چەند شارێکەوە دروست دەکران لە خوری و کەتان بەتایبەتی لە شاری (بەدلیس) ڕەوانەی دەرەوە دەکرا(٢٦) .

جـۆرە قوماشـێك لـە (مـاردین ) بەرهـەم دەهێنـرا بـەناوی (بۆشـێرام) نـاردەی وڵاتـان دەکـرا لەوانـە (قوسـتەنتینیە ) ی پایتـەختی دەوڵـەتی بێزەنتـی و شـاری (عـەکا) لـە وولاتـی شـام و لـەوێش ڕا نـاردەی ئـەورووپا دەکـرا ، هـەروەها (بەشمەلە) کـە قوماشێك بوولـە ئاوریشم و خـوری بـزن دروست دەکراو ناردەی دەرەوە دەکرا (٢٧) .

٢- خۆراك :

لەدیارترین ناردەکانی کوردستان وەکو هـەنار لـە ناوچـەی (حولـوان) نـاردەی (عێـراق) دەکـرا ، هـەروەها لەشـاری (شـەنگار ) ەوە ئـەم کاڵایـە ڕەوانەی وڵاتان دەکرا لەوانـە (عێراق) ، سـێوی (بـەدلیس ) و (خـەڵات ) ناردەی ناوچەکانی (شام ) دەکرا ، هەنجیری (حولـوان ) نـاردەی وولاتـان دەکـرا ، تـرێ لەناوچـەی قەندیلـەوە نـاردەی (عێـراق ) دەکـرا ، زەیتـونی (شەنگار) ڕەوانەی دەرەوە دەکرا ، کونجیەکەی رەوانەی (عێـراق ) دەکـرا ،لیمۆکەشی بەرێژەیەکی زۆر ناردەی (بەغدا) دەکرا.

ئارد لە شارەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکانەوە ناردەی (بەسرە) دەکرا ، گەنم وجۆش زیاتر ڕەوانەی (بەغدا ) دەکرا ، گوێز لە (حولوان)ەوە ڕەوانەی شاری (کوفە ) دەکرا ، خوێ ناردەی (بەغدا ) دەکرا ، پەنیری (حولوان) ناردەی (عێراق) دەکرا بەتایبەتی (کوفە) ، پارچە گۆشتی چارەسەرکراو بەخوێ و بەهارات لەهەرێمی (جەزیرەوە) ناردەی (خۆراسان) دەکرا (٢٨) .

٣- کانزاکان :

لە دیارترینیان ماددەی ئاسنە کەلە (دیاربەکر) ەوە ڕەوانەی دەوڵەتی (بێزەنتی) دەکرا (٢٩) ، لە (نسێبین) ئاسن ناردەی (عێراق) دەکرا (٣٠) ، وەلە (وان ) ناردەی (بەغدا) دەکرا (٣١) ، ماددەی مس لە شاری (سەعەرد) ەوە ناردەی وڵاتان دەکرا (٣٢) ، هەروەها لە (ئەرزەن ) ەوە ناردەی وولاتانی تر دەکرا (٣٣) ، ماددەی قیر لە هەرێمی (جەزیرە) ەوە ڕەوانەی بەغدا دەکرا(٣٤) .

٤- بەردی بەنرخ ونایاب :

لە دیارترینیان بەردی لازەوەرد کە جۆرێکی شەفاف ورەقە ، بەڕێژەیەکی زۆر لە ناوچەی (هەکاری) دابوو (٣٥) ، جگە لە ناوچەی تر ڕەوانەی (حیجان) و (خۆراسان) و (عێراق) دەکرا (٣٦) ، شوشەی نایاب لە (ماردین) ەوە ڕەوانەی وڵاتان دەکرا بەتایبەتی دەوڵەتی (بێزەنتی) و(عێراق) (٣٧) .

٥- بۆن :

لە شاری (نسێبین ) کە گوڵاوی لێدروست دەکرا زۆری لێ ڕەوانەی دەرەوە دەکرا وەکو شارەکانی (حەلەب) (٣٨) و(دیمەشق) (٣٩) و (وڵاتی میسر ) (٤٠) .

٦- ئاژەڵ و مەل :

ئەسپ لەو كاتەدا بەناوبانگ بوو لەكوردستان بەتايبەتی هی (شەنگار-شەنگال) لەبەرئەوە ناردەی (ووڵاتی شام ) و (خۆراسان) دەكرا، وە ئێستر ووڵاغێك بوو رەوانەی (عێراق) و (هیندستان) دەكرا ، هەروەها مەڕ لە شاری (شنۆ) ەوە ناردەی (عێراق) دەكرا ، لە (هەمەدان) ەوە سمۆرەو ڕیوی بۆ (بەغدا) رەوانەی دەكرا ، وە كەو ناردەی دەرەوە دەكرا (٤١) .

٧- ماسی :

ناودارترین جۆری ماسی كە ناردە دەكرا ماسی (الطريح ) بوو كە جۆرێكی بچووك بوو لەدوای چارەسەركردنی بەخوێ و ووشك كردنەوەو هەڵگرتنی دەتوانرا بۆ دەرەوە بنێردرێ وەكو ماسی دەریاچەی (وان) ناردەی (عێراق) (٤٢) و (شام) (٤٣) و (دەوڵەتی بێزەنتی) (٤٤) و (هیندستان) دەكرا (٤٥) .

٨- دار :

زیاتر لەشارەكانی (بەدلیس) و(خەڵات) ناردەی دەرەوە دەكرا (٤٦) ، وە لەناوچە چیاییەكانی هەرێمی (جەزیرە) ناردەی (عێراق) دەكرا (٤٧) ، هەروەها لەچیای (قەندیلەوە) داری گەورە دەبڕانەوە وناردەی (عێراق) دەكرا (٤٨) .

دوو/ كاڵا هاوردەكان : لە دیارترین و گرنگترین كاڵاومادده هاوردەكان ئەمانەن :

١- رستن و چنین :

لەگەڵ ئەوەی كوردستان لەكاتی باسەكەماندا ڕستن و چنینی بە جۆرە جیاوازەكانیەوە ناردە دەكرد بەڵام پێداویستی بەهەندێكی تری

تایبەت هەبوو وەکو ئاوریشمی چینی و قوماشی هیندی ، کە لەپێناوی هاوردەکان ڕێگەی دوور وسەختیان بڕیوە بەتایبەتی ڕێگەی ئاوریشمی مەزن (طریق حریر العظیم ) ، لە دیارترین هاوردەکان جل و بەرگ لە شاری (عەدەن) لە یەمەن و (نیساپور) و (مەڕۆ) لە خۆراسان ، هەندێکی تر لە (ترابزۆن ) ی بێزەنتی هاوردە دەکرا ، جگە لە جۆرێك لە کەرەسەی خاوی کەتان بۆشاری (ئامەد) هاوردە دەکرا.

لۆکەو پۆشاکی ڕەنگاوڕەنگی شاری (ڕەی) لە خۆراسان و ناوچەکانی (شاش) و (فرغانە) ەی نزیك چین لە تورکستان هاوردە دەکرا ، هەروەها لۆکەی (ئەسفەهان ) و (شام ) و جل و بەرگی ( میسر) هاوردە دەکرا (٤٩).

٢- خۆراك :

لەدیارترینی وەکو شەکر لە (میسر) کە ئەم وڵاتە زۆر پێی ناسراو بوو هاوردە دەکرا ، هەروەها زەیت لەشارەکانی (عێراق) هاوردە دەکرا وەکو (کوفە) بۆ ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان ، وە لە (بەغداوە) بۆ هەرێمی جەزیرە هاوردە دەکرا ، خورما لە (بەسرە) و هەنگوین لە (هیند) و گەنم و دۆشاوو برنج و کونجی لە (شام ) ، شیرنەمەنی لە (خۆراسان) هاوردە دەکران (٥٠) .

٣- بۆن وبەهارات :

جۆرو نایابەکەی لە وڵاتانی ڕۆژهەلاتەوە دەهێنرا بەتایبەتی لە (هیند ) و (چین) ، بۆنی میسك کە بەنرخ بوو لەم کاتەدا لە (چین ) و (ئەندەنۆسیا) و ( سیند ) ی نزیك هیندستان هاوردە دەکرا (٥١) ، هەروەها کافور لە (هیند) (٥٢) و زەعفەران لە (ئەسفەهان ) هاوردە دەکران (٥٣) .

٤- سابون : سابون کە وڵاتی (شام ) لەم سەردەمەدا پێی ناسراو بوو بەتایبەتی شاری (حەلەب ) کەزیاتر هەرێمی دیاربەکر هاوردەی سابونەکەی دەکرد (٥٤) .

٥- بەردی گرانبەها :

وەکو بەلخش کە بەردێکی سووری شەفافە لە ناوچەی (بەلخشان ) (٥٥) , هاوردەی شاری (هەولێر) دەکرا (٥٦) ، هەر بازرگانانی ( هەولێر) گەشتیان دەکرد بۆ ناوچەکانی کەنداو بە مەبەستی هاوردە کردنی لوءلوء (٥٧) .

٦- کانزاکان : بەتایبەتی زێر کە هاوردە دەکرا لە ناوچەکانی (هیند ) و (ئەندەنۆسیا) (٥٨) و (عێراق ) (٥٩) و (فارس) (٦٠) ، وەبەرهەمی ئاسن لەووڵاتی (شام) (٦١) و کانزای تر لە (عێراق) هاوردە دەکرا (٦٢) .

٧- چەك :

چەکەکانی (هیندستان ) لە شمشێرو خەنجەر و تیروکەوان بەگشتی هاوردەی ناوچەکانی تر دەکرا وەکو ( کەنداو) و (عێراق ) ئینجا بۆ شارە کوردیەکان هاوردە دەکرا (٦٣) ، هەروەها شمشێری (جرجان ) و (تەبەرستان ) و (دەیلەم) لەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتەوە هاوردە دەکرا (٦٤) ، تیروکەوان و خەنجەرو درعی سینگ لە (شام ) ەوە هاوردە دەکران (٦٥) .

٨- کاڵای تر :

کاڵای تر زۆرن گەر باسیان بکەین بۆ هاوردە کردن دیارترینیان لە (شام ) ەوە شوشە (٦٦) و کاغەز (٦٧) و مۆم (٦٨) ، وەکەل وپەلی ناوماڵی وەکو دەرمانی پزیشکی وسینی لە (چین ) ەوە -هەر لەبەر ئەمەش ئەم ناوەی لێنراوە -هاوردە دەکرا (٦٩) .

ج- چینەکانی بازرگانان : لە کوردستاندا چەند جۆرێك لەچینی بازرگانی لەم سەردەمەدا هەبوون ئەمانەن :

١- بازرگانی گەشتیار (السفار) :

واتە ئەم بازرگانەیە کە گەشت دەکات بۆ وڵاتانی جیاواز بەبێ گوێدانە ئەستەم وگرفتەکان ، زانیاری تەواو لەسەر نرخ و جۆری کاڵاکان کۆدەکاتەوە بۆ قازانج ، نموونەی ئەم بازرگانەشمان زۆرە لە کوردستان .

٢- بازرگانی ناوخۆیی :

واتە لە چوارچێوەی شار یاخود وڵات دەرنەدەچوون ، ئەم چینەش زۆرترین چینی بازرگانیان پێکدەهێنا زیاتریش خەڵکی دوکانداروناوبازارکان بوون بەڵام قازانجیان وەکو بازرگانی گەشتیاری نەبوو ، نموونەی زۆرمان هەیە لەکوردستان .

٣- بازرگانی ئەمبارکار (الخزان) :

واتە ئەم بازرگانەی کاڵاکان لە کاتێکدا دەکرێت و ئەمباری دەکات هەڵیدەگرێت لەکاتی خواستی زۆر لەسەری ئینجا دەیخاتە ناوبازار وقازانجی زۆری لێ بەدەست دێنێت و نموونەی دیارمان هەیە لەکوردستان .

٤- بازرگانی ئامادە :

چینێکی تری بازرگانەکانە لە کوردستان باو بوو ، ئەمەیان گەشت ناکات بۆ وڵاتانی تر بەڵکو وەکیلی دەستپاکی هەیە دەینێرێت بۆ وڵاتان و لەوێ دەمێنێتەوە وبازرگانەکەش کاڵای پێویستی بۆ ڕەوانە دەکات بۆ ئەوەی بۆی بفرۆشێت ، لەهەمان کاتدا وەکیلەکان کاڵای پێویست لەوێ دەکڕن و دەینێرنە وڵاتی بازرگانەکە هەروەکو لقەکانی کۆمپانیا بازرگانیەکانی ئێستاماندا کاریان دەکرد (٧٠) .

دووەم / باری دارایی :-

١- داهاتە داراییەکان و باجەکان :

أ- خەراج :

باجێکی دانراوی دیاریکراوە لە سەر زەویە کشتوکاڵیەکان ، دیارترین جۆرەکانی داهاتی دارایی دەگەیەنێت لەکوردستاندا ، بەم جۆرەی خوارەوە بوو :

- ڕووبەری (المساحة ) : باجێکی دیاریکراوی پارەیە لەسەر ڕووبەرێکی زەوی کشتوکاڵی دەسێنرێت بەگوێرەی ڕووبەرەکەو جۆری بەرهەم وبەپیتی زەویەکە.

- دابڕین - بایکۆت (المقاطعة) : ئەمەش باجێکە دەسەپێنرا لەئەنجامی پەیمانێکی نێوان دەوڵەت وکەسێکی پابەند (الملتزم ) کە پارچەیەکی پێدراوە پێویستە ساڵانە باجی زەویەکە کۆبکاتەوەو بیداتە دەوڵەت ، ئەم سیستەمەش باوبوو لە کوردستان و ڕۆڵی هەبوو لەسەرهەڵدانی دەسەڵاتدارێتی کوردی .

ب- جزیە :

جۆرە باجێکە لەسەر ئەم خەڵکانە دادەنرا کە لەسەر ئاینەکانی ترن (اهل الذمة) لە جوولەکەو مەسیحیەکان وهی تر وەردەگیرا ، لە زەکات دەچێت لای موسڵمانان ، لەکوردستاندا باوبوو .

ج- باجەکانی بازرگانی :

دووجۆری هەبوو یەکەمیان بەناوی (عشور) کە لەسەر کاڵای بازرگانی دەرەکی دەسەپێنرا ، لەهاوردەو ناردەکان ، وەکو باجی گومرگی ئێستا .دووەمیان (مەکۆس) کەباجێك بوو لەسەر کاڵاکانی ناو

بازار و دوکاندارەکان دەسەپێنرا ، هەردوو جۆر لەگەڵ چەند باجێکی تر لە کوردستاندا باوبوو (٧١) .

٢- دراوەکان :

أ- دراوە دەرەکیەکان :

چەند دراوێکی دەرەکی لەم سەردەمەدا لەکوردستاندا لە مامەلەکانی کڕین وفرۆشتن بەکارهاتووە لەوانە دینارو درهەم وفلسی خەلافەتی عەباسی ، وەکو (دیناری موتیعی ) دە گەڕێتەوە سەردەمی خەلیفە (المطیع لله ٣٣٤-٣٦٣ك/ ٩٤٥-٩٧٣ز) (٧٢) ، وە (دیناری ڕوکنی) دەگەڕێتەوە بۆ (رکن الدولە) ی بوەیهی (٧٣) ، جگە لە دیناری سەلجوقیەکان (٧٤) ، هەروەها (دیناری میری ) کە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی عەباسی وزیاتر لەشارەکانی هەرێمی جەزیرە مامەلەی پێدەکرا(٧٥) ، وەجۆرە درهەمێکی عەباسی بەناوی (درهەمی سود) کە دروست کرابوو لە زیو بەکاردەهێنرا . لەدراوە دەرەکیە بەکارهاتووەکانی تر (دیناری بیزەنتی) یە بەتایبەتی لە هەرێمی (دیاربەکر) ، هەروەها دراوی دەوڵەتی فاتمی لە (میسر ) لە چەند شارێکی کوردستان مامەلەی پێدەکرا ، وە (دیناری صوری ) خاچیەکان لەووڵاتی شام لە چەند شارێکی کوردی بەکارهێنراوە . (دیناری ئەیوبیەکان ) ی (میسر) لەسەدەی حەوتەمی کۆچی / سێزدەی زایینی لەشارەکانی (هەولێر) و (میافارقین ) و (خەڵات ) بەکارهاتووە ، جگە لەدراوی سەردەمی (مەغۆل) ی کە دراوێکی کاغەزی بۆیەکەمجار لە کوردستان بەکارهاتووە بەناوی (چاو) بوو ، یەکەمجار ساڵی ٦٩٣ك/ ١٢٩٤ز مامەڵەی پێکرا (٧٦) .

ب- دراوە ناوخۆییەکان :

مەبەستمان ئەم دراوانەن کە لەشارەکانی کوردستان لە سکە دراوە و بەکارهاتووە ، چەند نموونەیەك دەهێنینەوە وەکو دیناری زێرینی شاری (دینەوەر) کە لەساڵی ٣١١ك/ ٩٢٣ز لەسکەدراوە ، وە درهەمی زیوی لە شاری (حولوان ) ساڵی ٣٢١ك/٩٣٢ز لە سکە دراوە (٧٧) .

میرە کوردیەکان دراویان هەبوو وەك میر (بەدری کوڕی حەسنەوەیهی ٣٦٩-٤٠٥ك / ٩٧٩-١٠١٤ز) میری میرنشینی (حەسنەوەیهی) لەڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان کەوا بەناوی خۆیەوە ناوی دەرکردبوو (دیناری بەدری) (٧٨) ، میرنشینی (عەنازی) لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان (٣٨١-٥١١ك/٩٩١-١١١٧ز) دراوی تایبەت بەخۆیان لەسکە دابوو (٧٩) ، وە میرنشینی (شەدادی ٣٤٠-٥٩٥ك/ ٩٥١-١١٩٨ز) دراویان لە سکەداوە (٨٠) ، هەروەها میرنشینی (مەروانی ٣٧٣-٤٨٩ك/٩٨٣-١٠٩٦ز) درهەمی زیویان لەسکە داوە (٨١) ، وە لەسەردەمانی ئەتابەگیەکان دراویان لەسکە داوە وەکو ئەتابەگیەی (شەنگار ٥٦٦-٦١٧ك/ ١١٧٠-١٢٢٠ز) و ئەتابەگیەی (هەولێر ) لەسەردەمی (سوڵتان موزەفەرەدین کوکبری ٥٨٦-٦٣٠ك/١١٩٠-١٢٣٢ز) (٨٢) ، وەلەسەردەمی (مەغۆلە ئیلخانەکان ٦٥٦-٧٣٧ك/ ١٢٥٨-١٣٣٥ز) چەندین دراو لەشارەکان لە سکە دراوە وەکو (هەولێر) (٨٣) و (شەنگار) و (ماردین) و (جەزیرە) (٨٤) . وەلە پاشکۆدا چەند نموونەیەکی دراوی ناوخۆو دەرەوەمان نیشان داوە .

**پەراوێزو سەرچاوەکان**

(١) ابن كثير :البداية والنهاية ،ج١٣،ص١٨٤.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە :د.اكو برهان محمد :التجارة ،ص١١٧.

(٣) الوافي بالوفيات ،ج٣،ص١٦٨.

(٤)د. اكو برهان محمد :التجارة ص ض١١٨-١٢٠

(٥) ابن حوقل:صورة الارض ، ص٢٠٢.

(٦) ابن حوقل:صورة الارض ، ص٣١٣.

(٧) كي لسترنج : بلدان الخلافة الشرقية ،ص ٢٦٢.

(٨) الحميري :الروض المعطار في خبر الاقطار،ص٢٢٠.

(٩) ابن جبير :رحلة ابن جبير ،ص١٩٦.

(١٠) الشابشتي:الديارات ،ص١٩٨.

(١١) العمري :مسالك الابصار،ج١،ص٣٠٣.

(١٢) ياقوت الحموي : معجم البلدان ، مج٢، ج٣،ص١٤٦ .

(١٣) كي لسترنج : بلدان الخلافة الشرقية ،ص ١٢٦.

(١٤) ابن حوقل:صورة الارض ،ص ص٢٨٩.

(١٥) كي لسترنج : بلدان الخلافة الشرقية ،ص ١٩٩ " مينورسكى :مادة اشنة،ج٢،ص٢٢٢.

(١٦) مؤلف مجهول :حدود العالم ،ص١١٨ .

(١٧) ابن حوقل:صورة الارض ،ص ص١٩٤.

(١٨) البدري :نزهة الانام في محاسن الشام ، ص ص١٦٥-١٦٦ " القزويني : اثار البلاد ،ص٢٢٦.

(١٩) ابن ابي اصيبعة :عيون الانباءفي طبقات الاطباء ،ص٣٢٩" د.كمال السامرائي :مختصر تاريخ الطب العربي ، ج٢،ص٤٦٧.

(٢٠) د.اكو برهان محمد :التجارة والنظم المالية في كوردستان ،ص ص١٢٤-١٤٤.

(٢١) الجاحظ :التبصر بالتجارة ،ص٣٠.

(٢٢) ابن حوقل:صورة الارض ، ص٢٠٠.

(٢٣) السمعاني :الانساب ،ج١٠،ص١٣٠.

(٢٤) ابن تغري بردي:النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة،ج٦ ،ص٨٠.

(٢٥) وليد الجادر: الحرف ،ص١٠٩.

(٢٦) الجاحظ :التبصر بالتجارة ،ص٣٤ " الثعالبي :ثمار القلوب ،ص٢٣٦.

(٢٧ ف .هايد :تاريخ التجارة ،ج٤ ،ص ص٢١٥-٢١٦ .

(٢٨) بڕوانە د. اكو برهان محمد :التجارة ص ص١٥١-١٥٥.

(٢٩)د. محمود ياسين التكريتي :الايوبيون في شمال الشام والجزيرة ،ص٣٦٧.

(٣٠) ابن الوردي :خريدة العجائب ،ص٤٣.

(٣١) صلاح الدين امين طه :الحياة العامة في ارمينية، ص١٥٤.

(٣٢) القزويني :اثار البلاد ،ص٣٥٧.

(٣٣) ابن بطوطة :رحلة ابن بطوطة ،ص٢٩٨.

(٣٤) نوري العاني :العراق في العهد الجلائري،ص٢٥٨.

(٣٥) القلقشندي :صبح الاعشى ،ج٤،ص٣٧٧ .

(٣٦) البيروني :الجماهر في معرفة الجواهر،ص١٩٥.

(٣٧) ابن حوقل:صورة الارض ،ص١٩٤.

(٣٨) د.محمود ياسين التكريتي :الايوبيون ، ص٣٦٨ .

(٣٩) البدري :نزهة الانام في محاسن الشام ،ص٦١.

(٤٠) القلقشندي :صبح الاعشى ،ج٤، ص٩١.

(٤١) د.اكو برهان محمد: التجارةص ص١٦٢-١٦٣.

(٤٢) الانصاري :نخبة الدهر ،ص١٢١" الحميري :الروض المعطار،ص٢٢٠.

(٤٣) ابن حوقل:صورة الارض،ص٢٩٧.

(٤٤) ادم متز :الحضارة الاسلامية ،مج٢،ص٣١٣.

(٤٥) ياقوت الحموي : معجم البلدان ،مج١،ج٢،ص٢٧٨" القزويني :اثار البلاد، ص٥٢٤.

(٤٦) مؤلف مجهول :حدود العالم،ص١٢١.

(٤٧) عبدالماجد احمد السلمان :الموصل في العهدين الراشدي والاموي،ص١١٨.

(٤٨) ابن الفقيه :مختصر كتاب البلدان،ص١٢٥.

(٤٩)د. اكو برهان محمد: التجارة ، ص ص١٧٠-١٧٢.

(٥٠) د.اكو برهان محمد: التجارةص ص١٧٢-١٧٣.

(٥١) عادل محي الدين الالوسي :تجارة العراق البحرية،ص٢١٩.

(٥٢) القزويني :اثار البلاد، ص١٠٣.

(٥٣) ابن حوقل:صورة الارض،ص٣٠٩.

(٥٤) ابن الشحنة :الدر المنتخب ، ص٢٥٤.

(٥٥) بلخشان:شارێکە لەسەرووی تەخارستان هاوسنووری وڵاتی تورکە لەنزیك بەلخ.
ياقوت الحموى : معجم البلدان ،مج١،ج٢،ص٢٨٦.

(٥٦) الحموي :التاريخ المنصوري ،ص٣٠١.

(٥٧) السيوطي:بغية الوعاة ،مج١،ص٢٨٦ "د.محسن محمد حسين:اربيل ،ص٢٤٠.

(٥٨) Simkin: Traditional Trade of Asia p8.

(٥٩) ابن حوقل:صورة الارض،ص٣٠٠.

(٦٠) عماد الدين خليل:الامارات الارتقية،ص٤٥٢.

(٦١) د.زرار صديق توفيق : كردستان في القرن الثامن الهجري ، ص٣٠٩.

(٦٢) ابن حوقل:صورة الارض،ص٣٠١.

(٦٣) ياقوت الحموي : معجم البلدان ،مج٤،ج٧،ص٨٢.

(٦٤) صلاح الدين امين طه :الحياة العامة في ارمينية، ص١٥١.

(٦٥) د.زرار صديق توفيق : كردستان في القرن الثامن الهجري ، ص٣٠٩.

(٦٦) د.زرار صديق توفيق : كردستان في القرن الثامن الهجري ، ص٣٠٨.

(٦٧) حمدان الكبيسي:اسواق بغداد ،ص٢٢١.

(٦٨) ابن رستة:الاعلاق الخطيرة،ص١٤٣.

(٦٩) عبد الرقيب يوسف :الدولة الدوستكية ،ج٢،ص٢٢٩.

(٧٠) سەبارەت بە چینەکانی بازرگانی بۆزیاتر زانیاری بڕوانە د. اكو برهان محمد :التجارة،ص ص٢٢٣-٢٣١.

(٧١) بڕوانە: د. اكو برهان محمد :التجارة،ص ص٢٤٤-٢٤٧.

(٧٢) ابن الجوزي :المنتظم ، ج٧، ص٢٧٦ " د.حسام الدين علي غالب :الكرد في الدينور وشهرزور ،ص٣٠٦.

(٧٣) ابن العبري :تاريخ الزمان ،ص٣٣٧.

(٧٤) اسماعيل حسين حجارة :النقود المكتشفة ،ص٧٣.

(٧٥) ابن الاثير :التاريخ الباهر ،ص١٤٩" بنيامين التطيلي :رحلة بنيامين التطيلي،ص١٥٤.

(٧٦) بۆزانیاری زیاتر بڕوانە: د. اکو برهان محمد :التجارة،ص ص٢٦٦-٢٨٠.

(٧٧) اسماعيل غالب :مسكوكات ،ص ص٢٤٤،٢٣٣.

(٧٨) Lane-pool: Catalogue of the Collection of Arabic Coins p335.

(٧٩) فرست مرعي:الامارات الاسلامية ،ص٣٥٧.

(٨٠) جمال رشيد احمد:لقاء الكرد،ص٢٣١.

(٨١) Lane-pool: Catalogue of the Collection of Arabic Coins p335.

(٨٢) محمد باقر الحسيني :العملة الاسلامية ،ص ص٨٦،٦٩.

(٨٣) Lane-pool: Catalogue of the Collection of Arabic Coins p335.

(٨٤) جعفر خصباك :العراق في عهد المغول،ص١٢٢" علاء محمود خليل:المغول في الموصل والجزيرة ،ص١٨٨.



**دراوێکی سەردەمی ئومەوی**

**( لە کتێبخانەی نووسەر پارێزراوە )**



**دراوێکی سەردەمی عەباسی**

**( لە کتێبخانەی نووسەر پارێزراوە )**



دراوێکی میر بەدری حەسنەوەیهی
(Lane Poole: Catalogue)



دینارێکی سەردەمی عەباسی
(مهاب درویش البکری :الدینار العباسی)



دراوێکی سوڵتان موزە فەرەدین
(لە کتێبخانەی نووسەر پارێزراوە)

# بارودۆخی سیاسی هەولێر و رۆڵی هەولێر لە پارت و رێکخراوە سیاسیەکان و ڕووداوەکاندا ١٩٣٩ – ١٩٥٨

م. شوان محمدامین خۆشناو

لە سیەکانی سەدەی رابردوودا، ژیانی پارتایەتی و بزاڤی نەتەوەیی و نیشتمانی لە عێراق و کوردستاندا[١] تا رادەیەك نەش ونمای کرد، جەنگی دووەمی جیهانیش(١٩٣٩-١٩٤٥)، کاریگەری لەسەر هەموو بوارەکانی ژیان لە زۆربەی جیهان دەبینرا و عێراقیشی گرتەوە[٢] بزاڤی رزگاریخوازی کوردیش بەرەو قۆناغێکی نویٚ هەنگاوی نا[٣].

لە باشوری کوردستانیش هەولێر و هەولێرییەکان نەخشیان لەنێو هەنگاوەکاندا دەبینرا، لەساڵی ١٩٣٧ لاوە رۆشنبیر چالاکەکانی شارەکە پێشەنگ بوون لە دامەزراندنی رێکخراوێکی سیاسی بەنێوی (دارکەر)[٤]،کە زۆربەیان قوتابی ناوەندی و دواناوەندی (ئامادەیی) بوون و هەڵگری بیروباوەڕی کوردایەتی بوون[٥].

بەرپرسەکانی کۆمەڵەی نێوبراو لەشارەکە پێکهاتبوون لە "مستەفا عوزێری، یونس رەئوف (دڵداری شاعیر)[٦]، جەلال قادر، موسا عەبدولسەمەد، ئیحسان حاجی ئەحمەد باخچەچی و رۆستەم عەبدولجەبار"[٧].

لەگەڵ بوونی هەندێ بیروڕا کە کۆمەڵەکە لە کەرکووك دامەزراوە[٨]، بەڵام ساڵح حەیدەری لەسەر زاری دوو لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەکە[٩] ئەوە پشت ڕاست دەکاتەوە کە هەولێر بنکەی دامەزراندنی کۆمەڵەکە بووە و تەنانەت ڕەفیق حیلمی[١٠] لە شەقلاوە لە باخچەی جەمیل میران سوێندی بە خەنجەر و قورئان خواردووە و هاتۆتە ڕیزی کۆمەڵەکە و پاشان وەك پێویستیەك کردویانە بە سەرۆکی حیزبی هیوا، چونکە کەسایەتیەکی ناوداری گۆڕەپانی سیاسی باشوری کوردستان بووە[١١].

مێژوونوسی عەرەب (عەبدولڕەزاق حەسەنی)ش بنکە و بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەکە بۆ هەولێر دەگەڕێنێتەوە و هەمان بۆچوون دووپات دەکاتەوە[١٢]. دوای فراوانبوونی کۆمەڵە جگەلە هەولێر و کەرکووك، لقەکانی خۆی لە کۆیە، شەقلاوە، کفری، چەمچەماڵ، بەغدا و خانەقینیش کردەوە[١٣].

ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە خانەی بچووکی پێنج کەسی پێکدەهات، ئەندامەکانی ناوی نهێنی و خوازراویان هەبوو، بەرپرسی هەرخانەیەکیش ئەندام بوو لە خانەی سەرووتر[١٤]. دیارە ئەو شێوازە ڕێکخستنە نهێنیانە لەسەردەمی پادشایەتیدا باو بووە، بەهۆی نەبوونی ئازادی سیاسی و نەدانی مۆڵەتی فەرمی بە پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانەوە و تا ئێستاش شێوازەکە هەر باوە و پەیڕەو دەکرێ.

دوابەدوای فراوانبوونی کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٣٩ لەپاش کۆبوونەوەی قوتابیان لە کەرکووك، حیزبی هیوای لێکەوتەوە، بەهۆی لەباربوونی هەلومەرجی بابەتی بزوتنەوەی کوردایەتی و دەستپێکی جەنگی

دووەمی جیهانی، حزبی هیوا گۆڕەپانی سیاسی هەولێری داپۆشیبوو، ئەوکاتە هزری مارکسیزم و تیۆریای سۆسیالیزمی بەگشتی لەلایەن گەنجانی هەولێر بەهۆی هەبوونی حیزبی هیوا ئەو پێشوازیەی لێنەدەکرا [١٥]. بەتایبەتی حیزبی نێوبراو لەسەرەتای جەنگ هەڵوێستی خۆی بەچاکی دژی فاشیزم و نازیزم دەربڕیبوو، هەربۆیەش دوای ماوەیەکی کەم لە دامەزراندنی ژمارەی ئەندامانی گەیشتە هەزار و پێنج سەد کەس[١٦]، کە بەشی هەرە زۆری ئەفسەر و جێگری ئەفسەر و سەرباز و توێژی رۆشنبیران و خوێندەواران بوون، کە پارێزەر و دکتۆر و مامۆستا و قوتابی بەخۆوە گرتبوو[١٧]. لقی هەولێری حیزبی هیوا لە لقە چالاکەکان بوو، هەفتەنامەیەکی دەستنووسیان بەنێوی (گۆڤار) دەردەکرد، لەلایەن دوو رۆشنبیر و ئەندامی کارای ناو حیزب سەرپەرشتی دەکرا ئەوانیش (نافع یونس و قەرەنی دۆغرەمەچی) بوون[١٨].

شایەنی باسکردنە کەسایەتی ناسراوی هەولێر (رەمزی نافیع رشید ئاغا)[١٩] ئەندام بوو لە حیزبی هیوا، کە لەپێناو دۆزی رەوای میللەتەکەی لەسەر ئاستی تاکەکەسی پردێکی پەیوەندی لەگەڵ ئەڵمانەکان بەست، ئەگەرچی لە کردەی (ماموت)[٢٠] کۆتایی بەهەوڵەکەی هات و سەرەنجام دەستگیرکرا و لەوپێناوەشدا سەری نایەوە[٢١] ، بەلام لاپەڕەیەکی شکۆدار و پرشنگداری بۆ مێژووی میللەتەکەی تۆمارکرد.

دیارە لەپێش ئەو رێکەوتە دا لە بزوتنەوەی مایسی ١٩٤١[٢٢] دا، هەڵوێستی هەولێر هاوسۆزی بزوتنەوەکە بوو دژی بەریتانیا،

لەخۆپێشاندانێکی گەورەدا بەبەشداری قوتابیان و مامۆستایان و کاسبکار و پیاوانی ئاینی و چین و توێژەکانی دیکە پاڵپشتی بزوتنەوەکە بوون، و لە نێو خۆپێشاندەرانیش ((فەتاح جەبار و رۆستەم جەبار و جەلیل وشیار و عەونی یوسف و جیهاد بەکر و عەلی ئەحمەد ئاغا و عومەر عوسمان و نازم سەعید ئاغا و عیزەددین فەیزی)) بەشداربوون کە هەموویان ئەندامی حیزبی هیوا بوون، خۆپیشاندانەکە دواتر توندوتیژی لێکەوتەوە و پاش گەڕانەوەی بارودۆخەکە و هاتنەوەی ئینگلیز ژمارەیەکی زۆری خەڵکی هەولێر گیران، کە لەدوای شاری بەغدا هەولێر بە دووەم شار دەهات لەرووی ژمارەی گیراوەکانەوە[٢٣].

رەشید عالی گەیلانی سەرکردەی بزوتنەوەکە بوو، بۆ پاراستنی گیانی شا فەیسەلی دووم و بنەماڵەکەی ، شاری هەولێری هەڵبژاردبوو، لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ کەسایەتی خاوەن پێگەی ئاینی و کۆمەلایەتی هەولێر (مەلافەندی)دوابوو[٢٤] تێیدا ئارەزووی حکومەتی بەرگری نیشتمانی نیشاندابوو بۆ گواستنەوەیان بۆ ماڵی نێوبراو بەمەبەستی دالدەدانیان لەوێدا[٢٥] لەگەڵ ئەوەی خۆپیشاندەران دەیانزانی مەلیك و خانەوادەکەی لە هەولێرن، بەلام بەهۆی پلەوپایەی مەلافەندی لەنێو شاردا تخونیان نەکەوتن و وازیان لێهێنابوون[٢٦].

دیارە دوای بزوتنەوەکە بارودۆخی ئابووری تێکچوو بوو، سوپای عێراقیش بۆ چاوشکاندنی میللەت سەیری عێراقیان دەکرد، دام ودەزگاکانی کارگێری گەندەڵییان پێوە دیار بوو، نارەزایی و بێزاری

دانیشتوانی گرتبۆوە، خەڵکی نزیك بە ئینگلیز و رژێمی پادشایەتی تێروتەسەل دەژیان و زۆرینەی میللەتیش گوزەران و بژێویان خراپ بوو[٢٧].

لەو سەروبەندەدا ئاراستە و تەوژمێکی جەماوەری لەهەولێر هەبوو، بەهۆی دوژمنایەتی نێوان ئەڵمان و ئینگلیزەکان، مەیل و هەوەسیان بە ئەڵمانەکان دەهات، هەرچەندە دەیانزانی ئەوانیش رژێمێکی کۆلۆنیالیین[٢٨]. دواتر ئەو ئاراستەیە رووی لە کزی کردو بە هۆی وشیاربوونەوەی خەڵك و گۆڕانی باروودۆخی سیاسی بەرەو ئاقارێکی دیکە چوو.

لە شۆڕشی کورد لە بارزان (١٩٤٣– ١٩٤٥)دا[٢٩]، حیزبی هیوا رۆڵێکی کاریگەری هەبوو بە کۆکردنەوەی جەماوەر لە دەوری بارزانی و بلاْوکراوە و بەیاننامەی لە بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراق بلاْودەکردەوە، کە تێیدا پشتی راپەڕینی دەگرت و نیازخراپی حکومەتی دژی گەلی کورد دەخستە روو[٣٠] هەولێر و هەولێرییەکانیش بەپەرۆشەوە دەیانڕوانیە ئەو شۆڕشە و دانیشتوانەکەی چاوەڕوانی ئەوەبوون هەرکاتێك بێت لەژێردەستی حکومەت دەربچن و بچنە ژێر باڵی شۆڕشەکە[٣١].

کاتێك ناکۆکی کەوتە نێو رێزەکانی حیزبی هیوا، تادەهات جیاوازی ئایدیۆلۆژی لەنێوان بەرەی چەپڕەو و بەرەی راستڕەوی هیوا قوڵتر دەبووەوە، تا بەو ئاستە گەیشت لە کۆنفرانسی کەرکووکی ١٩٤٤ چەپڕەوەکان بەیەکجاری لەماڵی حیزب دابڕان و بەرەی راستڕەویش

توانیان ماوەیەك پارێزگاری لە حیزبەكە بكەن پاشان بڕیاری توانەوەی خۆیاندا[٣٢].

بیرۆكەی ڕێكخستنی كۆمۆنیستی لە هەولێر لە سالآنی ١٩٤١- ١٩٤٢ لەپێش شارەكانی دیكەی خوارووی كوردستاندا لەدایك بوو، مامۆستایان ڕۆڵی كارایان گێڕا لە بلاو كردنەوەی وشیاری چینایەتی لەنێو ڕیزەكانی قوتابیان و جەماوەردا، ئەوانەی لە كۆلیژەكانی بەغداش دەیانخوێند، لەكاتی گەڕانەوەیان لە پشووی هاویندا، بیرۆكەی نوێیان دەهێنایەوە و پەیوەندییان بەڕۆشنبیرانی دیكەی شار دەكرد[٣٣].

یەكەم خانەی ڕێكخستنی ماركسی لەهەولێر بە هەوڵی ساڵح حەیدەری پێكهات كاتێك پەیوەندی بە ڕەشید عەبدولقادر (ئەندامێكی بەرەی چەپی هیوابوو) كرد ، دوایی پەیوەندی بە شۆعە مەخلوف (مامۆستابوو) و ئەواكیم ئەواكیمیان (قوتابییەكی ئەرمەنی بوو)كرد لە سالآنی ١٩٤٢- ١٩٤٣دا، ئەوانە لەڕێگەی پشتیوانەكانیان لەبەغدا بلاوكراوەی نهێنی حیزبی شیوعی عێراقیان دەست دەكەوت و پەیوەندیان بە كۆمەڵەی (إلى الأمام)[٣٤] هەبوو، لە كاتی هەڵوەشاندنەوەی كۆمەڵەكەش لە هاوینی ١٩٤٣دا، كۆمەڵەی هەولێر بەردەوامییان بە هەوڵەكانیان دا و توانیان شەریف عوسمان ناسراو بە (مەلا عەروس) بێننە ڕیزی كۆمەڵەكەیان[٣٥].

بەپچڕانی پەیوەندییان، توانیان ژمارەیەكی زیاترلە قوتابی وگەنجانی حیزبی هیوا لە هەولێر بێننە ریزی كۆمەڵەكە و لە هاوینی ١٩٤٣ بڕیاریاندا (كۆمەڵەی میللەت) وەكو ڕێكخراوێكی سەربەخۆ و ناوچەیی كاربكات و دژی هەموو شێوازەكانی چەوساندنەوە بێت و مۆركێكی

نیشتمانی و دیموکراتی هەبێت و بڵاوکراوەیەکیشیان بەنێوی (دەنگی کورد) دەردەکرد، ئەو گەنجانەی هاتنە ناو کۆمەڵەکە چالاك بوون و قوتابی و رۆشنبیرانی هەولێر بوون کە لەنێوانیاندا ((نافیع یونس، حەمید عوسمان (١٩٢٦- ١٩٩٣)، موسا سلێمان (١٩٢٦- ١٩٥٣)، هاشم عەبدولا (١٩٢٨- ١٩٨٣)، شێخ محەمەد ناسراو بە (شێخە شەل) (١٩٢٣- ٢٠٠٢)، عەزیز محەمەد (١٩٢٤- ؟)، قەرەنی دۆغرەمەچی، یەحیا سەلیم، ئەنوەر عەبدولا (دڵسۆز) و جەوهەر حوسێن و چەندانی دیکە بوون[٣٦].

لەو ماوەیەدا کۆمەڵەی (الشرارة الجدیدة)[٣٧] (بڵێسەی نوێ) توانییان پێش هەڵوەشانەوەیان جێ پێیان لەنێویاندا بکەنەوە و بڵاوکراوەیەکی نهێنی بەناوی (بڵێسە) دەربکەن، بەلام لەگەڵ هەڵوەشانەوەیان بڵاوکراوەکەش وەستا[٣٨].

دواتر کۆمەڵەکە چوونە پاڵ رێکخراوی (وحدة النضال)[٣٩] ئەویش لە ئەنجامی سەردانێکی سەرۆکی لقەکە (صفاء مصطفی) بۆ هەولێر و دوای گفتوگۆکردن لەگەڵ سەرانی کۆمەڵەی میللەت لەسەر ئەوە رێککەوتن کە لقێك لە کوردستان دابمەزرێنن[٤٠] بەمەرجێك لقی کوردی ئەو رێکخراوە بڵاوکراوەیەکی تایبەت بەنێوی (یەکیەتی تێکۆشین) دەربکەن و دوو ئەندامی کوردیش لە لێژنەی ناوەندی رێکخراوەکە بەشدار بێت، رەزامەندی نیشاندراو (ساڵح حەیدەری و نافیع یونس)یش بۆ ئەو پلەیە پالێوران، بەلام یەکگرتنی ئەو دوو گروپە وای لە (شەریف عوسمان) کرد، بچێتە بەغدا و چاوی بە (فەهد) بکەوێت و هەوڵبدات لقێکی تایبەت

بە حیزبی شیوعی عێراق لە کوردستان و هەولێر دابمەزرێنێ، توانی هەریەك لە یەحیا سەلیم و جەوهەر حوسێن و ئەنوەر عەبدوڵا (دڵسۆز) بۆ لای خۆی رابکێشی[41].

جێگەی ئاماژەیە (شەریف عوسمان) وەکو نوێنەری کورد بەشداری لە کۆنفرانسی یەکەمی شوباتی ١٩٤٤ی حیزبی شیوعی عێراقی کرد و لە کۆنگرەی نیشتمانی ١٩٤٥یشدا بەشداری لە کۆبوونەوەی لیژنەی ناوەندی کرد و بووە سکرتێری لیژنەی لقی کوردی حیزبەکە[42] و بەرپرسیارێتی و سەرپەرشتی رۆژنامەی (ئازادی) ئۆرگانی لقی کوردستانی پێ سپێردرا[43]. بەڵام ئەو لقە کوردیە زۆر لاواز بوو تەنها وەکو رێکخراوێکی بچووك جگە لە هەولێر، لە کەرکووك و سلێمانیش هەبوو[44].

بۆیە بەشی هەرە زۆری رۆشنبیرانی هیوا، بەپەسەندیان زانی لەریزی (یەکیەتی تێکۆشین) درێژە بە خەباتیان بدەن و زۆربەی سەرانی یەکیەتی تێکۆشین لەبەرامبەریدا ئەندامی بەرزی هیوابوون و بیروباوەڕی کوردایەتیان بە بیروباوەڕی دیموکراسی و پێشکەوتنخوازی موتوربەکرابوو[45].

دوای هەڵوشانەوەی (وحدة النضال)، لقی کوردی (یەکیەتی تێکۆشین) بەنوێنەرایەتی سالح حەیدەری و نافیع یونس و عەلی عەبدوڵا (ئەندازیار)، لەگەڵ نوێنەرانی حیزبی شیوعی عێراقی لەسەروویان (فەهد) و ئەوانی دیکە، بە بەشداری شەریف عوسمان کەوتنە گفتوکۆ لەسەر رێکخستن و رابەرایەتی لقی کوردی، بەڵام نەگەیشتنە رێککەوتن و

دواجار لە پایزی ١٩٤٥دا (حیزبی شیوعی لە کوردستانی عێراق)یان دامەزراند و مەکتەبی سیاسییان لە سالح حەیدەری (سکرتێر)، نافیع یونس، عەلی عەبدولا، عەبدولکەریم تۆفیق و رەشید عەبدولقادر پێکهێنا[٤٦] ئەو حیزبەش لەنێوەندی سیاسی و لەنێو جەماوەردا بە شۆڕش ناسرا، چونکە بلاوکراوەیەکی مانگانەیان بەزمانی کوردی بەناوی (شۆڕش) دەردەکرد[٤٧] و بە رۆنیۆ چاپیان دەکرد[٤٨]. تێبینی دەکرێ زۆربەی پارت و رێکخراوە سیاسیەکان لەو سەردەمەدا بەناوی بلاوکراوە و رۆژنامەکانیان ناویان دەهات و دەناسران.

دیارە بەهۆی بالادەستی هەولێرییەکان لەنێو حیزبی (شۆڕش)دا، بەبۆچوونی توێژەر جەمال نەبەز، حیزبەکە بە رێکخراوێکی تایبەت بە شاری هەولێر و هەولێرییەکان دادەنێ[٤٩].

بە بۆچوونی عەلی عەبدولا پەیڕەوی ناوخۆ و پرۆگرامی ئەو حیزبە تا رادەیەکی زۆر گونجاو بوو لەگەڵ بزوتنەوەی دیموکراسی لەعێراقدا و بزوتنەوەی کوردایەتی لە کوردستاندا، پشتگیری لە شۆڕشی بارزان کرد و بەرامبەر ئەو پڕوپاگەندانەش دەوەستا کە رژێمی داگیرکەری ئینگلیزی و شۆڤێنییەکان و کۆنەپەرستانی عەرەب و رژێمی پاشایەتی بەرامبەر شۆڕشی بارزان بلاویان دەکردەوە[٥٠].

لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر جەختی لەسەر رێبازی مارکسیزمی دەکردەوە، چونکە خۆیان بە رێکخستنێکی کۆمۆنیزمی کوردی سەربەخۆ دادەنا، دوای سەرنەکەوتنی گفتوگۆ و دانوستانەکەیان لەگەڵ (فەهد)دا[٥١]. سەرانی شۆڕش دەرکیان بەو راستیەکردبوو کە پێویستە لەگەڵ کەسانی

نەتەوەیی و نیشتمانی رێك بكەون بۆ پێك هێنانی بەرەیەك كە هەموو پێكهاتە وشیارەكانی ناو كۆمەڵگەی كوردی لەخۆ بگرێ[٥٢] بەشێوەیەك بەرەی نوێ لەشێوەدا نەتەوەیی بێت و لە ناوەڕۆكیشدا ماركسی بێت و بتوانێ جەماوەر ئاراستە بكات[٥٣]. واتە ئامانجی شۆڕش كۆكردنەوەی هێزە پێشكەوتووخوازەكان بوو لە كوردستاندا و یەكرێزی و پتەوكردنی خەباتی كورد و عەرەب بوو دژی دوژمنی هاوبەشیان كە ئیمپریالیزم و كلكەكانی بوو، لەپێناو هێنانە ئارای سیستەمێكی دیموكراسی و دەسەلاتێكی ئازاد لە وولاتدا[٥٤].

بۆیە رۆڵێكی هەرە گرنگی نواند و پێشڕەوی كرد لە دامەزراندن و رێكخستن و ئاراستەكردنی (حیزبی رزگاری كورد) توانی وەكو بەرەیەكی یەككگرتوو هەموو هێزە سیاسییەكانی كوردستان كۆبكاتەوە و شان بەشانی بزوتنەوەی نیشتمانی و دیموكراسی عێراقی خەبات بكات[٥٥].

لەم پەیوەندییانەدا حیزبی رزگاری لە پاشماوەی حیزبی هیوا و بەشداری كەسایەتییە دیارەكان و قوتابیانی كورد لە بەغدا پێكهات[٥٦] لە زستانی ١٩٤٥ دا سەركردایەتی حیزب لە : (سالح حەیدەری، نافیع یونس، دكتور جەعفەر محەمەد، نووری شاوەیس، نووری محەمەد ئەمین، رەشید باجەلان و تەها محێدین) پێك هات لەكاتێكدا سالح حەیدەری و نافیع یونس دوو نوێنەری دیاری هەولێری حیزبی شۆڕش بوون لەسەركردایەتی دا، (نووری شاوەیس و نووری محەمەد ئەمین)یش ئەندامی شۆڕش بوون بەلام خۆیان ئاشكرا نەكردبوو، بۆئەوەی سەركردایەتی رزگاری بەتەواوەتی لەلایەن (شۆڕش)ەوە ئاراستە

بکرێ[٥٧]. هەربۆیەش حیزبی شیوعی کوردستان (شۆڕش) بەیانێکی دەرکرد و لە دەستپێکی بەیاننامەکەدا هاتووە: "**یەکگرن بۆ دامەزراندنی حیزبی رزگاری کورد- تێکۆشن بۆ تێکدانی پیلانی ئیمپریالیزم وکۆنەپەرستی**"، تێیدا پالپشتی تەواوی شۆڕش بۆ دامەزراندنی بەرەی نوێ و تێکۆشان بۆ چارەنووس و رزگارکردنی کوردستانی گەورە و هاندان بۆ هاوکاری حیزبی نوێی راگەیاند[٥٨].

بەیاننامەکەدا ئامانجی ستراتیژی و تاکتیکی نەتەوەی کورد و حزبەکەی تێدا روون کردبۆوە[٥٩]. حیزبی رزگاری دەست بەکاربوو، چالاکیەکانی بەرفراوان بوو، لەئاستی نێوخۆیی و دەرەکیدا[٦٠]، بەشێکی زۆری گەنجانی کورد چوونە پاڵ حیزب و جگە لە هەولێر لقەکانی لە کەرکووك و سلێمانیش کردەوە، سەرەڕای کردنەوەی لق لە قەزاکانی کۆیە، رواندز، ئامێدی، زاخۆ[٦١].

لە دیارترین ئەندامە چالاکەکانی رزگاری لە هەولێر، کە دەزگای هەواڵگری و ئاسایش دوای چاودێری کردن ناردوویانە لە (٣٢) ئەندام پێکهاتووە زۆربەیان توێژی رۆشنبیران و قوتابیان و فەرمانبەرانن[٦٢]. رێکخستنی حیزبی رزگاری لەهەولێر جگە لە چینی هەژار و چەوساوە بگرە شالاوی ئەو رێکخستنە گەلێ لە ئاغا و خواپێداوەکانی خاوەن هەستی کوردایەتی گرتبۆوە، لقی (عەشائیری) لقێکی تایبەت بوو، خاوەن موڵك و ئاغا و کەسایەتیە دیارەکانی ئەو شارە هاریکاریەکی تەواوی رزگارییان کرد[٦٣]. ئەوەتا لە دۆکیۆمێنتی بارەگای حامیەی هەولێر کە بۆ فەرمانەدەی تیپی دووەم لە ١١/٧/ ١٩٤٦ ئاراستە کراوە و

**هاتووە: "لە شوێنێکی متمانە و باوەڕپێکراوەوە بۆمان هاتووە ئەوانەی لە لیوای هەولێر هاوکاری دارایی حیزبی رزگاری دەکەن ئەو کەسانەن، ناوەکانیان: قاسم مەلافەندی و عیزەددین مەلا فەندی (لەخانەدانانی هەولێر)، خدری ئەحمەد پاشا و کوڕەکانی، عەزیزی ئەحمەد پاشا و کوڕەکانی، حوسێنی مەلا و کوڕەکانی، ئاغای جوکل ئاغا (لەسەرۆک هۆزەکانی دزەیی) هەروەها سالحی رەشید بەگی خۆشناو لە (خانەدانانی شەقلاوە) ".**

دەردەکەوێت ئەو کەسایەتییانەی سەرەوە هەرچەندە بە رووکەش لەگەڵ دەسەلاتبوون و پۆستی حکومیشیان هەبوو، بەلام لە ژێرەوە هاوکاری دارایی بزاڤی رزگاریخوازی کوردیان کردووە و سەرەڕای مەترسی ئاشکرابوونیان لە ئەرکی نەتەوەییان درێغیان نەکردووە.

لە برگەیەکی دیکەی هەمان نوسراوی فەرمی باسی پەیوەندی هەولێر و سەرانی حیزبی نێوبراو لەبەغدا دەکات کاتێك لەرێگەی پارێزەران عەونی یوسف و رۆستەم عەبدولجەبار ئەنجام دراوە، کە دوو رۆشنبیر و ئەندامی کارای ئەو حیزبە بوون.

دیارە ئەو دوو ئەندامە چالاکەی رزگاری، هەست بە جموجوڵ و چاودێری دەسەلاتدارانی هەولێر دەکەن، هەر بۆیە لەگەڵ قاسمی مەلافەندی روودەکەنە هەوارگەی پیرمام (سەلاحەددین) و لەوێ لە پەیوەندی و رێکخستنەکانیان بەردەوام دەبن. بەهۆی جموجوڵ و چالاکی ئەو رۆشنبیرانە، لقی هەولێری حزب بەردەوام چاودێری توندوتۆڵی لەسەر دەبێ"[٦٤].

دەردەکەوێ ئەو حیزبە وەکو پێویستیەکی مێژوویی لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی لەدایك ببوو، ئەو بۆشاییە سیاسییەی پڕکردەوە کە بە هۆی هەڵوەشاندنەوەی هیواوە دروست ببوو، هەروەها ئەو بەربەستەشی بڕیبوو کە تەنها هەڵگرانی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو بەخۆوە بگرێ، بەڵکو بووە بەرەیەکی راستەقینەی نەتەوەیی نیشتمانی. هەروەها حیزب رۆژنامەی (رزگاری) دەر دەکرد کە ئۆرگانی ناوەندی بوو، و دەگەیشتە زۆربەی شارو شارۆچکەکانی کوردستان[٦٥]. لە هەولێریش لەگەڵ بوونی چاودێرییەکی توندی دەزگا ئەمنیەکان، بەڵام دەگەیشتە دەست رۆشنبیرانی شار، زیاتریش لەلایەن خاوەن کتێبخانەی هەولێر شێخ محەمەد محەمەد ناسراو بە (شێخە شەل) بڵاو دەکرایەوە لەپاڵ رۆژنامە چەپەکانی دیکە کە لە بەغدا چاپ دەکران، ئەمە و جگە لە بڵاوکردنەوەی وێنەی بارزانی بەجل وبەرگی جەنەڕاڵی[٦٦].

لەلاپەڕەی دووەمی دۆکیۆمێنتی پێشوودا سەبارەت بە وێنەی فۆتۆگراف هاتووە: "**وێنەیەکی فۆتۆگراف مستەفا بارزانی بەجل و بەرگی جەنەڕاڵی سوپای رووسی، لەلایەن قاسم مەلافەندی بینراوە، هەمان وێنە لەلایەن هەواداران و ئەندامانی دیکەش بینراوە**".

ئەندامانی رزگاری و رۆشنبیر و کەسایەتیە نیشتمانیەکان لەهەولێر بەپەرۆشەوە دەیانڕوانیە رووداوەکان، لەدوای سەرکوتکردنی شۆڕشی بارزان (١٩٤٣- ١٩٤٥) کە وەرچەرخانێك بوو بۆ بوژانەوەی هەستی نەتەوایەتی، سەرکردەی شۆڕشیش لەگەڵ ئەفسەرانی حیزبی هیوا[٦٧] لەدوای پەیوەندی کردنیان بە کۆماری کوردستان لە مەهاباتدا[٦٨]،

بەتەنگ وەرگرتنی زانیاری و هەواڵەوە بوون، هەربۆیەش وێنەی بارزانی بەنهێنی لە هەولێر بڵاو دەکرایەوە کەوا جێگەی سەرنج و چاودێری بوو لەلایەن دەسەڵاتیشەوە. کاتێکیش بارزانی لەگەڵ دەستەیەکی دامەزرێنەر لە ئەفسەرەکان[٦٩]، بیرۆکەی دامەزراندنی حیزبێکی[٧٠] دانا (پارتی دیموکراتی کورد- عێراقی)لێکەوتەوە[٧١].

دەستەی دامەزرێنەر بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە، بانگهێشتی یەکگرتنی گروپ و لایەنە کوردییەکانی عێراقی کرد، بۆ دامەزراندنی پارتێکی پێشڕەوی نوێ و تێکۆشان لەو پارتەدا[٧٢]. کەسایەتییە دیارەکانی هەولێری نێو هەردوو حیزبی شۆڕش و رزگاری، لە پەیوەندیکردن بە هەمزە عەبدولاّ[٧٣]ی نێردەی بارزانی بۆ دامەزراندنی پارتی نوێ و پەیوەندیکردن بە ئیبراهیم ئەحمەدی بەرپرسی لقی ژیانەوەی کورد(ژ.ك) لە سلێمانی، رۆڵی دیاریان بینی[٧٤].

دوای ئەوەی راسپاردەکانی[٧٥] دەستەی دامەزرێنەر و بارزانی، لەلایەن هەمزە عەبدولاّ لەگەڵ نوێنەر و لایەنەکان تاوتوێ کرا، جیاوازی بیروڕا و بۆچوونەکان لەمەر راسپاردەکان هاتە کایەوە[٧٦]. حیزبی شۆڕش و رزگاری بڕیاری خۆهەڵوەشاندنەوەیان دا، لە هەفتەی یەکەمی ئابی ١٩٤٦ حزبی شۆڕش کۆنگرەی بەست، لەنێو سەرانی شۆڕش (ساڵح حەیدەری و جەمال حەیدەری و حەمید عوسمان) هاتنیان بۆ نێو ریزی پارتی بەجێبەجێ نەکردنی راسپاردەکان بەند کرد، بەڵام (عەلی عەبدولاّ، عەبدولکەریم تۆفیق و رەشید عەبدولقادر) لەگەڵ نوێنەرانی کۆیە و سلێمانی و کەرکووك لەگەڵ بڕیاری گشتی بوون، (نافیع یونس)یش

سەرەتا پشتگیری کردن بەڵام دوایی بە بیانوی ئاستەنگی کارکردن بە پەسەندیزانی لەپاڵ گروپی یەکەم بچێتە ریزی حیزبی شیوعی عێراقی و کۆتایی بە حیزبی شۆڕش هات، حیزبی رزگاریش لە هەفتەی دووەمی ئابدا، جگە لە نافیع یونس لە کۆنگرەدا بەکۆی دەنگ بڕیاری خۆهەڵوەشانەوە و چوونە ریزی پارتی نوێیان دا[77].

لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵێك کادیری گەنج و بەتوانای هەولێر، جیابوونەوە و لە کاروانەکە دابڕان، کە کاریگەری نێگەتیڤی لەسەر بزاڤی رزگاریخوازی گەلی کورد هەبوو لەو سەردەمەدا[78] بەڵام کۆنگرەی دامەزراندن لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦بەشێوەیەکی نهێنی لە بەغدا لە ماڵی (سەعید فەهیم) بەئامادەبوونی نوێنەرانی پێشووی شۆڕش و رزگاری و بەشداربوونی هەمزە عەبدوڵای نوێنەری بارزانی بەستراو (ئیبراهیم ئەحمەد)[79]یش وەکو چاودێری لقی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەشداربوو، لە کۆنگرەکەدا ٣٢ ئەندام ئامادەبوون[80].

کۆنگرە کارەکانی بەسەرکەوتوویی بەڕێوەبرد و رەزامەندی و بڕیار لەسەر پڕۆگرامەکانی نێوخۆی حیزب دراو، ناوی حیزب بوو بە (پارتی دیموکراتی کورد- عێراق)، دوای ئەوەش لیژنەی مەرکەزی و مەکتەبی سیاسی هەڵبژێردران، بڕیاردرا رۆژنامەی (رزگاری)[81] بکرێتە ئۆرگان و زمانحاڵی پارتەکە، بەهۆی ناوبانگی و بایەخی ئەو رۆژنامەیە لەنێو جەماوەردا ئەو بڕیارە درا[82].

دواتر لەرووی ڕێکخستنەوە لێژنەکان بەپێی ناوچەکان پێك هێنران، بۆ لێژنەی هەولێریش (ڕەشید عەبدولقادر، عەلی عەبدوڵا و عەونی یوسف) دانران بۆ سەرپەرشتی کردنی ڕێکخستنی نێو شار و دەروبەری(٨٣).

ئیدی لەساڵی ١٩٤٦ بەدواوە، دوو ڕوانگە و ئاراستەی بنەڕەتی، نوێنەرایەتی بزاڤی ڕزگاریخوازیان دەکرد، ئەوانیش: دیدگای چینی کارگەرانی عێراق کە لە حیزبی شیوعی عێراقی خۆی دەنواند، هەروەها دیدگای نەتەوەیی (بۆرژوازی ناوەند و بچووك) کە خۆی لە پارتیدا دەنواند(٨٤). چارەنوسی گەلی کورد، وەکو ستراتیژی کارکردن بووە ئەرکی سەرشانی پارتی و ئامانجی نەتەوەیی بە پارتیەوە گرێدرا(٨٥).

لەگەڵ بوونی ململانێ و ناکۆکی ئایدیۆلۆژی و هەڵبەز و دابەز لە پەیوەندییەکانی نێوان ئەو دوو پارتە، بەدرێژایی سەردەمی پادشایەتی، بەلاّم لە ئامانجی دژ بە بالاّدەستی ئیمپریالیزم و ڕژێمی کۆنەپەرستی پاشایەتی یەکیان دەگرتەوە(٨٦).

دەردەکەوێ پارتی ئامانجی نەتەوەیی لەسەرووی ئامانجی چینایەتی دانابوو، بەتایبەت لەو قۆناغە مێژووییەدا، چونکە واقیعی کۆمەڵگەی کوردی و خەباتی نەتەوایەتی ئەوەی دەخواست، کە سوود لە توانای هەموو چین و توێژەکان وەربگیرێ و ڕۆلی کۆمکارێك ببینێ کە کەسایەتیە نەتەوەیی و نیشتمانیەکانی تێدا کۆبکرێتەوە.

دیڤید مەکدوال ئاماژەیەك دەخاتە ڕوو دەڵێت: "دژەییەکانی دەشتی هەولێر وەك هەورێك بەسەر پارتیدا سێبەری کردبوو، تەگەرەیەك بوو بۆ

گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان و گرژی و ناکۆکی لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراقی حەتمی دەکرد"[87]. بەڵام لەراستیدا کوڕ و منداڵەکانی فیودال و خێزانە ئەرستۆکراتەکانی لیواکە، نەك تەنها لەگەڵ پارتی بەڵکو زۆربەیان لەگەڵ حیزبی شیوعیدا بوون و رۆڵیان هەبوو[88]، چونکە هزری چەپ لە چل و پەنجاکانی سەدەی رابردوودا، وەکو دیاردەیەکی تێبینیکراو و گشتی، جگەلە کوڕانی پیاوە نیشتمانپەروەرەکان زۆرجار کوڕانی کەسایەتیە نزیکەکانی رژێمی پاشایەتی لەباوکیان جیا دەبوونەوە و رێبازی چەپڕەوییان دەگرتەبەر و بەپێچەوانەی خواستی باوکیان لایەنگیری بەرەی گەلیان هەڵبژاردبوو[89].

بەهەر شێوەیەك بووبێت لە گۆڕەپانی سیاسی کوردستان دا، زۆربەی چین و توێژەکان ئەندام و لایەنگریان لەنێو ئەو دوو حیزبەدا هەبوو، بەدرێژایی سەردەمی پاشایەتی لەعێراقدا یەکێك لە سیما و خەسڵەتەکانی ئەو شارە، قۆستنەوەی بۆنە نەتەوەیی و رووداوە نیشتمانیەکان بوو، جەژنی نەورۆزیش وەکو جەژنێکی نەتەوەیی و هێمایەك بۆ دەربازبوون لە ستەم و هەڵاتنی خۆری ئازادی، بەشێوازی نهێنی و ئاشکرا لەو شارەدا زیندوو راگیراوە[90].

نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧ کە بەهەوڵ و کۆششی عەونی یوسف مۆڵەتی بۆ وەرگیرا[91]. ئەو نەورۆزە دوای ماوەیەکی کورت تێپەڕ بوو بەسەر دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کورد، بە رێککەوتن لەگەڵ حیزبی شیوعی عێراقیدا بڕیاری ئاهەنگ گێڕانیان دا، قۆستنەوەی ئەو بۆنەیە لەنێوان ئەو دوو لایەنەدا جۆرێك لە ململانێ و رەنگدانەوەی هەبوو،

لەگـەڵ ئەوەشـدا ئاهـەنگێکی فـراوان و گـەورەیان گێـڕاو جـەماوەرێکی بەرفراوان و بەرچاوی خەڵکی هەولێر جەژنیان پیرۆز کرد و بەشدارییان تێداکرد[٩٢].

لەگـەڵ ئـەوەی هەنـدێ لـە مـەلا و شـێخەکانی هـەولێر دژی ئاگرکردنـەوە بـوون[٩٣] و کۆمـەڵێك هـەوادارانی کۆمەڵـەی برایـانی مووسـڵمان (إخـوان المسلمین)[٩٤]یش پشتگیریان دەکردن و دژایەتی نەورۆزیان دەکرد، بەڵام نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧ بەگەرمی لەلایەن زۆرینەی دانیشتوانی هەولێرەوە پیرۆزکرا.

شـایەنی ئاماژەیـە بەشـێك لـە چـالاکییەکانی کۆمەڵـەی نێـوبراو لـە کوردستان هەبوو، لەساڵی ١٩٤٧ دوای بڕیاری دابەشکردنی فەلەستین، هەوادارانیان لە هەولێر خۆپیشاندانیان ئەنجام داو دروشمی (نرید من الحکومة سلاح) چەکمان لە میری دەوێت و (عاشت فلسطین حرة اسلامیة) بـژی فەلەسـتینی ئـازاد و موسـوڵمان و (الله ربنـا محمـد رسـولنا)یـان بـۆ پشتگیری فەلەستین وکێشەکەی بەرزکردبۆوە، ئەوانەی بەشداریان کرد (عبـدولوەهاب حـاجی حەسـەن، ئـەکرەم شاکر، زێـوەر خـەتاب، محەمـەد سـادق موختـار و عەبـدوڵا سـەلیم)بـوون کـە هەنـدێکیان بەرپرسـانی رێکخستنی کۆمەڵەکە بوون[٩٥].

ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەو گروپـە چەند کەسێك بوون چالاکیەکانیان لە مزگەوتـەکان تـاوتوێ دەکرد و دژایـەتی پـارتی و شـیوعیەکانیان دەکـرد، تـەنها خۆپێـشاندانیان بـۆ کێـشەی فەلەسـتین کـرد[٩٦] واتـە هـیچ هەڵوێـستێکی نەتەوایـەتیان نـەبوو ، لەکاتێکـدا خۆپێـشاندانی گـەورە

گەورە لەلایەن پارتی و شیوعی بۆ ناڕەزایی دەربڕین دژی حکومەتی پاشایەتی، لەوماوەیەدا دەکران[97].

بەتایبەتی دوای گەڕانەوەی ژمارەیەکی زۆری بارزانیەکان بۆ هەولێر و دەوروبەری لەدوای رووخانی کۆماری کوردستان، بەهۆی خراپی گوزەرانیان خۆنیشاندەران چەندین دروشمیان[98] بەرزکردبۆوە[99] کە مۆرکی نیشتمانی و نەتەوەیی هەبوو، دواتریش بوونە هەوێنی راپەڕینەکان تا رووخانی رژێمی پاشایەتی.

لە ٢٩ی ئازاری ١٩٤٧، کابینەی وەزارەتی چلەمین بەسەرۆکایەتی سالح جەبر پێکهێنرا، کە زۆربەی زۆری وەزیرەکان لەلایەن خۆیەوە هەڵبژێردرا و بەدڵ و هەوەسی باڵوێزخانەی ئینگلیزی بوون لەبەغدا[100]. نێوبراو هەر زوو لە کارنامەی وەزارەتەکەیدا جەختی لەسەر درێژەپێدان و پتەوکردنی پەیوەندی عێراقی – ئینگلیزی کردەوە، تا مۆرکردنی پەیمانی پۆرتسمۆس[101] ی لێکەوتەوە، ئەو پەیمانەش ناڕەزایی و راپەڕینی جەماوەریی گەورەی لێکەوتەوە[102]. باشوری کوردستانیش بەگەرمی بەشداری و پاڵپشتی ئەو راپەڕینە جەماوەریەی کرد[103]. گەنجە رۆشنبیر و نەتەوەپەروەرەکانی هەولێریش رۆڵی کارایان گێڕا، چ لە ناوەوەی شارە کوردیەکان و چ لە راپەڕینەکانی بەغدادا، بۆنموونە: لە رۆژانی راپەڕینی گەورە (وەسبە) ی٢٧ی مانگ دا (عاسم حەیدەری) لێپرسراوی رێکخستنەکانی بەری (کەرخ) بوو، (مەجید رەئوف) رێکخەری خۆپێشاندانەکانی خانەی مامۆستایان بوو، (جەودەت ئەحمەد ناجی)ش بەرپرسی رێکخستنەکانی ئافرەتان بوو لە ئەعزەمیە[104].

هەروەها (عومەر مستەفا) ناسراو بە (عومەر دەبابە) ئەندامی لێژنەی ناوەندی پارتی بوو لێپرسراوی کۆلێژ و ئامادەییەکان بوو[١٠٥] کە لە خۆپێشاندانی کۆلێژی ماف برینداربوو[١٠٦]. لەشارە کوردییەکانیش (یوسف حەنا) لێپرسراوی کەرکووک بوو، (حەمید عوسمان)یش لێپرسراوی سلێمانی بوو، لەهەولێریش زنجیرەیەك خۆپێشاندانی گەورەی جەماوەری کرا بە بەشداری گشت چین و توێژەکانی، وەکو دیاردەیەکی نوێ و بەرچاویش ئافرەتان بەشداریان تێدا کرد[١٠٧].

جێگای ئاماژەیە بەشداری کاریگەری کورد لە راپەڕینەکە دەگەڕێتەوە بۆ پێك هێنانی (لێژنەی هاریکاری نیشتمانی) کە پارتی دیموکراتی کورد هاوشانی حیزبی شیوعی عێراقی و حیزبی گەل و بالی پێشکەوتووخوازی حیزبی دیموکراتی نیشتمانی ئەو لێژنەیەیان پێك هێنابوو، کە تێیدا پارێزەری هەولێری (رەشید عەبدولقادر) نوێنەرایەتی پارتی دەکرد[١٠٨]. لەگەڵ بوونی هەندێ کێشە لەنێو ئەندامانی پارتی و شیوعی لەکاتی کارکردندا[١٠٩]، بەلام راپەڕین سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا و هاوکاری کردنی پارتە نیشتمانیەکان و هەماهەنگی بوونیان بووە جێگەی رەزامەندی گەلانی عێراق، ئەندامانی کوردیش هەڵوێستی ئەرێنیان نواند لە ئەنجومەنی نوێنەرانی بەغدا، لە رووداوەکانی ٢٧ی مانگ لە بەغدادا کە بە رۆژی راپەڕینی گەورە (وەسبە) ناسرا، لەنێوانیاندا نوێنەری هەولێر (محەمەد نەقیب) و نوێنەری کۆیە (محەمەد زیاد ئاغا)[١١٠] دەست لەکارکێشانەوەیان راگەیاند[١١١].

بە هەر جۆرێك بێت لە ئاكامی ئەو راپەڕینە جەماوەرییەی بەغدا و شارەكانی كوردستان و شارەكانی تری عێراق، بووە هۆی ناچاركردن و رووخانی كابینەكەی سالح جەبر و پوچەڵكردنەوەی پەیماننامەی پۆرتسمۆس و دامەزراندنی حكومەتێكی نوێ بەسەرۆكایەتی محەمەد سەدر كە چەند كەسایەتیەكی نیشتمانپەروەری تێدا بەشدار بوو[112].

لە شوباتی ١٩٤٨دا نوێنەری چین و توێژەكانی شار و شارۆچكە كوردیەكان بەمەبەستی رێزلێنان لە گیانی قوربانیانی راپەڕینەكە، بەچەپكە گوڵی وەفادارییەوە بەرەو مەزارگەی شەهیدان بەرێكەوتن، لە ١٣ی شوباتدا نوێنەرانی هەولێر و كۆیە گەیشتنە بەغدا و بەشداری رێوڕەسمەكانیان كرد[113].

بەم شێوەیە هاوكاری پارتی و شیوعی لەو سەردەمە نموونەیەكی باشی تێكۆشان و خەباتی هاوبەشیان پێشكەش كرد و گیانی وشیاربوونەوەی سیاسی و پێشكەوتنخوازی و نەتەوەخوازی بوژایەوە.

بەڵام ئەو نیمچە ئازادیەی لە ئەنجامی وشیاری و فیداكاری جەماوەر و راپەڕینی كانوونی ١٩٤٨ هاتەكایەوە، زۆری نەخایاند، بەهۆی دروستبوونی كێشەی فەلەستین[114] بەبیانووی بارودۆخی وڵات و پاراستنی سوپای عێراقی شەڕكەرا بۆ ئازاد كردنی فەلەستین، رژێمی پاشایەتی حوكم و دادگای عورفی راگەیاند و كەوتە پەلاماردان و راوەدونانی نیشتمانپەروەران لەسەرتاسەری عێراق بە كورد و عەرەبەوە، بەندیخانەكانیان بە زیندانی پڕكردەوە[115].

دەسەڵاتدارانی سەربازی و پۆلیسی نهێنی لە هەولێر لە ٢٤ی ئایاری ١٩٤٨ هەڵمەتێکی راوەدونان و دەستگیرکردنیان لە هەولێر دەست پێکرد، کە ٥٤ کەس دەستگیر کران، کە لە ٢٠ی تەمموزی ١٩٤٨دادگایکران، لە دیارترینیان: (عەونی یوسف، شێخ محەمەد محەمەد، جەوهەر حوسێن مەلا، عەلی فەتاح، ئەنوەر محیەدین، رەقیب حوسێن مەلا، خالید شێخ جەواد، عاسم حەیدەری و فایەق نادر) حوکمدران[١١٦]. هەڵمەتی تیرۆر و تۆقاندن لەسەردەمی کابینەی نووری سەعید[١١٧] گەیشتە ئەوپەڕی کە ژمارەیەکی بەرچاوی هەولێر حوکم دران، لەنێویاندا (عەزیز محەمەد، جەمال حەیدەری (١٩٢٦- ١٩٦٣)، نافیع یونس، شێخ محەمەد محەمەد و عەلی فەتاح دزەیی)[١١٨].

لەنێوان سالانی ١٩٤٩- ١٩٥٤ دوو حیزبی دەسەڵاتداری دەرباری پادشایەتی هەبوو، ئەوانیش پارتی یەکێتی دەستوری (حزب الإتحاد الدستوري) و پارتی ئوممەی ئیشتراکی[١١٩] (حزب الأمة الأشتراكي) بوون، ئەندام و لایەنگرانیان لە دەرەبەگ و میر و ئاغا و شیخ و موڵکدارە گەورەکان و بنەماڵە دیارەکان پێکهاتبوون، دەسەڵاتیان بۆ پاوان دەکرا و بەردەوام نوێنەری درێژخایەن بوون لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا و بە تەزکیە دادەنران و میللەت بە رقەوە سەیری دەکردن[١٢٠]. لەساڵی ١٩٤٩ ئەندامانی کارگێڕی بالای حزبی ئیتحادی دەستوری لە هەولێر پێکهاتبون لە: (سەدیق قادر میران، عەلی ئەحمەد ئاغا، عیزەددین مەلا و محەمەد عەلی مەحمود)[١٢١]. ئەوانەی لەگەڵ حیزبی ئومەی ئیشتراکی بوون: (سەید محەمەد نەقیب) و (مەعروف پیرداود) و چەندانی دیکە[١٢٢]. بەلام دانیشتوانی هەولێر کە زۆرینەبوون، لەگەڵ ئەو

حیزبانەدا نەبوون بەڵکو دژایەتیشیان دەکردن، چونکە لە بەرەی گەل و میللەتدا نەبوون. بۆنموونە بەگوێرەی بەڵگەنامەیەکی حکومی هەڵویستی خەڵکی هەولێر بەم شێوەیە دەخاتە روو: "دانیشتوانی هەولێر پێشوازی سالح جەبریان نەکرد، کاتێك لە ٥/٥/ ١٩٥٢ سەردانی شارەکەی کرد، ئامادەی ئەو خوانەش نەبوون کە لە ماڵی شێخ محێدین شێخ ساڵح بەرزنجی (خاوەنی تەکیەی هەولێر) بۆی ئامادەکرابوو، وە بەشداری چایی خواردنەوەکەشیان نەکرد کەلە خانەی پشوودان (دار الأستراحة) لەوێستگەی شەمەندەفەر[١٢٣] بۆی ئامادەکرابوو"، هەروەها هاتووە: "زۆرینەی خەڵکی هەولێر شارەکەیان جێهێشت بەبیانووی سەرقاڵبوون بە ئیش وکارەکانیان، تەنانەت بابەتی پێشوازی شێخی ئامارژەپێکراو لەسەرۆکی حیزب تائێستاش لەگەڕەك و بازاڕ بووە بە قسە و باسی سەر زاران و ئەوەش وایکرد رووبەرووی رەخنەی توند ببێتەوە و دانیشتوانی هەولێر دابڕ ببێت لە بەرامبەریدا"[١٢٤].

ئەوەش بەڵگەیەکی روونە کە دانیشتوانی هەولێر چەند رقیان لە کاربەدەستانی دەرباری پادشایەتی بووە بە تایبەتی صالح جەبر،بۆیە دەبینین کەسایەتیەکی وەکو شێخ سەرەڕای ئەوەی پلە و پایەیەکی دیاری ئاینی و کۆمەڵایەتی هەبووە[١٢٥] لەنێو شاری هەولێردا، بەڵام بەهۆی پێشوازیکرنەکە بەشێکی خەڵکی شارەکەی لێدابڕاوە .

لەگەڵ ئەوەی لەلایەن گەورە پیاوانی ئەو شارە پێشوازی گەرمیان لێکرا، بەپێی راپۆرتە تایبەتیەکانی دەزگاکانی وەزارەتی کاروباری ناوخۆی هەولێر ئەو رۆژە ٥٢ کەس لە ناسراوانی شار بەرەوپیری چوون، کە ٢٢یان لە ئاغاکانی دزەیی بوون[١٢٦].

پارتی بۆ ئەو سەردانە بەیاننامەیەکی دەرکرد و هێرشی توندوتیژی کردە سەر رژێمی پاشایەتی و سالح جەبر و ئەو کوردانەی دابوویانە پالی، لە بەیاننامەکە لە سێدارەدانی ٤ ئەفسەرەکە و دەربەدەربوونی عەشیرەتی بارزان و بارودۆخی خراپیان خرابووە روو کە هەموو لە سایەی دەسەلاتی سالح جەبرەوەیە(١٢٧).

لەسالانی ١٩٤٩- ١٩٥٥ کوردەکان رۆلیان دیاربوو لەنێو بزوتنەوەی نیشتمانیدا، لەنێو حیزبی شیوعی عێراقیدا بەجارێك بالادەست بوون، توێژەرێك ئەو ماوەیە بەماوەی بووژانەوەی کوردەکان لەناو حیزب وەسف دەکات(١٢٨). چونکە لەدوای نسکۆ گەورەکەی بەسەر حیزبی شوعیدا هات(١٢٩) لەنیوەی یەکەمی سالی ١٩٤٨ رێکخستنەکانی حیزب لەبەریەك هەلوەشایەوە، لەنیوەی دووەمی هەمان سالدا ئەو کەسایەتیە حیزبیانەی کە دەستگیر نەکرابوون، دەستیان بە خۆرێکخستنەوە کرد، (بەهادین نووری) توانی بەرپرسیارییێتی ئەو حیزبە دەستەبەر بکات و لە ئەیلوولی ١٩٤٩ تا شوباتی ١٩٥٣ بالادەست بێت، لەدوای ئەویش هەردوو کەسایەتی هەولێر: (کەریم ئەحمەد داود) لە نیسانی ١٩٥٣ تا حوزەیرانی ١٩٥٤ سکرتێری ئەو حیزبە بێت، دوای ئەویش (حەمید عوسمان) لە حوزەیرانی ١٩٥٤ تا حوزەیرانی ١٩٥٥ پلەی سکرتێری دەستەبەر بکات(١٣٠).

جێگای ئاماژەیە لەو ماوەیەدا جیابوونەوە و کەرتبون لەنێو رێزەکانی ئەو حیزبەدا سەری هەلدابوو، لەوێشدا هەولێرییەکان رۆلیان هەبوو،

(عەزیز محەمەد و جەمال حەیدەری) لەگەڵ باڵی جیاخواز بوون سەرکردایەتی باڵی ئاڵای کارگەران (رایە الشغلیە) یان دەکرد[١٣١].

هەولێرییەکان لە بزوتنەوەی ئاشتیخوازان (أنصار السلام)(رۆڵیان هەبوو[١٣٢] لەساڵی ١٩٥١ لێژنەیەکیان دامەزراندبوو ژمارەیەك کەسانی نیشتمانی و دیموکراتخوازی تێدابوو، لەئەندامە دیارەکانی (جەلیل وشیار، مستەفا خدر مستەفا، قادر رەشید، موهیب حەیدەری، فائق نادر، شەریف محەمەد سەعید جامباز، ئەسعەد خدر، ساڵح حەیدەری، شەریف عوسمان، شێخ محەمەد محەمەد، مەجید قادر، ئیسماعیل رەسوڵ، عەباس سیامەند، شێخ لەتیف، زێوەر خەتاب، عەونی یوسف، ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی ١٩٢٥- ١٩٧٦) بوون، لە دیارترین ئافرەتە بەشداربووەکانیش (خەیریە نادر، ساکنە سلێمان و فەریدە یونس) بوون ، جێگای ئاماژەپێکردنە دواتر هەڵمەتێکی واژووکردنیش لەلایەن (عاسم حەیدەری) دژی بەکارهێنانی بۆمبی ئەتۆمی کۆکرایەوە و رەوانەی لێژنەی ئازادیخوازانی بەغدا کرا،لەو سۆنگەیەوەش لەساڵی ١٩٥١ لە ناوەراستی شاری هەولێر پەیکەری کۆتری ئاشتی لەلایەن هونەرمەند (جەواد رەسول) دروست کرا و (فایەق نادر و محەمەد سەعید جامبان) خەرجیەکەیان لە ئەستۆ گرت[١٣٣].

بارودۆخی خراپی ئابووری و سیاسی و داواکاری خەڵك بۆ چاکسازی کردن لەو بوارانەدا بەردەوام بوو، تا لە تشرینی دووەمی ١٩٥٢، هەلومەرجەکە پەرەی سەند و قوتابیان زنجیرەیەك خۆپیشاندانیان لە بەغدا کرد و پێکداادان روویدا بەتایبەت لە ٢٠- ٢٤ ی تشرینی یەکەمدا

کە بووە هۆی رووخانی کابینەی (مستەفا عومەری)[١٣٤] و پێك هێنانی کابینەیەکی سەربازی کاتی بەسەرۆکایەتی سەرۆك ئەرکانی سوپا نورەدین مەحمود (٢٣ تشرینی دووەمی ١٩٥٢- ٢٩ کانوونی دووەمی ١٩٥٣) کە رووبەڕووی هێزە نیشتمانیەکان بووەوە و حوکمی عورفی داسەپاند و بڵاوکراوە و جوڵەی پارتە بەرهەڵستکارەکانی لەکارخست[١٣٥].

خۆپێشاندان و راپەرینەکان سنوری بەغدایان بەزاند، لە ٢٠ی تشرین لەهەولێر هەوادارانی پارتی و شیوعی، بە بەشداری قوتابیان و پیشەگەران و کاسبکاران رژانە نێو بازاڕی گەورەی هەولێر و بەرەو سەرا بەرێکەوتن و رووبەڕووی هێزەکانی پۆلیس بوونەوە، لەهەردوو لا بریندار هەبوو، لەهەمان رۆژدا هەڵمەتێکی راوەدوونان لەهەولێر دەستی پێکرد[١٣٦].

دیارە ئەو راپەرینە هەرچەندە لەرووی قەبارە و گەورەیی وەکو راپەرینی ١٩٤٨ نەبوو، بەلاّم بەدووەم راپەرینی گەورەی جەماوەری و وشیاربوونەوە دادەنرێ ، لەگەڵ داواکاری خەڵك بۆ ئازادییە دیموکراتییەکان و لادانی حوکمی عورفی و نەمانی راوەدوونان و چاککردنی بارودۆخی گوزەرانی خەڵك بەلاّم رژێمی پاشایەتی بەتەنگ کێشەکان نەهات و زنجیرەی ناڕەزایی هەر بەردەوام بوو.

لە ٢٢ی نیسانی ساڵی ١٩٥٣دا، لەناوچەی دەزەییایەتی[١٣٧] دەشتی هەولێردا بەرهەمی جولانەوەی وشیاریی چینایەتی هاتەبەر، کاتێك راپەرینێکی فراوانی جووتیاران لە گوندی(قازیخانە)دا هەڵگیرسا و

بلێسەکەی ٣٠٠ گوندی گرتەوە، کە دەنگ و رەنگێکی کاریگەری لە ناوچەکە و لە عێراق دایەوە[١٣٨].

حیزبی شیوعی عێراقی و پارتی دیموکراتی کوردستانی- عێراق[١٣٩] هاندەر و پاڵپشتی راپەرینەکە بوون[١٤٠]، وشیاری چینایەتی جووتیارانیش، بەهۆی رێکخستنەکانی ئەو دوو حیزبە لە رێگەی کادیر و رۆشنبیرانیان لە برەوسەندن دابوو، دەشتی هەولێریش وەکو زەمینەیەکی لەبار و گونجاو، بەتایبەتی لە پەنجاکانی سەدەی رابردوودا بیروباوەڕی حیزبە نهێنیەکانی تێدا بڵاو دەبۆوە، ، هەروەها بڵاوکراوە و رۆژنامەکانی تایبەت بە چینی کارگەر و جووتیاران دەگەیشتەدەست کادیرانی دەشت ، وەکو (بانگی فەلاح) و (دەنگی داس)کە لەلایەن حیزبی شیوعی دەردەچوو، پارتی دیموکراتی کوردستانیش (نرکەی جووتیار)ی دەردەکرد، ئەو بڵاوکراوانەش بووبوونە هەوێنی کامڵ بوونی هەستی شۆڕشگێڕی لەناو جووتیاراندا[١٤١] تا رادەیەك جۆرێك لە وشیاری لەنێو داخوازی جووتیارانیش بەدی دەکرا، لەپاڵ داخوازی هەڵگرتنی جەور و ستەم و رەفتای خراپی موڵکدارەکان و مانەوەی جووتیاران لەسەر زەوی خۆیان و هەڵگرتنی سەرانە و سوخرەکاری و.. هتد، داوای کردنەوەی قوتابخانە و نەخۆشخانە و پەینی کیمیاوی و قیرتاوکردنی رێگاوبانەکانیان دەکرد[١٤٢] هەربۆیە هەندێ بیروبۆچوون هۆکاری وشیاربوونەوەی جووتیارانی دەشتی هەولێر بەبەراورد لەگەڵ جووتیارانی ناوچەی دیکە، دەکەنە هۆکاری راپەرینەکە[١٤٣].

دیارە هەر لە ساڵی ١٩٥٢ دا کاتێك دەرەبەگەکان ئامێری کشتوکاڵی (تراکتۆر)یان هێنایە دێهاتەکان، زیاتر ئەو ئامێرەیان قۆستەوە و دەستیان بەسەر زەوییە چاکەکاندا گرت و بەهۆیەوە ژمارەیەکی زۆری جووتیارانیشی بێکارکرد[١٤٤].کە ئەوەش هۆکارێکی دیکە بوو[١٤٥].

لەکاتی ڕاپەڕینەکەشدا، زۆر لە پیاوانی ئایینی هانی خەڵکیان دا پاڵپشتی جووتیاران بن و لە وتاری ڕۆژی هەینی هەڵوێستی دروستی ئاینییان نواند[١٤٦] کاتێکیش بەهۆی دەستڕۆیی ئاغاکان و تاوانبارکردنی جووتیاران بە دژایەتی کردنی ڕژێمی پاشایەتی، بە پاڵپشتی حکومەت، ڕاپەڕینەکە بە هێنانی پۆلیسی گەڕۆك[١٤٧] لە خوارووی عێراق بۆ دەشتی هەولێر کپ کرایەوە و ژمارەیەك خاووخێزانی گوندە ڕاپەڕیوەکان دوورخرانەوە و دێ بەدەر کران و ژمارەیەکیش خرانە بەندیخانەکانەوە[١٤٨].

لە پاش سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە هەندێ لە پارێزەران خۆبەخشانە کەوتنە بەرگری کردن لە جووتیاران و ڕۆڵی گەورەیان گێڕا، کە دواتر بووە هۆی دەسگیرکردنیان لەنێوانیاندا (عەونی یوسف، ڕەشید عەبدولقادر[١٤٩] هەروەها زێوەر خەتاب[١٥٠]).

ئەو ڕووداوە لە دانیشتنی ٢٥ی کۆبوونەوەی ئاسایی ئەنجومەنی نوێنەران لە ١٣ی ئایاری ١٩٥٣دا لەلایەن (مەسعود محەمەد)ی ئەندامی ئەنجومەن بە چاکی ورووژێنرا، هەردوو بابەتی گیرانی پارێزەران و چەوسانەوەی جووتیارانی کردە یەك و هەڵوێستی حکومەتی بە ناڕەوا و دژی دادپەروەری خستەروو[١٥١].

دیارە (مەسعود محەمەد) لەپێش ئەو رێکەوتەدا پاڵێوراوی کۆیسنجەق بوو لەهەڵبژاردنەکەدا دەرچووبوو، لە خولی سێزدەمینی ئەنجومەنی نوێنەراندا بوو ، کاتێك یەکەم هەڵبژاردنی نوێنەران لە ٧ی کانوونی دووەمی ١٩٥٣ بەشێوەیەکی راستەوخۆ ئەنجام درا لە سەرتاسەر ی عێراقدا،خولەکە لە ٢٤ی کانوونی دووەمی ١٩٥٣ دەستی پێکرد تا ٢٨ی نیسانی ١٩٥٤ بەردەوام بوو، لەو ماوەیەدا مەسعود محەمەد وەکو داکۆکیکارێکی بەتوانا، پرسە گرنگەکانی گۆرەپانی کوردی دەخستەروو وەك: بابەتی بارزانییە حوکم دراو و دوورخراوەکان و کێشەی جووتیارانی دزەیی و چاندنی توتن لە کوردستاندا کە حکومەت باجێکی قورسی خستبووە سەر[١٥٢].

کاتێکیش فازل جەمالی (٨ی ئازاری ١٩٥٤- ٢٩ی نیسانی ١٩٥٤) سەرۆك وەزیران دەستی لەکارکێشایەوە، ئەرشەد ئەلعومەری (٢٩ی نیسانی ١٩٥٤- ٣ی ئابی ١٩٥٤) کابینەیەکی نوێی پێکهێنا، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی پێشوو و ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی نوێی دا[١٥٣].

پارتە ئۆپۆزسیۆن و نیشتمانییەکان[١٥٤] بڕیاری پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانیان بۆ هەڵبژاردن دا تا بەشداری هەڵبژاردنەکان بکەن، ئەو بەرەیە پارتی دیموکراتی کوردستانی پشتگوێ خستبوو، لە گەڵاڵە نامەکەیدا هیچ ئاماژەیەکی بە مافی رەوای گەلی کورد نەکردبوو[١٥٥] پارتی بۆ پارێزگاری لە رێکخستنەکانی خۆیدا، ئەندامانی بڕیاریاندا بەشێوەیەکی نهێنی لەرێگای پاڵێوراوەکانی (ئیبراهیم ئەحمەد، مەسعود

محەمەد، عومەر مستەفا، مەعروف بەرزنجی) بەروکەشێکی بێلایەنانە بەشداری هەڵبژاردنەکە بکەن[١٥٦].

لە هەولێر فشار خستنە سەر پاڵێوراوان بەردەوام بوو، بە جۆرەها شێواز ناچاری خۆکێشانەوە دەکران، ئەوانەی کە پڕوپاگەندەشیان بۆ پاڵێوراوان دەکرد چاودێریی توو ند دەکران بۆ نموونە کادیرانی پارتی لە هەولێر (عەبدولا ئیسماعیل[١٥٧]، سالح شێرە و کەریم عارەب) دەستگیرکران بە بیانووی جۆراو جۆر کە لە هەولێر و دەروبەری بە مەبەستی دەنگدان دەگەڕان[١٥٨].

پاڵێوراوانی بەرەی نیشتمانی بەهەمان شێوە، (عەونی یوسف) بە تۆمەتی نانەوەی ئاژاوە دەسگیرکرا و (سالح رەشید میران)یش دوای گیرانی ئەو لە پاڵێوراوی خۆی کێشایەوە[١٥٩].

لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك هەڵبژاردن لە هەموو شارەکانی عێراقدا لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٤ تەواو بوو[١٦٠] هەرچەندە لەژێر توندوتیژی و تۆقاندن ئەنجامدرا، بەڵام پارتی توانی سەرکەوتنێکی گرنگ بەدەست بهێنێت و کاندیدی خۆی بگەیەنێتە ئەنجومەنی نوێنەران، بە ڕێگای پاڵێوراوی شارۆچکەی کۆیەی سەر بە لیوای هەولێر مەسعود محەمەد بۆ جاری دووەم ببێتە نوێنەر لە ئەنجومەن و بەرەیەکی بەرهەڵستکاری نیشتمانی لە ئەنجومەن بە هاوکاری نوێنەرانی پارتی دیموکراتی و پارتی سەربەخۆیی[١٦١] پێك بهێنێ[١٦٢].

بەم شێوەیە بەرەی نیشتمانی هەڵبژاردن توانی ١٠ دە کورسی بەدەست بهێنێ و بەهاتنە پاڵ مەسعود محەمەدیش بوون بە ١١ کورسی[١٦٣].

بەلاّم ئەنجامەکانی هەڵبژاردن جێگەی رەزامەندی سەرانی دەرباری پادشایەتی نەبوون، هەربۆیە تەمەنی خولی چواردەمینی ئەنجومەنەکە لە دوو مانگ تێپەڕی نەکرد، تەنها کۆبوونەوەیەکی بەست لە ٢٦ی تەمووز و بە وتارێکی دەربار (العرش) ئەنجومەن پشووی رەسمی وەرگرت تا کابینەیەکی نوێی وەزارەت لەلایەن نووری سەعیدەوە (٣ی ئابی ١٩٥٤- ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٥) پێك هێنراو ئەنجومەن هەڵوەشێندرایەوە و بەچەند مەرسوومێکی سەیر ئەو ئازادییە سنووردارەی کە هەبوو ریشەکێش کرا[١٦٤].

لەو ماوەیەدا هێزە نیشتمانیەکان سەرکۆنەی سیاسەتی گشتی حکومەتیان دەکرد، سیاسەتی دەرەوەی حکومەت بە ئاراستەی بەستنەوەی عێراق بە هاوپەیمانێتیەکانی لەگەڵ رۆژئاواوە دەڕۆیشت[١٦٥]، بەتایبەتی دوای ئەوەی گەلاّڵەنامەی عێراقی- تورکی ئامادەکرا و لە ٢٤ی شوباتی ١٩٥٥ واژۆکرا، حیزبی شیوعی عێراقی بەتووندی دژی وەستا و پرۆتستۆی کرد، بەهەمان شێوە پارتی دیموکراتی کوردستانیش، پەیمانەکەی کە بە (پەیمانی بەغدا ناسرا، بە دژی بزاڤی کوردی لە عێراق و تورکیا و ئێران دانا، هەروەها بە دوژمنێکی سەرسەختی کورد و عەرەب و ئاشتیخوازانی لە رۆژهەلاّتیش دانا[١٦٦]، بۆیە دژایەتی میللەتی کورد بۆ ئەو پەیمانە شاراوە نەبوو، تەنانەت لەماوەی سێ ساڵی کۆتایی دەسەلاّتی پاشایەتی لە عێراق،

یەکێك لە دروشمە گرنگەکانی کۆبوونەوە و خۆپیشاندانەکانی شاری هەولێر دژایەتی کردنی ئەو پەیمانە بوو، بەو هۆیەش ژمارەیەکی بەرچاوی گەنجانی شار دەستگیرکران لەوانە: جەمال حەیدەری، عادل سەلیم، شێخ محەمەد محەمەد، زوبێر بیلال، حوسێن رەشوانی و ئیسماعیل رەسول و چەندانی تر[١٦٧].

دیارە لەهەمان ساڵدا رووداوێکی گەورە سەری هەڵدا و لەسەر ئاستی وڵاتانی ناوچەکە و جیهان دەنگی دایەوە، ئەویش خۆماڵی کردنی کەناڵی (سوێس) بوو لە میسر کاتێك لە ٢٦ی تەمووزی ١٩٥٦ لە وتارێکدا راگەیەنرا[١٦٨]. گەلانی عێراق بە دڵ پێشوازی و پشتگیرییان لەو پرۆژەیە کرد[١٦٩] هێزە نیشتمانیەکانیش بەهەمان شێوە بزوێنەری چالاکیە سیاسییە جەماوەرییەکان بوون.

بەپێی بەڵگەنامەیەك پارێزەرانی هەولێر بۆ پشتگیری گەلی میسری و بڕیاری خۆماڵی کردنەکە ماندەگرن و ئامادەی ژوورەکانی دادگا نابن[١٧٠]، تەنانەت پارێزەر (زێوەر خەتاب) بروسکەیەکی هاوسۆزی و پاڵپشتی گەلی کورد ئاراستەی سەرۆکی میسری جەمال عەبدولناسر کرد و خودی سەرۆکی میسری وەڵامی بروسکەکەی دایەوە، دواتریش نێوبراو لەگەڵ لێپرسراوی رێکخستنەکانی پارتی لە هەولێر (عەبدوڵا ئیسماعیل) و بەئامادەبوونی نوێنەرێکی حیزبی شیوعی عێراقی بەناوی (محەمەد خەیات)، یاداشتێکی ئیمزا کۆکردنەوە ئامادە دەکەن و لەدیدارێکی کورت و نهێنی سەردانی باڵوێزخانەی میسر لە بەغدا دەکەن و یاداشتەکەیان پێشکەش دەکەن[١٧١].

سەران و ئەندامانی پارتی[172] بەهۆی پشتگیریکردنیان لە خەباتی گەلی میسری، دووچاری راوەدونان و گرتن هاتن و خرانە بەردەم دادگای عورفی، لەوانە: ئیبراهیم ئەحمەد، عومەر مستەفا و حیلمی عەلی شەریف بوون، کە خرانە ژێر چاودێری پۆلیسەوە، هەروەها مەلا عەبدوڵڵا ئیسماعیل گیرا و داوای کەفالەتی[173] لێکرا[174].

لەکاتی هێرشی سێ قۆڵیدا بۆسەر میسر[175]، تەواوی گەلی کورد هاوسۆزی خۆی دەربڕی، تەنانەت خودی بارزانی، ئەو کاتە لە یەکیەتی سۆڤیەت دەژیا، ئامادەیی خۆی و هاوڕێکانی دەربڕی بۆ خۆناونووس کردن وچوونیان بۆ میسر بە مەبەستی داکۆکیکردن و بەرگریکردن دژی ئەو دەست درێژییە سێ قۆڵییە[176].

دیارە ئەو هەڵوێستە نیشتمانیەی بزاڤی رزگاریخوازی و گەلی کورد نواندی، لەپاڵ هێزە نیشتمانیەکانی دیکەی عێراقدا، بەرامبەر بە کێشەی عەرەب، پەیامێکی برایانە و هاوسۆزی بوو دژی دەست درێژیەکانی رۆژئاوا، کە ئەو کاتە لەلایەن زۆربەی کۆمەڵگاوە وا دەخوێندراوە کە رۆژئاوا دژی گەلانی چەوساوەن و یاری بە چارەنووسیان دەکەن، لەلایەکی ترەوە هۆشداری یەکیەتی سۆڤیەت بۆ مەترسی ئەو وڵاتانە زیاتر پێگەی پارت و گروپە چەپەکانی بەهێزتر کرد بوو، بەتایبەتی حیزبی شیوعی توانی ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوە و کەمپی سۆسیالیزمی وەکو فریادرەسی گەلانی چەوساوە بە خەڵك ئاشنا بکات.

دوای ئەوەی راپەڕینی تشرینی ١٩٥٦ی گەلانی عێراق سەرکوتکرا، بزاڤی نیشتمانی زیاتر پەرەی سەند، هەر لەو چوارچێوەیەشدا هێزە

سیاسییە نیشتمانییەکان کەوتنەخۆ بۆ پێک هێنانی بەرەیەکی بەرهەڵستکاری یەکگرتووی نیشتمانی و نهێنی، بۆ ئەو مەبەستە هەر چوار حیزبی عێراقی (هەڵوەشاوە بەیاسا)[177]، کە پێک هاتبوون لە حیزبەکانی (سەربەخۆیی، نیشتمانی دیموکراتی، حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی عێراقی[178] نهێنی)، (بەرەی یەکیەتی نیشتمانی)یان پێکهێنا لە شوباتی ١٩٥٧یش بەرەی (لێژنەی نیشتمانی باڵا) و (لێژنەی جێبەجێکردنی باڵا)یان لە زۆربەی لیواکان پێک هێنا، دواتریش لە ناوەراستی هەمان ساڵدا پەیوەندییان بە (ئەفسەرە ئازادیخوازەکان)[179] کردو (لێژنەی باڵای ئەفسەرە ئازادیخوازەکان)یان دامەزراند[180].

بەڵام ئەو لێژنانەی لە لیواکانی عێراق پێک هێنران، لە کوردستان (لەسەروویان هەولێر) سەرکەوتوو نەبوو، بەهۆی بەشداری پێنەکردنی پارتی لەو بەرەیەدا، لەو بارەیەوە (ساڵح حەیدەری) ئەوکاتە بەرپرسی لقی کوردستانی حیزبی شیوعی بوو، دەڵێت: **"لەگەڵ بوونی راسپاردەکانی سەرکردایەتی بۆ پێکهێنانی لێژنەکانی بەرە لە بازاڕ و شوێنە گشتیەکان و فەرمانگە و قوتابخانەکان و.. هتد، نەمانتوانی پشت بە هێزە تایبەتیەکانمان ببەستین، ئێمە دووپاتمان کردەوە بۆ پاڵپشتی و راکێشانی جەماوەر پێویستمان بەهاوکاری پارتی دیموکراتی یەککگرتووی کوردستانی عێراق دەبێ..."**[181].

لە ٩ی ئازاری ١٩٥٧ گەلاڵەنامەی بەرە لە شێوەی بەیاننامەیەکدا دەرچوو، کەلە ٥ خاڵی هێور پێکهاتبوو، بەهیچ شێوەیەك مەسەلەی مافە نەتەوایەتیەکانی کوردی تێدا نەبوو، بەڵکو گرنگی دابوو بە بەدیهێنانی

خـەونی یەکیـەتی عـەرەب وئـازادی گـەلی عـەرەبی لـە عێراقـدا و گەشەسـەندنی سیاسـیانەی هەرێمـە عەرەبیـەکان و..هتـد، هـیچ بەرنامەیەکی وای تێدا نەبوو ئاماژە بە رووخـانی دەسەڵاتی پاشایەتی بدات[١٨٢].

بەشدارنەبوونی پارتی لەپاڵ ناڕازی بوونی هەردوو حیزبی (سەربەخۆیی و بەعس) بەبیانووی ئەوەی پارتی ئامانجی جیاخوازی هەیە و دروشمی مافی چارەنووسی بەرزکردۆتەوە و باوەڕی بە بیری (بێلایەنی ئەرێنی) نیە، لەلایەك و خەمساردی خودی حیزبی شیوعی عێراقیش هۆکارێکی دیکەی بەشدارنەبوونەکە بوو[١٨٣].

جگە لە خودی پارتی و تێبینیەکانی لەسەر بەیاننامەی بەرە کە داخوازی کـوردی تێدانـەبوو[١٨٤]، دیـارە لەگـەڵ بـوونی پێگـەی حیزبـی شـیوعی عێراقـی لـە کوردسـتان، بـەڵام بەشـدارنەبوونی پـارتی کـار و چـالاکیەکانی بـەرەی سـست و خـاو کردبـوو[١٨٥]. سـەرەڕای هەڵوێسـتە نیـشتمانیەکانی پـارتی و هەماهـەنگ بـوونی لەگـەڵ ڕەوتـی بزاڤـی نیـشتمانی عێراقـی، دوورخـستنەوەی لـەنێو بـەرەدا بـووە خـاڵێکی لاوازی ئـەو بەرەیـە، توێـژەرێك لـەو بارەیـەوە ئامـاژە دەکـات و دەڵێـت: "**لـەو بـوارەدا نەتەوەپەرسـتانی عـەرەب کەوتنـە هەڵەیـەکی تـەکنیکی و سـتراتیژی گەورەوە بەوەی رازی نەبوون ئەو هێزە نیشتمانیە کاریگەرە راستەوخۆ ببێتە ئەندامی بەرە**"[١٨٦].

دیـارە دواتـر پـارتی وەکـو چارەیەکی مامناوەنـدی نوێنەرایـەتی خـۆی بـە حیزبـی شـیوعی عێراقـی سـپارد لـەدوای رێککـەوتنێکی دوو قـۆڵی[١٨٧]،

بەڵام دوایی ساردیەك كەوتە پەیوەندی نێوان ئەو دوو لایەنە، كاتێك لە هاوینی١٩٥٧ سەرانی لقی كوردستانی حیزبی شیوعی عێراقی (ساڵح حەیدەری، حەمید عوسمان) و (كەمال فوئاد)لەگەڵ هەندێ ئەندامانی دیكەی حیزبی شیوعی، هاتنە نێو پارتی[١٨٨].ئیدی دووبارە كارەكانی ئەندامانی لێژنەی مەركەزی دابەشكرایەوە، هەردوو كەسایەتی سیاسی هەولێر (ساڵح حەیدەری و حەمید عوسمان)[١٨٩] گەیشتنە پلەی مەكتەبی سیاسی[١٩٠].

ساڵح حەیدەری لە ساڵی ١٩٥٧ كرایە بەرپرسی رێكخستنەكانی پارتی لە هەولێر كەلەدوای گیرانی عەبدوڵا ئیسماعیل ئەو ئەركە بە حەسەن مستەفا سپێردرا، بەڵام نێوبراو بەهۆی گرفتێكی خێزانی و كۆمەڵایەتی، هەواڵی لێدەدرێت و ناوی راستەقینە و خوازراو و نهێنی ئەندامانی پارتی لە هەولێر لە ماڵەكەیدادەستی بەسەردا گیرا، كە دواتر توانی خۆی لەدەست هێزی حكومەت دەرباز بكات، بەهاتنی ئەو رۆشنبیرانەش رێكخستنەكانی پارتی لە هەولێر بووژانەوەی بەخۆوە بینی[١٩١].

دوا رووداو لەسەردەمی پاشایەتیدا، یەكێتی عەرەبی نێوان عێراق و ئوردن بوو، كە بە یەكێتی هاشمی دەناسرێ، كاتێك لە ١٤ی شوباتی ١٩٥٨ راگەیەنرا(١٩٢).بەپێی راپۆرتێكی باڵوێزی بەریتانیا لە عێراق كوردەكان بەرامبەر ئەو یەكێتییە نیگەرانن و لە خەمی ئەوەدان كورد دەكەوێتە كوێی ئەو یەكگرتنەوە(١٩٣). هەر بۆ ئەو مەبەستە سەركردایەتی پارتی لە كەركووك كۆدەبێتەوە، باسی یەكگرتنەكە و چارەنووسی گەلی كورد دەكەن، تێیدا هەردوو كەسایەتی ناسراوی

**هەولێر (ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی) و (زەید ئەحمەد عوسمان) بەشداری تێدا دەکەن(۱۹٤). بەم شێوەیە هەولێر لە سەردەمی پاشایەتیدا، بەشداری کارای لە بزاڤی رزگاریخوازی گەلی کورد کردووە، مۆرکی ئەو سەردەمە نەبوونی ئازادییە سیاسییە دیموکراتیەکان، هەڵمەتی راوەدونان و گرتن و رێکخستنی نهێنی و چاودێریکردنی جوولەی رۆشنبیر و سیاسییەکان، لەلایەکی دیکە لە دوا دەیەی ئەو سەردەمەدا بڵاوبوونەوەی وشیاری سیاسی و بەگوڕبوونی خەباتی حیزبە نیشتمانیەکان بوو، هەربۆیەش شۆڕشی ١٤ی تەمووزی گەلانی عێراق بەزادەی پاشخانێکی شۆڕشگێڕی گەلانی عێراق دەژمێردرێت و وەرچەرخانێکی دراماتیکی و خۆڕسك نەبوو بەڵکو لە هەناویدا کۆمەڵێك فاکتەر هەبوو.**

---

[١] سەبارەت بە پارت و رێکخراوە کوردیەکان لەو ماوەیەدا بڕوانە: عبدالستار طاهر شريف، الجمعيات و المنظمات و الأحزاب الكوردية في نصف قرن ۱۹۰۸ – ۱۹٥۸، ط۲، سليمانية، ۲۰۰۷.

[٢] لە بەرایی جەنگدا نووری سەعیدی سەرۆك وەزیرانی عێراق، لە وتارێکدا هەڵوێستی حکومەتەکەی راگەیاندو چارەنووسی عێراقی بە بەریتانیا بەستەوە، داوای لە عێراقیەکان کرد ریزەکانیان یەك بخەن. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی وتارەکە بڕوانە : عبدالرزاق الحسني، تاريخ الوزارات العراقية، ج٥، ص ص١٠٣- ١٠٥.

[٣] بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە بزاڤی رزگاریخوازی کورد لە سەردەمی جەنگدا بڕوانە: عزيز حسن بارزاني، الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان العراق ۱۹۳۹-۱۹٤٥، ط۱ ، دهوك، ۲۰۰۲ ، ص١٠٦ ومابعدها.

[٤] ئەو ناوە لاسایکردنەوەی کۆمەڵەی Carbonari (رەژووکەران)ی ئیتالی بوو، کە رێکخراوێکی نهێنی بوو لە چارەکی یەکەمی سەدەی نوزدەهەم لە ئیتالیا دەرکەوت، هەوڵی دەدا بۆ بەکارهێنانی

هێز دژی دەسەڵاتی نەمسا لەسەر ئیتاڵیا و دەسەڵاتی پاشا و حاکمە سەرکوتکەرەکانی ئیتاڵیا و گێڕانەوەی حوکمی دەستوری بۆ وڵات، بەخێرایی چالاکی رێکخراوەکە پەرەی سەند و لە نێو ریزەکانی پیاوانی سوپا و روناکبیران لە وڵاتەکە بڵاوبووەوە، بڕوانە: خليل علي مراد وآخرون، دراسات في التأريخ الاوروبي الحديث و للعاصر، موصل، ١٩٨٨، ص١٧٩.

[٥] بۆ زانیاری زیاتر لەمەڕ کۆمەڵەی دارکەر بڕوانە:صالح حيدري، مختارات من مذكرات صالح حيدري، ط١، السليمانية، ٢٠٠٤، ص٢١- ٢٨ ؛ اسماعيل شكر رسول، اربيل دراسة تاريخية في دورها الفكري و السياسي١٩٣٩-١٩٥٨، السليمانية، ٢٠٠٥، ص ص١٣٤- ١٣٧ ؛ فەیسەڵ دەباغ، حیزبی هیوا و شۆڕشی ١٩٤٣ – ١٩٤٥ ی بارزان، هەولێر، ١٩٩٧، ل١٢ ؛ فيصل دباغ، اضواء على كتاب: المنظمات و الجمعيات و الاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨- ١٩٥٨، ط١، اربيل، ١٩٩٧، ص ص٦٨- ٧٤.

[٦] تەنها دڵداری شاعیر خاوەنی مارشی نەتەوەیی کوردیی (ئەی رەقیب) خەڵکی کۆیەبوو، کە بەخاوەنی بیرۆکەی دامەزراندنەکە دادەنرێت. بۆ زانیاری زیاتر لە مەڕ نێوبراو بڕوانە: ئەحمەد دڵزار، پاشکۆی بیرەوەریەکانم، بەشی یەکەم، چ١، هەولێر، ١٩٩٨، ل٤٦.

[٧] صالح حيدري، م. س، ص٢١ ؛ عبدالستار طاهر شريف، م. س، ص١٤٣.

[٨] نوري شاويس، من مذكراتي، من منشورات حزب الشعب الديمقراطي الكردستاني ،ط١، ١٩٨٥، ص ص١٨-٢١ ؛ مكرم طالباني، حزب هيوا، السليمانية، ٢٠٠٢، ص٤٣ ؛ عبدالستار طاهر شريف، م. س، ص١٣٨.

[٩] دوو دامەزرێنەرەکە مستەفا عوزێری و موسا عەبدولسەمەد بوون.

[١٠] نوسەرو سیاسەتمەدار لە (١٨٩٨- ١٩٦٠) ژیاوە، بەشداری لە کۆمەڵە و رێکخراوە سیاسییە کوردیەکان کردووە، پێش ئەوەی بکرێتە سەرۆکی باڵای حیزبی هیوا، لە دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی سەربەخۆی کوردستان)ە لەساڵی ١٩٢٠ لە سلێمانی دامەزرا، ئەندامی باڵای کۆمەڵەی کوردستان بووە کە ١٩٢٢ دامەزرا، لە دامەزرێنەرانی (کۆمەڵەی زانستی) زانستی بووە لە ساڵی ١٩٢٦ لە سلێمانی، لەساڵی-

-١٩٣٩ سەرۆکی باڵای حیزبی هیوا بووە، لەدوای شۆڕشی ١٤ ی تەمووز لە ساڵی ١٩٥٩ لەگەڵ هەندێ کەسایەتی دیکە داوای دامەزراندنی پارتێکیان بەناوی کۆماری کرد، بایەخی بە مێژوو داوە و یاداشتەکانی بایەخێکی مێژوویان هەیە کە لە ٦ بەرگ بەچاپی گەیاندوون. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: شاخوان عبدالله صابر: رفيق حيلمي، دراسة تأريخية في نشاطه السياسي والثقافي، سليمانية، ٢٠٠٧،ص ص ٢٣ وما بعدها.

(١١) صالح حيدري، م. س، ص ص٢١، ٢٥.

(١٢) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الأحزاب السياسية العراقية ١٩١٨- ١٩٥٨، ط٢، بيروت- لبنان، ١٩٨٣، ص٣١٤.

(١٣) سروة أسعد صابر، كردستان الجنوبية ١٩٢٦- ١٩٣٩ دراسة تأريخية سياسية، ط١، سليمانية، ٢٠٠٦، ص٣٦٩.

(١٤) مكرم طالباني، حزب هيوا، السليمانية، ٢٠٠٢، ص٤٢.

(١٥) صالح حيدري، م. س، ص١٣؛ اسماعيل شكر رسول، م. س، ص١٣٧- ١٣٨.

(١٦) سەبارەت بەناوی ئەندامە دیارەکانی حیزبی هیوا لە لیوای هەولێر بڕوانە: تارق جامباز، حزبی هیوا لە لیوای هەولێر، چ١، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٣٥- ٣٩؛ اسماعيل شكر، م. س، ص١٣٨- ١٣٩.

(١٧) عەلی عەبدوڵا، کورتەی مێژوویی پارتی دیموکراتی کوردستان، مەکتەبی سیاسی- مەعهەدی کادیران، چاپی ڕۆنیۆ، ١٩٦١، ل١١- ١٢. (لە ئەرشیفی مومتاز حەیدەری پارێزراوە).

(١٨) بۆ زانیاری سەبارەت بە هەفتەنامەکە بڕوانە: تارق جامباز، هەفتەنامەی گۆڤار لاپەڕەیەکی شاراوەیە لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا، هەولێر، ل٢- ٢٠.

(١٩) لەساڵی ١٩١٧ لە بنەماڵەیەکی خواپێداو لە قەڵات لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە قوتابخانەی (ئەربیل ئولا) لە هەولێر تەواو کردووە، لەسەرەتای دامەزراندنی حیزبی هیوا لە ساڵی ١٩٣٩ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکان دەکات، هەمان ساڵ دەچێتە بەیروتیپایتەختی لوبنان و لە کۆلێژی ئەمریکی پلەی فرێشمان (پیاوی پێگەیشتوو) بەدەست دەهێنێ، لەوێ پەیوەندی لەگەڵ تێکۆشەرانی کورد دەبەستێ-

-پاشان دەچێتە ئەستەمبووڵ و لە (رۆبەرت کۆلێژ) دەخوێنێ و پەیوەندی بە هەواڵگری ئەڵمانیا لە رێگەی میوللەر دەبەستێ و لەساڵی ١٩٤٣کردەی مـاموت ئـەنجام دەدات و سـەرکەوتوو نابێـت، لـە ساڵی ١٩٤٧ کۆچی دوایی دەکات. بڕوانە: مەسعود محەمەد، رەمزی نافیع قوربانیە زلەکەی هەولێر، گۆڤاری کاروان، ژ/٣٣، حوزەیرانی ١٩٨٥، ل٥- ١١.

[٢٠] وشەی (Mammoth) لە ئینگلیزیدا بەواتای جۆرە فیلێکی لەناوچـوو، لـەزمانی کوردیـدا بەواتای (فیلەتەن) دێت وەکو لەناوەکەی دیارە کردەوەکە هێندە بچووك نەبووە. بڕوانە: محەمەد گۆران و نەریمان خۆشناو، رەمزی نافیع رۆڵەیەکی هەولێری فیداکاری سـەربەخۆیی کوردسـتان، چ١، هـەولێر، ٢٠٠٨، ل١١٩.

[٢١] بۆزانیاری دەربارەی کردەکە، بڕوانە: گۆتفرید و یوهانز میولەر، لە رۆژهەڵاتی گڕگرتوودا نێـردەی بەمەترسی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ١٩٤٣، و: بەدران ئەحمەد حەبیب، چ١، هەولێر، ١٩٩٢.

[٢٢] سـەبارەت بە بزوتنەوەی مایس بڕوانە: عبدالرزاق الحسـني، الاسرار الخفيـة في حركـة مـايس لـسنة ١٩٤١ التحررية، ط٥ ، بيروت، ١٩٨٢.

[٢٣] بۆزانیاری زیاتر بڕوانە: کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گـەلی کـورد، بـەرگی دووەم، ئامادەکردنی: عەبدوڵا زەنگەنە، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٦٥- ١٨٨؛ اسماعيل شكر رسـول، م. س، ص١٧٠- ١٨٧.

[٢٤] ئەبو بەکرەفەندی کچك مەلا ناسراو بە مەلافەندی (١٨٦٥- ١٩٤٢) ژیاوە، لە خێزانێکی ئاینی کۆن و ناودار پەروەردە کراوە، زانستەکانی ئاینی لەژێر دەستی باوکی خوێندووە، ٤٠٠ زانای لە ناوچـە جیا جیاکانی کوردسـتان و دەرەوە پێگەیاندووە، گەڕیدە و رۆژهەڵاتناسان بە بایەخەوە باسـیان کـردووە، ژمارەیەکی زۆر دانراوی دەسـتنووسی جیهێشتووە. بڕوانە: حميد المطبعي، موسـوعة الأعـلام العـراق في القرن العشرين، ج٢، ط١ ، بغداد، ١٩٩٥، ص١٤.

[٢٥] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: طارق ابراهيم شريف، شخصيات تتذكر، ج١، اربيل، ١٩٨٨، ص ص٤٢- ٥٤.

[٢٦] عەبدولڕەحمان مەلا سەعید ناوماری، بنەماڵـەی مـوفتی و مەلافەنـدی هـەولێر لـە مێـژوودا، گۆڤاری هەولێر، ژ ١٥، هارینی ٢٠٠٢، ل١٥٢.

[٢٧] عەلی عەبدولا، س. پ، ل٢٦.

[٢٨] عیزەددین فەیزی، ڕەمزی نافیع و بۆچونەکانی کاك مەسعود محەمەد کاك محەمەدی مەلا کەریم، گۆڤاری کاروان، ژ/ ٣٨، تشرینی دووەمی ١٩٨٥، ل٤- ٧.

[٢٩] سەبارەت بە ڕۆڵی هەولێر و هەولێریەکان لە شۆڕشی بارزان (١٩٤٣- ١٩٤٥) بڕوانە: اسماعیل شکر، م. س، ص ص١٧٠- ١٨٧.

[٣٠] مەسعود بارزانی، بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگارخوازی کورد ١٩٣١- ١٩٥٨، کتێبی دووەم، شۆڕشی بارزان، ١٩٤٣- ١٩٤٥، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٩٨، ل٩٩.

(٣١) عەلائەدین سەجادی، مێژووی ڕاپەڕینی کورد، سەقز، ١٩٩٦، ل١١٥؛ دیدارلەگەڵ نورەدین عەبدولرەزاق دەباغ، ڕێکەوتی ٢٧/١١/٢٠٠٧لە ساڵی ١٩٢٩لە هەولێر لەدایك بووە، لەژیان ماوە، ، کاتژمێر ٥ ئێوارە، لە دوکانی خۆی لە هەولێر.

[٣٢] سەبارەت بە زانیاری دەربارەی خاڵی ناکۆکی نێوان ئەو دوو بەرەیە بڕوانە: عزيز الحاج، القضية الكردية في العراق_ألتأريخ و الآفاق، د. ت، ص ص١٣٩- ١٤١؛ عەلی عەبدولا، س. پ، ل١٣- ١٤.

[٣٣] ماجد عبدالرضا، المسألة الكردية في العراق الى ١٩٦١، بغداد، ١٩٧٠، ص٧٥؛ نصير سعيد الكاظمي، مساهمة في كتابة تاريخ الحركة العمالية في العراق حتى عام١٩٥٨، ط١، دمشق،١٩٩١، ص٢٠٥.

[٣٤] یەکەم کەرتخوازانی حیزبی شیوعی عێراقی بوون، کە ئەندامێکی لێژنەی ناوەندی بەنێوی (ذو النون أيوب) رابەرایەتی کرد و جیابوونەوە و بڵاوکراوەیەکیان بەناوی (إلى الأمام) دەردەکرو بە (الأماميون) ناسران. داوای کۆنگرەشیان دەکرد بۆیە بە (المؤتمرون) کۆنگرەخوازانیش ناسران، بەڵام (فەهدی) سکرتێری حیزب داواکەی قبوڵ نەکردن نەوەك لەکاتی کۆنگرە بەستن ناشکرابن، لە ١٦/٨/ ١٩٤٢ دا لە لیژنەی ناوەندی دەریانکرد و بە پیلان گێڕ و خیانەتکار تۆمەتباریان کرد، بڕوانە: صلاح الخرسان، صفحات من تأريخ العراق السياسي الحديث ١٩٢٠- ١٩٩٠، ط١، لبنان، ٢٠٠١، ص٣٢.

[٣٥] عزيز سباهي، عقود من تأريخ الحزب الشيوعي العراقي، ج١، ط١، دمشق، ٢٠٠٢، ص٢٣٢.

[٣٦] صالح حيدري، م. س، ص٣١- ٣٣.

[٣٧] کۆمەڵەیەك بون بەسەرکردایەتی پارێزەر (عبدالله مسعود القرینی)، هەڵی سەفەرکردنی (فەهد)یان بۆ یەکێتی سۆڤیەت قۆستبۆوە، دەستیان بەسەر چاپخانە و ئامێرەکانی حیزبدا گرتبوو رۆژنامەی (الشرارة الجدیدة)یان دەردەکرد، لە ٢٠/١١/ ١٩٤٢ کۆنگرەیان بەستبوو، بەڵام لایەنگرانی فەهد بڕیاری کۆنگرەکەیان رەتکردبۆوە، لەبەرامبەر رۆژنامەی (الشرارة)شدا، بلاوکراوەی (القاعدة)یان لە کانوونی دووەمی ١٩٤٣ دەردەکرد، بەگەڕانەوەی فەهدیش لە نیسانی ١٩٤٣دا شەرعیەتیان زیاتر بوو، لەو ماوەیەدا بە (القاعدة)ش دەناسران، کاتێك لە ١٩٤٣ دا حکومەت توانی کۆمەڵێك لە جیاخوازەکان وەك (القریني) و کۆمەڵەی (الأمامیون) بگرێ توانی تا ئاستێکی باش بالادەست بێت، بڕوانە: صلاح الخرسان، م. س، ص٣٢- ٣٤.

[٣٨] عزیز سباهي، م. س، ص٢٣٢.

[٣٩] لقێکی جیابووەوە بوون، بەنێوی ئۆرگانەکەیان ناسران کە (وحدة النضال) بوو، لە پاشماوەی (الأمامیون) پێشەواکان، (الشرارة الجدیدة) بلێسەی نوێ پێکهاتبوون لە سەرەتاکانی ١٩٤٤ دا بە رابەرایەتی (هارون زەلخا) دامەزرا، دوایی لەگەڵ فەهد دانوستانیان کرد لە ٣٠/٤/ ١٩٤٥ خۆیان هەڵوەشاندەوە و زۆربەیان چوونە پاڵ حزبی دایك کە بەشی (القاعدة) بوو، بۆ زانیاری بڕوانە: صلاح الخرسان، م. س، ص٣٥.

[٤٠] بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە: صالح حیدري، م. س، ص٣٣.

[٤١] عزیز سباهي ، م. س، ص٢٣٣.

[٤٢] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: صلاح الخرسان، م. س، ص٣٩- ٤٦ ؛حنا بطاطو، م. س، ص٤٠٥- ٤٠٦.

[٤٣] ئەحمەد دلزار، پاشکۆی بیرەوەرییەکانم، بەشی دووەم، هەولێر، ٢٠٠١، ل١١.

[٤٤] جلال طالباني، کردستان و الحرکة القومیة الکردیة، ط١، بیروت، ١٩٦٩، ص١٤٢.

[٤٥] عەلی عەبدوڵا، س. پ، ل١٤.

[٤٦] صالح حیدري، م. س، ص٤٣ ؛ عبدالستار طاهر شریف، م. س، ص١٥٩ ؛ جعفر عباس حمیدي، م. س، ص٢١٩.

[٤٧] عبدالرزاق الحسني، م. س، ص٣١٧ ؛عبدالستار طاهر شریف، م. س، ص١٥٩.

[٤٨] حامد محمود عیسى، المشکلة الکردیة في الشرق الأوسط ، القاهرة، ١٩٩٢، ص٣٣٣.

(٤٩) صامد الكردستاني، كفاح الاكراد، (د. م)، (د. ت)، ص٣٦.

(٥٠) بۆزانیار زیاتر بگەڕێوە: عەلی عەبدلا، س. پ، ١٥١- ١٦ ؛ عزيز الحاج، م. س، ص١٤٤.

(٥١) اسماعيل شكر رسول، م. س، ص١٥٧.

(٥٢) عبدالرزاق الحسني، م. س، ص٣١٧.

(٥٣) فريد اسرد، اتجاهات السياسية الكردية بعد الحرب العالمية الثانية، السليمانية، ٢٠٠٨، ص٢٩.

(٥٤) جعفر عباس حميدي، م. س، ص٢١٩.

(٥٥) عەلی عەبدولا، س. پ، ص١٥، ١٨ ؛ عزيز الحاج، م. س، ص١٤٦.

(٥٦) جعفر عباس حميدي، م. س، ص٢٢٣.

(٥٧) عەلی عەبدولا. س. پ، ل١٨ ؛ صالح حيدري، م. س، ص٨٠.

(٥٨) دەربارەی بەیاننامەکە بڕوانە: محمد شيزاد، نضال الأكراد، القاهرة، ١٩٤٩، من (كتابات في المسألة الكردية، ج١، اعداد و تقديم: رفيق صالح، سليمانية، ٢٠٠٨، ص ص١٠- ١١٠.

(٥٩) م. ن، ص١١٠- ١١٢.

(٦٠) لەسەر ئاستی دەرەکی بیرخەرەوەیەکی (مذكرة) ڕەوانەی وەزارەتی دەرەوەی زلهێزەکان لە مۆسکۆ کرد بۆ پشتگیری لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و باکوری کوردستان و فەرامۆشکردنی داوا و مافەکانی لەلایەن حکومەتی عێراقەوە، بیرخەرەوەیەکی تایبەتیشی گەیاندە لێپرسراوانی میسر. سەبارەت بە دەقی بیرخەرەوەکان بڕوانە: عەلی عەبدولا، س. پ، ل٢٢- ٢٤.

(٦١) جعفر عباس حميدى، م. س، ص٢٢٤.

(٦٢) د. ك. و، وزاره الدفاع، رئاسة أركان الجيش، العنوان: حزب التحرر الكردى، رقم الملف: ٧٢٧/ ٣٢٠٦٠١. بۆ زانیاری زیاتر لەمەڕ ئەندامانی حیزبی ڕزگاری بڕوانە: اسماعيل شكر رسول، م. س، ص٢١٨- ٢١٩ ؛ شوان محەمەد ئەمین خۆشناو، لیوای هەولێر لە دۆکیۆمێنتی ساڵی ١٩٤٦دا، هەفتەنامەی بەدرخان، ژ/ ١١١، ٨/ ٢/ ٢٠٠٩، ل٧.

(٦٣) عەلی عەبدولا، س، پ، ل٢٠- ٢١.

(٦٤) شوان محەمەد ئەمین خۆشناو، لیوای هەولێر لە دۆکیۆمێنتی ساڵی ١٩٤٦ لەخۆی دەدوێ، گۆڤاری مێژوو، ژ/ ٨، پایزی ٢٠٠٨، ل٣٢٤- ٣٢٥.

(٦٥) عەلی عەبدوڵا، س. پ، ل٢١.

(٦٦) کەمال مەزهەر، کورد لە بەڵگەنامەکانی حکومەتی بەریتانیادا، ب/١، ئامادەکردنی عەبدوڵا زەنگەنە و شەهلا تاهیر حەیدەری، چاپخانەی گرین گالۆری، لوبنان، ٢٠٠٨، ل٢٠٦؛ دیدار لەگەل نەژادعەبدولا عەزیز.

(٦٧) سەبارەت بە رۆڵی ئەفسەرانی هیوا لە شۆڕشی بارزان، بڕوانە: محەمەد عەبدولا کاکە سوور، رۆڵی سیاسی و کلتوری ئەفسەرانی کورد لە بزاڤی کوردایەتی لە کوردستانی باشووردا (١٩٢١- ١٩٤٥)، ١، هەولێر، ٢٠٠٠، ل١٠٤- ١١٠.

(٦٨) بۆ زانیاری زیاتر لەمەڕ ئەو کۆمارە، بڕوانە: ولیم ایغلتن الابن، جمهوریة مهاباد جمهوریة ١٩٤٦ الکردیة، ت/ جرجیس فتح الله، ط٢، اربیل، ١٩٩٩.

(٦٩) ئەفسەرانی دەستەی دامەزرێنەر بە بەشداری هەمزە عەبدولا پێك هاتبوون لە : "میرحاج ئەحمەد، عیزەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو، محەمەد مەحمود قودسی، نووری ئەحمەد تەها، لەگەڵ رۆڵەی هەولێر خەیرولا عەبدولکەریم". بڕوانە: مەسعود بارزانی، س. پ، ل١٥٨.

(٧٠) ئەوکاتە هەر وشەی (حزب) ی زمانی عەرەبی باوبوو، بەکاردەهات، کاتێك وشەی لاتینی (پارتی) بەکارهات لەبەر نامۆیی وشەکە لەنێوەندەکانی عێراق و کۆمەڵگەی کوردیدا، بە پارتی ناسرا کە تائێستاش لای خەڵك بەکاردێت و بەم ناوە دەناسرێ.

(٧١) رۆژنامەی خەبات، ژ/ ٣٨٩، ١٦ی ئابی ١٩٦٠؛ جعفر عباس حمیدي، م. س، ص٢٢٦.

(٧٢) جلال الطالباني، کردستان و الحرکة القومیة الکردیة، ط١، بیروت، ١٩٦٩، ص١٤٦.

(٧٣) هەمزە عەبدولا لە شارۆچکەیەکی تورکیا لە ساڵی ١٩١٢ لە دایکبووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لە مووسڵ خوێندووە، لە ساڵی ١٩٣٤ لە بەغدا لە کۆلێژی ماف دەرچووە، لە ساڵی ١٩٣٨ بەهۆی چالاکیە سیاسییەکانیەوە رەگەزنامەی عێراقی لێ سەندراوەتەوە، رۆڵی سەرەکی بینی لە دامەزراندنی پارتی داد و تا ساڵی ١٩٥٣ سکرتێری پارتی بووە، کۆنگرەی چوارەم کە لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ بەسترا بەیەکجاری بەتۆمەتی کۆمۆنیستی لە پارتی دەرکرا و لە بەغداد نیشتەجێ بوو، تا ساڵی ١٩٩٨ لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد. بڕوانە: عبدالفتاح علي یحیی البوتاني، الحیاة الحزبیة في الموصل ١٩٢٦- ١٩٥٨، أربیل، ٢٠٠٣، ص ٣٨١.

(٧٤) بۆزانیاری زیاتر دەربارەی پەیوەندییەکان بڕوانە: عەلی عەبدوڵا، س. پ، ل ل ١٦-١٧، ٣١-٣٥.

(٧٥) ڕاسپاردەکە بریتی بوو لە: دانانی شێخ لەتیف شێخ مەحمود بە جێگری یەکەم و کاکەزیاد بەجێگری دووەم بەهۆی پێگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو دوو کەسایەتیە لەناوچەکە، بەڵام لەلایەن هەندێ لە چەپڕەوەکان نارەزایی لێکەوتەوە.

(٧٦) بڕوانە: حبيب محمد كريم، تأريخ الحزب الديمقراطي الكردستاني – العراق (في محطات رئيسية)، ١٩٤٦- ١٩٩٣، ط١، مطبعة خبات، دهۆك، ١٩٩٨، ص٣٣- ٣٤.

(٧٧) عەلی عەبدوڵا، س. پ، ل٣٢- ٣٤؛ صالح حيدري، م. س، ص٤٦- ٤٨.

(٧٨) بڕوانە: جلال الطالباني، م. س، ص١٤٨.

(٧٩) جێگای ئاماژەیە نێوبراو ئامادەنەبوو بەبێ ڕێبەری حیزبەکەی (قازی محەمەد) لقەکەی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە، تا لەناوچوونی کۆمار ئینجا هاتە ڕیزی پارتی، بۆیە داوای لێکرا کۆنگرە بەجێبهێڵێ، بڕوانە: عەلی عەبدوڵا، س. پ، ل٣٦.

(٨٠) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: شيركو فتح الله عمر، الحزب الديمقراطي الكردستاني وحركة التحرر القومي الكردية في العراق ١٩٤٦- ١٩٧٥، ط١، سليمانية، ٢٠٠٤، ص ص١١٠- ١١٣.

(٨١) بۆ زانیاری دەربارەی ڕۆژنامەکانی پارتی بڕوانە: وریا جاف، مێژووی ڕۆژنامەگەری پارتی دیموکراتی کوردستان (١٩٤٦- ١٩٩٦)، پێداچوونەوە و پێشەکی: زاهیر ڕۆژبەیانی، چ/١، دهۆک، ١٩٩٦.

(٨٢) بۆزانیاری زیاتر بڕوانە: حبيب محمد كريم، م. س، ص٣٥.

(٨٣) مەهدی محەمەد قادر، پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق ١٩٤٥- ١٩٥٨، چ/١، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٢٥.

(٨٤) ماجد عبدالرضا، م. س، ص٧٥.

(٨٥) مەسعود بارزانی، س. پ، ل١٦٠.

(٨٦) بۆ زانیاری سەبارەت بە پەیوەندی ئەو دوو حیزبە بڕوانە: عبدالفتاح علي بوتاني، موقف الاحزاب السياسية من القضية الكردية ١٩٤٦- ١٩٧٠، ط١، مطبعة خاني، دهوك، ٢٠٠٧، ص ص٤٩- ٦٠.

(٨٧) دیڤید ماکدوال، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبوبەکر خۆشناو، چ/٢، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٤٨٦.

(٨٨) دیدار لەگەڵ هەر یەك لە (مومتاز حەیدەری، نەژاد عەبدوڵا عەزیز، بەشیر حوسێن سەعدی).

(٨٩) بەهادین نوری، بیرەوەریەکانی بەهادین نوری، و: سەردار سالح، چ ١، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٣٠٦.

(٩٠) بۆ زانیاری سەبارەت بە جەژنی نەورۆز لەشاری هەولێر بڕوانە: ئیسماعیل شوکر رەسول، نەورۆزی هەولێر ١٩٣٢- ١٩٥٨ چەند لاپەڕەیەکی شاراوەی مێژووی گەلی کورد، چ١، هەولێر، ٢٠٠٧.

(٩١) بۆزانیاری دەربارەی وەرگرتنی مۆڵەتەکە، بڕوانە: طارق ابراهيم شريف، م. س، ص٧١- ٧٢.

(٩٢) محسن دزەيي، احداث عاصرتها، ج١، حاورە: طارق ابراهيم شريف، ط١، دار آراس، اربيل، ٢٠٠١، ص٥٧- ٦٠.

(٩٣) مەولود قادر بێخاڵی، هەولێرم وادیوە و- بیستووە، ب ٢، هەولێر، ١٩٩٧، ل٢٤٣.

(٩٤) کۆمەڵەی برایانی موسوڵمان لەشاری ئیسماعیلیەی میسر لەسەر دەستی حەسەن بەننا لە ساڵی ١٩٢٧ دامەزرا، لەساڵی ١٩٤٢ چالاکیان گەیشتە شاری مووسڵ، لەساڵی ١٩٤٩ لەژێرناوی (کۆمەڵەی برایەتی ئیسلامی) تا ساڵی ١٩٥٤ بەئاشکرا کاریان دەکرد، لێپرسراوی مووسڵ (مەلا عەبدوڵا محەمەد ئەربیلی) بوو کە هەولێری بوو، هەڵوێستیان بەهیچ شێوەیەك دەربارەی مافی نەتەوایەتی کورد نەبووە. بڕوانە: عبدالفتاح علي بوتاني، موقف الاحزاب...، ص ص٦- ١٦.

(٩٥) دیدارلەگەڵ (بەشیر حوسێن سەعدی کوردستانی)؛ مەهدی محەمەد قادر، س. پ، ل٢١٨- ٢١٩.

(٩٦) فازیل پیرداود، ئیخوان موسلمینی هەولێر لە ساڵی ١٩٤٨ هەموویان موعتەمەد و پیاوی حکومەت بوون، مانگنامەی بەدرخان، ژ/٨٩، ٢٢/١/ ٢٠٠٨، ل١٧.

(٩٧) فەتاح تۆفیق فەتاح، حەفتا و شەش ساڵ ژیان و پەنجا و نۆ ساڵ خەبات، چ١، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١١.

(٩٨) یەکێك لە دروشمەکان دەگووترا: نانی وانە تەئمین بکرێ بارزانیەکان عەفوو بکرێ

یاخود: نانی میللەت تەئمین بکرێ سالح جەبر ئیعدام بکرێ.

(٩٩) بەکر شاکر کاروانی، عەلی فەتاح دزەیی شاعیر و نووسەر و تێکۆشەر، چ١، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٣٩.

(١٠٠) بۆ زانیاری سەبارەت بەو کابینەیە و وەزیرەکانی بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات ....، ج/٧، ص١٦٠- ٢١٠.

(١٠١) ئەم پەیمانە لە ١٥/٨/ ١٩٤٨ لەنێوان (ساڵح جەبری) سەرۆك وەزیرانی عێراقی ئەوسا و(ئارنست بیگن)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا لە بەندەری پۆرتسمۆس لە کەناری دەریای مانش، مۆرکرا، بۆیە بەو ناوەوە ناسراو بەناوی (جەبر- بیگن)یش دەناسرێ. بۆزانیاری دەربارەی بەندو برگەکان، بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، م. ن، ص ص٢٣٤- ٢٤٧.

(١٠٢) کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك ...، ب ١، ل١٣؛ خميس حزام والي، وثبة كانون الوطنية في العراق، (رسالة ماجستير، كلية القانون والسياسة)، بغداد، ١٩٧٩، ص٨٨.

(١٠٣) سەبارەت بە بەشدای کورد لەو ڕاپەڕینە، بڕوانە: کەمال مەزهەر ئەحمەد، س. پ، ل١٢٣-١٥٠؛ اسماعيل شكر رسول ،اربيل...، ص ص ٢٨٩-٢٩٦ ؛ مەهدی محەمەد قادر، ڕۆڵی کورد لە ڕاپەڕینی کانوونی ١٩٤٨ لە عێراقدا، گۆڤاری مێژوو، ژ١، زستانی ٢٠٠٧، ل١٣١- ١٥٠.

(١٠٤) بۆزانیاری زیاتر بڕوانە: الشرطة العامة، شعبة مديرية التحقيقات الجنائية، موسوعة سرية خاصة بالحزب الشيوعي العراقي السري، بغداد،١٩٤٩ ، ج١، ص ص٢٢، ٥١ ؛ ج٣، ص ص٥١٤، ٥٨٤، ٦١٧.

(١٠٥) کاکە مەم بۆتانی، کاکی کاکان مرۆڤ و ڕوناکبیر و شۆڕشگێڕ، ب/١، هەولێر، ١٩٩٨، ل٦٦.

(١٠٦) محسن محمد المتولي، كرد العراق منذ الحرب العالمية الاولى ١٩١٤ حتى سقوط الملكية في العراق ١٩٥٨، ط١، الدار العربية للموسوعات، لبنان، ٢٠٠١، ص٢٩٦.

(١٠٧) بۆزانیاری سەبارەت بە خۆپیشاندانەکانی هەولێر، بڕوانە: اسماعيل شكر رسول، اربيل ...، ص ص٢٨٩- ٢٩٦.

(١٠٨) نوري شاويس، م. س، ص٥١ ؛ جلال طالباني، م. س، ص١٦٤.

(١٠٩) جعفر عباس حميدی، م. س، ص٢٣٦.

(١١٠) نوێنەرانی کوردی دیکەش: بابا عەلی شێخ مەحمود و ئەنوەر جەمیل نوێنەری سلێمانی بوون، موسلح نەقشبەندی نوێنەری موسڵ بوون.

(١١١) جلال طالباني، م. س، ص١٦٥ ؛ كمال مظهر أحمد، صفحات من تأريخ العراق المعاصر، ط ، بغداد، ١٩٨٧، ص١٣٨ ؛ محسن محمد المتولي، م. س، ص٢٩٦.

(١١٢) دەربارەی پێکهێنانی کابینەی حکومەتی محەمەد سەدر، بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات ....ج/٧، ص٢٨٢.

(١١٣) دەربارەی ڕێوڕەسمەکە بەدرێژی بڕوانە: پۆستەی کوردەواری، گۆڤاری گەلاوێژ، ژ/٣، ساڵی نۆیەم، مارتی ١٩٤٨، ل ل١٣- ٢٣.

(١١٤) بۆزانیاری دەربارەی هەڵوێستی هەولێرییەکان بەرامبەر بە کێشەی فەلەستین لەو ماوەیەدا، بڕوانە: اسماعيل شكر رسول، م. س، ص ص٣٠٥- ٣٠٧.

(١١٥) عەلی عەبدوڵا، س. پ. ل٤٦. ؛ كريم أحمد، المسيرة- صفحات من مذكرات كريم أحمد، ط١، مطبعة شهاب، اربيل، ٢٠٠٦، ص ٧٣.

(١١٦) بۆزانیاری زیاتر بە دادگایکردنەکە و ماوەی حوکمی گیرانەکە، بڕوانە: صالح حيدري، م. س، ص٢١٢-٢١٣.

(١١٧) نووری سەعید کابینەی دەیەمی خۆی (چل و سێیەمین کابینەی وەزارەتی عێراق لەسەردەمی پاشایەتی) لە (٦ی کانوونی دووەمی ١٩٤٩) پێکهێنا تا (١٠ی کانوون یەکەم درێژەی کێشا) بۆ زانیاری دەربارەی ئەو کابینەیە، بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات...، ج٨، ص٥٩- ١٣٠.

(١١٨) موسوعة سرية خاصة بالحزب الشيوعي العراقي السري، م. س.ج٤، ص ص٨٢٦- ٨٢٩، ٩١٣- ٩١٧.

(١١٩) حزبی ئیتحادی دەستووری لەلایەن نووری سەعید دامەزرا، لە ٢٤/١١/ ١٩٤٩ مۆڵەتی وەرگرت، گەلاڵەنامەیەکی (میثاق) بەناوی گەلاڵەنامەی دەستوری پێشکەش کرد کەچەندین برگەی لە خۆگرتبوو، دژی بزوتنەوەی نیشتمانی کاریدەکرد تا ساڵی ١٩٥٤ بەردەوام بوو، حیزبی ئومەی ئیشتراکی لەلایەن ساڵح جەبرەوە دامەزرا لە ٢٠/٦/١٩٥١ مۆڵەتی وەرگرت، وەکو حزبی پێشوو سیمایەکی تایبەتی هەبوو کە دەرەبەگ و سەرۆک هۆزەکان تێیدا ئەندام بوون، ئەویش بە بەیانی ڕەسمی نووری سەعید لە ساڵی ١٩٥٤ هەڵوەشایەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الاحزاب السياسية ....، ص ص٢٢٧- ٢٣٩.

(١٢٠) دیدار لەگەڵ هەریەك (. مومتاز حەیدەری، بەشیر حوسێن سەعدی) و (مەدحەت بێخەو) لە ڕێکەوتی ١/١/٢٠٠٨ لە هەولێر، ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٤ لە هەولێر لەدایك بووە خوێندنی

سەرەتایی و ناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە لە سەردەمی پاشایەتیدا بە هۆی هەڵوێستی سیاسی چەندین جار زیندانی کراوە خاوەنی کۆمەڵێك بەرهەم و نووسینی ئەدەبییە لەوانە هەڵبەستی بەناوبانگی شۆڕشی ئەیلول(ئێمە پێشمەرگەین) ، لەدوای راپەڕینی ١٩٩١ چەندین پۆستی حکومی پێ سپێردراوە لە وانە راوێژکاری ئەنجوومەنی وەزیران و وەزراەتی رۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٣ خانەنشین کراوە و ئێستا لەهەولێر دەژی .

[121] بڕوانە: حنا بطاطو، العراق، الكتاب الأول، م. س، ص٣٨٨- ٣٩٠.

[122] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: سەید برزۆ ئەلنەقیب ئەلڕفاعی، خانەوادەی هەولێر، گۆڤار هەولێر، ژ/١٧، ٢٠٠٦، ل ل١١٧- ١٣٨.

[123] لە ٦/٦/ ١٩٤٩ دوای تەواوبوونی هێڵی(سکە) شەمەندەفەر، بۆیەکەجار شەمەندەفەر شوتەی لێدرا و بەرەو کەرکووك کەوتە رێگابڕین، بڕوانە: باکوری، تەمەنێك، ب/١، چ١، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦، ل١٨١.

[124] م. و. د، ملف الأحزاب، رقم الملف، ١٧/د/ ٣، اضبارة حزب الأمة الاشتراكي، رقم اضبارة٤١/ ١٦٦، متصرفية لواء اربيل، العدد، ١٠٨٠، مايس ١٩٥٢، الموضوع: استياء بلدة اربيل، من تصرفات الشيخ محي الدين الشيخ صالح البرزنجي.

[125] محسن دزەيي، م. س، ص٥٩.

[126] کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك ...، ب/٢، ل٤٠٤.

[127] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: هـ. س، ل ل٤٠٥-٤٠٦.

[128] حنا بطاطو، العراق- الحزب الشيوعي، الكتاب الثاني، ص٣٢١- ٣٢٧.

[129] مەبەستمان لە لەسێدارەدانی سەرانی حیزب (فەهد، حازم و سارم) ە، دوای رووخانی هەندێ رێبەرانیان لە بەندیخانەدا، حیزبەکە توشی نسکۆ هات. بۆزانیاری بڕوانە: عزیز سباهي، م. س، ص ص ٤٠٣- ٤٢٠.

[130] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: حنا بطاطو، م. ن، ص ص٣٢٢- ٣٢٥، ٣٣٦- ٣٤٣.

[131] بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە کەرتبون و بەندبازی لەو ماوەیەدا، بڕوانە: صالح حیدري، م. س، ٢٤٧- ٢٨٤ ؛ بەهائەدین نووری، س. پ، ل ل٢٠٤- ٢١٠ ؛ جعفر عباس حمیدي، التطورات و الاتجاهات السیاسیة الداخلیة في العراق ١٩٥٣- ١٩٥٨، بغداد، ١٩٨٠، ص ص١٩٤- ١٩٩.

[132] ئەو بزاڤە لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی هاتەکایەوە، بەمەبەستی بەرقەراربوونی ئاشتی لەجیهاندا بەرگرتن لە دووبارە بوونەوەی جەنگی کاولکاری. یەکەم کۆنگرەی لە پراگی پایتەختی چیکۆسلۆڤاکیا بەست، دووەم کۆنگرەی لە پاریس بەست، نوێنەرانی عێراقیش تێیدا بەشداربوون، لەتەمووزی ساڵی ١٩٥٠ لەشاری بەغدا لیژنەی ئامادەکاری بەسەرۆکایەتی (محمد مهدی جواهیری) پێکهات و زۆر لە کەسایەتی دیموکراتخواز ونیشتمانپەروەر تێیدا بەشداربوو. بۆ زانیاری زیارت بڕوانە: توفیق منیر، حقیقة حرکة السلام، ط١، دارالفکر، قاهرة، ١٩٥٦.

[133] بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە رۆڵی کورد لەو بزووتنەوەیەدا بڕوانە: مەهدی محەمەد قادر، رۆڵی کورد لە بزوتنەوەی ئاشتیخوازان لە عێراقدا ١٩٥٠- ١٩٥٨، گۆڤاری زانکۆ، ژ/٣١، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ل٥- ٣٧.

[134] مستەفا عومەری چل و حەوتەمین کابینەی حکومەتی پێکهێنا لە (١٢ی تەمووزی ١٩٥٢- ٢٣ی تشرینی دووەمی ١٩٥٢) لەکارخرا. بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، م. س، ص ص٢٨٠- ٣٢٩.

[135] بۆ زانیاری زیاتر بە خۆپیشاندانەکە و رۆڵی کورد، بڕوانە: غانم محمد الحفو و عبدالفتاح علي البوتاني، الأحداث و الوطنیة في العراق خلال العهد الملکي ١٩٢١- ١٩٥٨، ط١، دار سپیریز، دهوك، ٢٠٠٥، ص٩٢.

[136] اسماعیل شکر، اربیل...، ص٣١٠- ٣١١.

[137] ئەو ناوچەیە دەشتی (قەراج، کەندێناوە، ملکیە و شەمامك) دەگرێتەوە و کە بەشێکە لە دەشتی هەولێر ،لەلایەن ئاغاکانی دزەیی دەشتی دزەییایەتی پێگوتراوە. بڕوانە: عەباس سلێمان سمایل، س. پ، ل١٥٩.

[138] سعاد خیري، م. س، ص٢٠٦- ٢٠٧ ؛ جعفر عباس حمیدي، م. س، ص٤٠ ؛ فاتح رەسول، لە کاروانێکی دوورو درێژدا "کورتەی خەبات و ئەزموونی پەنجا ساڵ"، چ/١، ستۆکهۆلم، ١٩٩٧، ل٩٥.

(١٣٩) لەدوای کۆنگرەی سێیەمی حیزب لە ٢٦/١/ ١٩٥٣ کە بەشێوەیەکی زۆر نهێنی لە کەرکووك بەسترا، بڕیاری گۆڕینی ناوی حیزب درا لە پارتی دیموکراتی کورد بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان، لەپاڵ چەند بڕیارێکی دیکەی گرنگ وەك پێکهێنانی ڕێکخراوە جەماوەرییەکان و هەموارکردنی پەیڕەو و پرۆگرامی حیزب بەئاراستەی مارکسی- لینینی و گۆڕینی ناوی ڕۆژنامەی (ڕزگاری) زمانحاڵی حیزب بۆ (خەبات). بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: شیرکو فتح الله عمر، م. س، ص١١٦- ١١٧ ؛ حبیب محمد کریم، م. س، ص٤٩- ٥٢.

(١٤٠) جعفر عباس حمیدي، م. س، ص٢٢٩ ؛ غانم محمد الحفو و عبدالفتاح علي البوتاني، م. س، ص٩٣.

(١٤١) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مەهدی محەمەد قادر، س. پ، ل٢٤٣.

(١٤٢) حەسەن مستەفا، دەستنووسێك لەبارەی بیرەوەرییەکانی، لەلایەن نوسەر خۆیەوە پارێزراوە، ل٨.

(١٤٣) مەسعود محەمەد، گەشتی ژیانم، چ/١، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٢، ل٣٠٢ ؛ محسن دزەیي، م. س، ص٩٧.

(١٤٤) زکي خیري، تقریر عن مسائل الاصلاح الزراعي، بغداد، ١٩٦٠، ص٤٧.

(١٤٥) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هۆکارەکان بڕوانە: سالار سیامەند عەبدوڵا، ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر١٩٥٣ز،کەرکوك ، ٢٠٠٦، ل ل٢٩-٣٤.

(١٤٦) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالفتاح علي یحیی البوتاني، اضاءة جدیدة علی حرکة فلاحي سهل أربیل في ٢٢ نیسان ١٩٥٣، مجلة گولان العربي، عدد/: ٢٠٤، السنة الخامسة، ٣٠ تشرین الثاني، ٢٠٠٠، ص١٩.

(١٤٧) ئەوسا زاراوەی قوە سیارە و (الشرطة السیارة) بەکاردەهات.

(١٤٨) سەبارەت بە دەرکردنی ئەو خێزانانەی دەرکران و گوندیان جێهێشت بڕوانە: حیزبی شیوعی کوردستان، ڕاپەڕینی جووتیارانی دەشتی هەولێری ١٩٥٣ وەکو خۆی، کۆکردنەوەی: حەسەن تەها، سەلیم شێخ محەمەد، بابا عەلی جەباری...، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٢١- ٨٢.

(١٤٩) حیزبی شیوعی کوردستان، هـ. س، ل١٩- ٢٠.

(١٥٠) بەکر شاکر کاروانی، س. پ، ل٥٤.

(١٥١) المملکة العراقیة، محاضر مجلس النواب، الدورة الانتخابیة الثالثة عشرة، بغداد، ١٩٥٣، ص٤٧٧.

(١٥٢) بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی هەڵوێستەکانی مەسعود محەمەد بڕوانە: راهي مزهر العامري، مسعود محمد ودوره السياسي في العراق١٩١٩-١٩٦٨، بغداد، ٢٠٠٨، ص ص٨٦-١١١؛ مەسعود محەمەد، س. پ، ل٢٩٥- ٣١١.

(١٥٣) بۆ زانیاری زیاتر بەم کابینەیە بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، م. س، ج٩، ص١٠٩- ١١٢.

(١٥٤) ئەو پارتانە بریتی بوون لە: (پارتی نیشتمانی دیموکراتی، پارتی ئازادیخوازان، بێ لایەنەکان، لایەنگرانی ئاشتی).

(١٥٥) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: غانم محمد الحفو، عبدالفتاح علي البوتاني، م. س، ص٩٥- ٩٦.

(١٥٦) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مەهدی محەمەد قادر، س. پ، ل٢٩٥- ٣٠١.

(١٥٧) نێوبراو بە (مەلا ماتۆڕ) ناسراوبوو، چونکە بەهۆی ماتۆڕسکیلەکەی کاروباری رێکخستنەکانی پارتی لە هەولێر و دەروبەری دەکرد.

(١٥٨) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مەلا عەولای حاجی سمایل، سەربردەی ژیانی سیاسیم، ب/١، بەغدا، ١٩٩٠، ل١٣٥- ١٤٥.

(١٥٩) اسماعيل شكر رسول، اربيل...، ص٣٣١- ٣٣٢.

(١٦٠) عبدالرزاق الحسني، م. س، ج٩، ص١٢٢.

(١٦١) ئەو کاتە ئەو دوو حزبە لە بەرەی نیشتمانیدا بوون کە ئاشکرابوون، حیزبی شیوعی لەرێگەی رێکخراوە پیشەییەکان و بزوتنەوەی ئاشتی خوازان، بەشداری کردبوو پارتیش بەشێوەیەکی نا ئاشکرا نوێنەری گەیاندە ئەنجومەن. بڕوانە: صالح حیدری، م. س، ص٢٦٨.

(١٦٢) جلال طالباني، م. س، ص١٦٦.

(١٦٣) صالح حيدري، م. س، ص٢٦٨؛ عبدالجبار عبدالمصطفى، تجربة العمل الجبهوي في العراق ١٩٢١-١٩٥٨، بغداد، ١٩٨٧، ص٢٣٧.

(١٦٤) بۆ زانیاری زیاتر سەبارەت بە مەرسومەکان بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، م. س، ج/٩، ص ص١٤٧- ١٥٥، ٢١٠- ٢١١.

(١٦٤) بۆ زانیاری زیاتر بە هاوپەیمانێتی یەکانی عێراق لەو ماوەیەدا بڕوانە: غانم محمد الحفو، صفحات من تأريخ التكتلات الاقليمية في الشرق الأوسط- العراق نموذجاً ١٩٤٦- ١٩٥٩، ط١، دار ابن الاثير للطباعة، موصل، ٢٠٠٥.

(١٦٦) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: غانم محمد الحفو، م. ن، ص ص٥٠، ٥٢.

(١٦٧) دیدار لەگەڵ مومتاز حەیدەری؛ مذكرات عزالدين مـلا أفنـدي، مكتوبة بخط اليـد، الـدفتر الثاني، ص١٢٣.

(١٦٨) محمد حسنين هيكل، ملفات السويس (حرب ثلاثـين سـنة)، ط٢، مطبعـة الأهـرام، القـاهرة، ١٩٩٦، ص٤٦٧؛ عبدالحميـد عبـدالجليل أحمـد شـلبي، العلاقـات الـسياسية بـين مـصر و العـراق (١٩٥١- ١٩٦٣)، مطبعة الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ٢٠٠٠، ص٢٩١.

(١٦٩) عبدالرزاق الحسني، م. س، ج/١٠، ص٩٧.

(١٧٠) جعفر عباس حميدي، انتفاضة العراق ١٩٥٦، الدورة الوثائقية، بغداد، ٢٠٠٠، ص٧٤.

(١٧١) دیدار لەگەڵ (زنوەر خەتاب) لە هەولێر لە ١٧/١١/ ٢٠٠٧، کاتژمێر ١٠ی بەیانی. لەساڵی ١٩٢٩ لەشاری هەولێر لەدایك بووە، لەساڵی ١٩٥٥ کۆلێژی مافی لە بەغدا تەواو کردووە، لەساڵی ١٩٨٠ خانەنشین کراوە، خاوەنی دوو کتێبی بەچاپ گەیەنراوە؛ مەلا عەولای حاجی سمایل، س. پ، ل١٧٣- ١٨٠.

(١٧٢) ئەو سەردەمە ناوی (پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستانی عێراق) بوو، چونکە کاتێك لە کۆنگرەی دووەمی پارتی ١٩٥١، لێژنەی مەرکەزی هەڵبژێردرا و سکرتێر هەڵنەبژێردرا، بڕیاریش درا هەمزە عەبدوڵای سکرتێری پێشوو لە سلێمانی نیشتەجێ بێت، کاردانەوەی ئەویش کۆمەڵەیەکی لەژێرناوی باڵی پێشکەوتوخوازی پارتی دیموکراتی کورد دامەزراندبوو، بۆیە لە کۆنگرەی سێ یەم ١٩٥٣ بڕیاری دەرکردنی درا، نێوبراو لە ساڵی ١٩٥٦ هاتەوە ناو پارتی دیموکراتی کوردستان و ناوی پارتی بەو شێوەی سەرەوە گۆڕاو ڕۆژنامەی (خەبات)یش بوو بە (خەباتی کوردستان)، هەرچەندە ئەو گۆڕانکارییە بەپێی پەیڕەو و پرۆگرامی حیزب لە دەستڕۆیی (صلاحية) لێژنەی مەرکەزیدا نیە، بۆیە زیاتر بە پارتی دەناسرا، ئێمەش لەبەر دورو درێژی ناوەکە بە پارتی ناوی دەهێنین. بۆزانیاری زیاتر بڕوانە: شیرکو فتح الله، م. س، ص ص١١٥- ١١٦، ١١٨.

(١٧٣) کەفالەتدان شێوازێکی باوبوو لە سەردەمی پاشایەتی بە سەندنی بڕێك پارە، عەبدوڵا ئیسماعیل داوای کەفالەتی ٢٠٠ دیناری لێکرابوو، ئەو کاتە ئەندامانی پارتی توانیان بە ماوەیەك ئەو پارەیە باربوو بکەن، بەڵام نێوبراو تا چەند مانگێك بەر لە شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ ئازاد نەکرا، دیدار لەگەڵ سلێمان شێخ محەمەد ناسراو بە (عەریف سلێمان) لەرۆژی ١٠/٨/ ٢٠٠٨ لە هەولێر، لەساڵی١٩٣١لە دایك بووە، لە پەنجاکانەوە ئەندامی پارتی بووە و لە نێو ریزی پۆلیس رێکخستنەکانی بەئەنجام گەیاندووە، بە پلە و بەرپرسیارێتی پێشمەرگایەتی بەشداری شۆڕشی ئەیلوولی کردووە و ئێستا لەژیان ماوە.

(١٧٤) جلال طالباني، م. س، ص١٧٠- ١٧١ ؛ حسن علي عبدالله، الموقف الرسمي والشعبي العراقي من تطور الأحداث السياسية في مصر ١٩٥٢- ١٩٥٦، (رسالة ماجستير) كلية الآداب- جامعة البصرة، ١٩٨٦، ص٢٠٧ ؛ جعفر عباس حميدي، التطورات و الاتجاهات... ص٢٣٠.

(١٧٥) ئەو هێرشە لەلایەن (ئیسرائیل، بەریتانیا، فەرەنسا) لە (٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٦- ٥ی تشرینی دووەمی ١٩٥٦) بەردەوامبوو، دوای هۆشداری یەکیەتی سۆڤیەت بە سەرکەوتنی گەلی میسری کۆتایی هات. بڕوانە عبدالحميد عبدالجليل أحمد شلبي، م. س، ص٣٠٥- ٣١٣.

(١٧٦) مەسعود بارزانی، س. پ، ل٢١٣ ؛ عبدالقادر البريفكاني، مصطفى البارزاني- زعيم الحركة القومية الكردية المعاصرة، ط١، القاهرة، ١٩٩٦، ص١٥٣- ١٥٤.

(١٧٧) دوای ئەوەی نووری سەعید بۆجاری دوازدەهەم (٣ی ئابی ١٩٥٤- ١٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٥) کابینەی وەزارەتی پێك هێنا، دوای هەڵوەشاندنەوەی حیزبەکەی (دەستووری) خۆی، چەند مەراسیمێکی دەرکرد و حیزبەکانی (سەربەخۆیی و نیشتمانی دیموکراتی) پێ لەکار خست. بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، م. س، ج/٨، ص١٥٢.

(١٧٨) ئەو کاتە حیزبی شیوعی عێراقی دوای زنجیرەیەك کەرتبوون و بەندبازی کە لە ساڵی ١٩٥٣وە روویدابوو، توانییان هەرسێ باڵی (وحدة الشيوعيين، راية الشغيلة، القاعدة) یەکبگرنەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جعفر عباس حميدي، م. س، ص٢٠٤- ٢١٠.

(١٧٩) کۆمەڵێك ئەفسەربوون، بەگەشەسەندنە سیاسییە نێوخۆ و دەرەکیەکانی عەرەبەوە کاریگەربوون، لە ئازاری ١٩٥٧ لە رێکخراوێکی یەکگرتوودا کۆبوونەوە کە عەمیدی رۆکن عەبدولکەریم قاسم

سەرۆکایەتی دەکردن، کۆمیتەی باڵای ڕێکخراوەکە لە ١٤ ئەفسەر پێکهاتبوو کە هیچ کوردێکیان لەنێودا نەبوو، هەندێکیان لە نێو پارتە سیاسییەکان ئەندام بوون، هەموویان دید و بۆچوونی نەتەوەیی عەرەبیان هەبوو. بڕوانە: سعد ناجي الجواد، العراق و المسألة الكردية ١٩٥٨- ١٩٧٠، لندن، ١٩٩٠، ص٣٥.

(١٨٠) عبدالرزاق الحسني، جبهة الاتحاد الوطني و التمهيد لثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، مجلة آفاق عربية، ع/ ٨، آب ١٩٩٠، ص٥١.

(١٨١) صالح حيدري، م. س، ص٣٠٧.

(١٨٢) بۆزانیاری تەواو دەربارەی بەیاننامەکە بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات...، ج/ ١٠، ص٣٨٤- ٣٨٨.

(١٨٣) بۆ زانیاری بڕوانە: عبدالفتاح علي البوتاني، موقف الأحزاب...، ص٦٩- ٧٠.

(١٨٤) جلال الطالباني، مذكرات ، (حاوره:غسان شربل)، مجلة الوسط ،ع/ ٣٥٧، ٣٠/١١/١٩٩٨، ص٢٤.

(١٨٥) جعفر عباس حميدي، م. س، ص٢٣٠- ٢٣١.

(١٨٦) کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك ....، ب/ ٢، ل٤١٨- ٤١٩.

(١٨٧) فاتح ڕەسوڵ، بنچینەی بیرۆکەی مێژووی چەپ لە کوردستان، چ/ ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٣٣٠.

(١٨٨) جلال الطالباني، كردستان والحركة...، ص١١٧.

(١٨٩) لەو کۆبوونەوەیە (ئیبراهیم ئەحمەد) بە سکرتێر و (جەلال تاڵەبانی و هەمزە عەبدوڵا)ش بوونە ئەندامی مەکتەبی سیاسی، واتە لەکۆی ٥ ئەندامی مەکتەبی سیاسی ٣ کەسایەتی سەر بە لیوای هەولێربوون.

(١٩٠) عبدالستار طاهر شريف، م. س، ص٢٦٤.

(١٩١) دیدارلەگەڵ حەسەن مستەفا، لەرێکەوتی ١٠/ ٥/ ٢٠٠٨ لە هەولێر، نێوبراو لەدایك بووی ١٩٢٦ و لە پەنجاکانی سەدەی رابردوو لەگەڵ ڕێکخستنەکانی پارتی بووە، چەندین پلەی بەرپرسی بینیوە، تە ساڵی١٩٥٧لێپرسراوی ناوچەی پارتی هەولێر بووە،چەندین جاریش گیراوە، ئێستا لەهەولێر دەژی؛ دیدار لەگەڵ عەریف سلێمان..

[١٩٢] جعفر عباس حميدي، م. ن، ص٢٥٩- ٢٦٠.

[١٩٣] وەلید حەمدی، کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا، و: موحەمەد نووری تۆفیق، چ/٢، سلێمانی، ١٩٩٩، ص٢٢١.

[١٩٤] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: اسماعيل شكر رسول، اربيل...، ص ص٣٤٧، ٣٤٨؛ جعفر عباس حميدي، م. ن، ص٢٦١؛ مەسعود محەمەد، س. پ، ل٣٥٣.

# بارودۆخی سیاسی ئێران لە ماوەی حوکمڕانی تەهماسبی دووەمدا ( ١٧٢٩-١٧٣٢ )

م. توانا ڕەشید کەریم

## دەروازە

### بارودۆخ ونەخشەی سیاسی ئێران لەنێوان سالآنی (١٧٢٢- ١٧٢٩)

سەدەی هەژدە لەمێژووی ئێراندا، بە قۆناغێکی پڕ لە پەشێوی وتەنگژە (قۆناغێکی ترسناك) دادەنرێ. هەر لەدەسەلآتی توندوتیژ وشالاّو داگیرکاری ئەفغانیەوە بگرە تا ململانێ لەسەر دەسەلآت و شەڕی ناوخۆ. ئەمەش بوو بوو بەگرفت بۆ گەلی ئێرانی وبەدەستیەوە دەتلانەوە[١].

سولّتان حوسێن (١٦٩٤-١٧٢٢)، حوکمڕانی ئێران کەسێکی لاواز وترسنۆك بوو، هیچی لەکاروباری سیاسەت وکارگێڕی نەدەزانی. بارودۆخی ولآتی خستبوە ژێر دەسەلآتی پیاوانی ئایینی، کە هیچیان لەبەڕێوبردن وسیاسەت نەدەناسیّ. کاروباری ولآتی بەتەواوی فەرامۆشکردبوو. نقومی ڕابواردن وئالّودەی ئافرەت وشەرابوو بوو[٢]. نەك هەر خۆشی بەلّکو " سەرۆکەکان و پایەبەرزانی دەولّەت هەر کام لەبەر سوود وقازانجە پووچەکەی خۆیان ودووبەرەکایەتی لەگەلّ دیتران چاویان لەئاست بەرژەوەندییەکانی ولآت نووقاندبوو..."[٣]. هەروەها ئەو سیاسەتە مەزهەبیەیی — بالآدەستبوونی مەزهەبی شیعە- پەیڕەوشی دەکرد، شوێنێکی باشی لەسەر ئێران بەجێ نەهێشت وچارەنووسی خراپی لەسەرتاسەری ئێران دانا[٤]. لەبەرئەوە سەیر نییە کە ویلّنسکی لەراپۆرتەکانی خۆی لەبارەی ئێرانەوە ئاماژە بەلێهەلّوەشاوی وخراپی بارودۆخی ئێران بکات[٥].

داڕوخان ولاوازی حوکمڕانی سەفەوی لەسەرتاسەری ئێران فاکتەری بلاّوبوونەوەی ئاشووب وگرفت و ئاژاوە بووە. ئێران بووبە گۆڕەپانی ململانێ وچاوچنۆکی هێزە ناوخۆیی ودەرەکیەکان، کە هەریەکەیان لەگۆشە وسوچێکی ئەم ئێرانە بەبیانوو جۆراوجۆر چاوی بڕیبوە دەسەلاّت وخاکی ئێران[٦]. ئەوەتا چەندین هێز لەچەند سەرێکی جیاوازەوە هەولّ وکۆششەکانی خۆیان خستبووە گەڕ و ئەو بارودۆخەیان بەهەلدەزانی تا هەژموونی دەسەلاّتی خۆیان بەسەر ئێران دا بسەپێنن وەك ئەفغانیەکان لەڕۆژهەلاّتەوە، عوسمانییەکان لەڕۆژئاوا، ڕوسەکانیش لەباکورەوە، سەرباری هێزە ناوخۆییەکانیش- هۆزە فارسی وکوردییەکان- کە ئەم بارودۆخە دەروازەی لەبەردەم کردنەوە تا جۆرێك لەسەربەخۆیی سیاسی بەدەست بهێنن بەتایبەتی لەم کاتەدا ئەفغانیەکان دەستیان بەسەر ئێران دا گرتبوو. بۆیە ئەم هێزە ناوخۆییانە هەولّیان دەدا لەڕێگەی ئەوەوە سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن لەم دەسەلاّتە تازە، وە داواکاری تەختی پاشایەتی سەفەوی کە خۆی دەبینیەوە لە تەهماسبی دووەم[٧]. وێڕای بوونی هەندێ هێزی ناوخۆی تر. لێرەوە دەتوانین بلّێین ئەمە بارودۆخ ونەخشەی سیاسی ئێران لەم ماوەیەدا پێکدەهێنی کە لەلای مێژوونوسان بە ((ماوەی داگیرکاری ئەفغانی ١٧٢٢-١٧٢٩)) ناسراوە[٨]، جا بۆ ئەوەی ڕەوش وبارووۆدخەکە زیاتر لەبەرچاومان ڕۆشن بێتەوە، هەولّدەدەین بەکورتی لەسەر هەریەك لەم هێزانە بدوێن بەتایبەتی حوکمڕانی ئەفغانیەکان لەئێراندا.

ئەفغانستان، لەسەدەکانی شانزە وحەڤدەدا گۆڕەپانی ململانێی وتەنگژەکانی نێوان هەردوو هێزی سەفەوی و ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی بوو. هەر یەك لەم دوو هێزە هەولّیان دەدا بالاّدەستی خۆیان بەسەر ئەم ناوچەیەدا بسەپێنن. هێزە ناوخۆیەکانی ئەفغانستانیش بەدەست ئەم ململانێ یەوە تەواو پەشۆکابوون. بەلاّم لەسەرەتاکانی سەدەی هەژدە گۆڕان لەبارودۆخ ڕوویدا. ئەمەش هەلی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لەلای هێزەکانی ئەفغانی(غیلزائی وئەبدالی) خولقاند. هەریەکەیان توانی ناوچەیەك لە

ئەفغانستان بخاتە ژێردەسەڵاتی خۆی[٩]. بەهۆی لاوازبوون وداڕوخانی دەوڵەتی سەفەوی لەلایەك و، لەلایەکی تر مژوڵ بوونی ئیمپراتۆریەتی مەغۆلی بەگرفت وتەنگژە ناوخۆییەکان[١٠].

هەروەها ئەو گۆڕانکارییەی لەنێو گۆڕەپانی سیاسی و لەسەر ئاستی هۆزەکانی ئەفغان ڕوویدا. پاش ململانێ هەم لە ڕووبەڕووبونەوەیان لەگەڵ دەسەڵاتی سەفەوی، کە ئەوکات سەر بەو دەوڵەتە بوو، هەمیش لەنێو خۆیان کە دەرەنجام هۆزی غیلزائی بەسەرۆکایەتی میر مەحمود دەسەڵاتی گرتە دەست[١١]. ئەم گۆڕانکارییانە لەپاڵ ئەو هۆکارانەی پێشتر ئاماژەمان پێدا دەرگای لەبەردەم میر مەحمود کردەوە، کە دوو هەڵمەت بەرەو ئێران بەڕێبخات بەمەبەستی دەست بەسەرداگرتنی، هەرچەندە لەجاری یەکەمدا شکستی خوارد وگەڕایەوە چونکە هەندێ گۆڕانکاری لەپایتەخت ڕوویدا، بەڵام دواجار توانی لەهەڵمەتێکی تریدا بەناو سستان وکرمان دا گوزەر بکات و، بەرەو ئەسفەهانی پایتەخت هەنگاوبنێ وپاشتر لەشەڕی (گلون ئاباد)دا هێزی سەفەوییەکان بشکێنێ وگەمارۆ بخاتە سەر ئەسفەهانی پایتەخت. بەڵام ئەمە زۆری نەخایاند تا لەساڵی ١٧٢٢ دا میر مەحمود تەختی پاشایەتی وەرگرت لەسوڵتان حوسێن ولەشوێنی ئەو دانیشت[١٢]. وەرگرتنی دەسەڵات وتاج لەسەرنانی میر مەحمود وهێرشی ئەفغانیەکان بەکۆتایی هاتنی حوکمڕانی سەفەوی دادەنرێ[١٣]. بۆیە دەکرێ ئەمە بەقۆناغێکی نوێ لەمێژووی ئێران بناسێنرێ.

میر مەحمود لەسەرەتادا سیاسەتێکی حەکیمانە لەڕووی ئیدار و مامەڵەکردن لەگەڵ فارسەکان پەیڕەوکرد، بەتایبەتی لەڕووی کارگێڕییەوە کە ئێرانیەکانی لەسەر کاروبارەکانی دەوڵەت لانەبرد. بەڵام ئەم سیاسەتە دواتر گۆڕانی بەسەرهات بەتایبەتی کاتێ زانی ناتوانی حوکمی ئێران بکات، سیاسەتێکی زۆر توندوتیژانە گرتەبەر وپەنای بردە بەر زمانی شمشێر بەجۆرێك نزیکەی سێ سەد خانەدانی کوشت و، چەندان کەسی

تر لەمنداڵ وژن وخەڵکی کوشت[14]. هەر بۆیە ئەفغانیەکان نەیانتوانی حوکمڕانی تەواوی ئێران بکەن وتەنها لەچوارچێوەی شارەکانی ئەسفەهان وکرمان وسیستان و قومس و بەشی ڕۆژئاوای خوراسان نەبێ دەسەلاتیان نەدەڕۆیشت[15].

لەپاڵ بوونی ئەفغانیەکان وەك دەسەلات وحوکمڕانی ئێران، هێزێکی دی هاتە سەر گۆڕەپانی ئێران بەتایبەتی پاش ئەوەی لەکاتی گەمارۆدانی ئەسفەهان هەڵهات. ئەویش تەهماسبی کوڕی سوڵتان حوسێن بوو — تەهماسبی دووەم- کە خۆی بە میراتگری ڕەوای دەسەلاتی سەفەوی دەزانی. بەمەش ولاتی ئێرانی دابەشی دوو ناوەندی سیاسی جودا بوو؛ ئەویش سەفەوی و ئەفغانی بوو. ئەمەش وەك دەرەنجامی ئەو شەڕە وگرتنی ئەسفەهان هاتەکایەوە[16]. هەروەها ئەم ئاڵۆزییە و پاشاگەردانیە کەسەتاسەری ئێرانی گرتبووە ڕێخۆشکرد بۆ هاتنی هەریەك لە روسیا لەباکورەو و عوسمانیەکان لەرۆژهەلاتەوە. هەریەك لەم دوو دەوڵەتە بەچاوکردن لەوبارودۆخە بەهەلیان زانی ودەستیان خستە

کاروباری ئێران وهەریەکەیان بەشێکی خاکی ئێرانیان گرت[17].

ئەم بارودۆخە تەنها نەبووە جیگای و بەرچاوی هێزە دەرەکیەکان کە لەپێشتر باسمان کرد بەلکو لەناوخۆش زۆر هێز بەهەلیان زانی سەربەخۆی خۆیان لەناوچەکانی خۆیان ڕادەگەیاند وەك مەلیك مەحمود سیستانی لەناوچەی تون[18]. وە یاخود دەرکەوتنی کەسایەتیەکی وەك نادرشا کە لەساڵی (١٧٢٢)ەوە تواناکانی گەیشتبوە ئاستێك بتوانێ لەململانێ ناوخۆییەکان بەشداری بکات[19]، کە دواجار رۆڵی یەکلاکەرەوە وسەرەکی لەژیانی سیاسی ئێران دەگێڕێ.

بەم شێوەیە پێش ئەوەی تەهماسبی دووەم بێتە سەرتەخت و، لەماوەی حوکمڕانی ئەشرەفی ئەفغانی و بەواتایەکی تر لەکۆتاییەکانی حوکمڕانی ئەفغانیەکان دا. دەتوانین نەخشەی سیاسی و وێنەی ولاتی ئێران لەو قۆناغەدا بەم شێوەیەی خوارەوە دەست نیشان بکەین:

یەکەم: ئەفغانیەکان بەسەرۆکایەتی (ئەشـەرەف) کـە دەسـەلآتیان بەسـەر ئەسـفەهان وشیراز وباشووری رۆژهەلآتی ئێراندا هەبوو.

دووەم: تەهماسبی دووەم بەهاوکاری نادرخان، کە تەختی شایەتی ئێرانی بەمافی رەوای خۆی دەزانی. مەلّبەندەکەی لە مازندەران بوو.

سێ یەم: روسەکان لەباکور، هەرچەند پەتروسی گـەورە مردبـوو کەچـی پروپاگەنـدە ئەوەهەبوو کە لەسەر فراوانخوازییەکانی خۆیان لەسەر خاکی ئێران بەردەوام دەبن.

چوارەم: عوسمانیەکان کە بەمافی خۆیانی دەزانی خاکی ئێران داگیر بکەن و خۆیـان لـە ئەفغانی وئێرانیەکان پێشتر دەزانی بۆ بەرگریکردن لەخاکی ئێران.

لەمەوە دەردەکەوێ ئێران لەنێوان چوار هێزدا دابەش بـوو بـوو: تەهماسـبی دووەم وروسەکان وعوسمانیەکان وئەفغانیەکان[20].

## تەوەرەی یەکەم

## سەربوردەی ژیانی تەهماسبی دووەم

### أ- سەربوردەی ژیانی تا هاتنەسەرتەختی حوکمڕانی:

تـەهـماسب مـیرزا کـوڕی سـولّتان حوسـێن، بـەگوێرەی سەرچـاوەکان لەسـالّی (١٧٠٤ز/ ١١١٦ک) لەدایك بووە[21]. هەرچەندە لەنێو ڕووپەڕی سەرچاوەکاندا زانیاری لەبارەی سەرەتاکانی ژیانی وشوێنی لەدایك بوونی لەبەردەست نییە. تەهماسـب کـوڕی سێیەمی سولّتان حوسێن بوو وەك " باوکی بێ جەوهەر ولێنەوەشاوەبوو"[22]، رابـوردن وبایەخدان بەخۆشـگوزەرانی بـوو بەغـەمی وهـەرزەیی زەینـی داگیرکردبـوو. خـاوەنی ڕاوتەگبیری خۆی نەبوو وبەناسانی دەچووە ژێر کاریگەری کەسانی ترەوە[23].

دوای ئەوەی پالّەپەستۆ وهێرشی ئەفغانیەکان وگـەمارۆ بـەرۆکی قـاپی پایتـەختی دەولّەت" ئەسفەهان" گرت. تەهماسب لەگەلّ (٦٠٠) پیاودا بـەرەو قـەزوین هـەلّهات

بەمەبەستی کۆکردنەوەی هێز تا بەهانای پایتەختەوە بێت، بەلاّم لەڕاستیدا هیچی پێ نەکرا، بەڵکو هەر ئەوەندەی پێکرا نامەیەك بۆ باوکی بنێرێ تیایدا داوای لێکرد لەشاردکە رابکات[٢٤]. چونکە ئەو گەیشتە قەزوین لەباتی ئەوەی سوپا ئامادەبکات وبەهانای پایتەختەوە بچێت، نوقمی رابواردن وهەرزەکاری خۆی بوو. کاتێکیش بەخەبەرهاتەوە، یارمەتیەکان سوودی نەبوو[٢٥]. دەرەنجام پایتەختی سەفەوییەکان کەوتە ژێر دەستی ئەفغانیەکان ومیر مەحمودی ئەفغانی لە ساڵی (١٧٢٢) چووە سەرتەختی شاهانە. ئەم هەواڵی لابردنی باوك وهاتنە سەرتەختی میر مەحمود، کاردانەوەی لای تەهماسب میرزا دروست کرد. ئەوەبوو خۆی بەپاشای وولاّت ناساند[٢٦] و، لە دەی نوڤەمبەری هەمان ساڵیشدا لەسەرتاسەری ولاّت لە ووتار و پول و دراو وسەرتاپای ولاّت بەنازناوی تەهماسبی دووەم حوکمڕانی خۆی راگەیاند[٢٧]. وەك کاردانەوەیەك لەبەرامبەر ئەو کارەی میر مەحمود.

تەهماسبی دووەم بەم هەنگاوەی بووە جێگای مەترسی بۆ ئەفغانیەکان ئەوە بوو میر مەحمود هێزی نارده سەری لەقەزوین. ئەویش کە بەدوای شوێنێکی هێمن وئارام وێل بوو. دەستبەجێ بەرەو تەبریز هەڵهات، پاش ئەوەی لەلایەن فەرماندەی ئەفغانیەکان ( ژەنەراڵ ئەمانوڵلاّ خان) لەو شارە لە ٢٠ی دیسمبەردا دەرکرا[٢٨]، و دواتر لەوێشەوە بەرەو تورکان وئەردەبیل رایکرد[٢٩]. لەو سەروبەندەدا روسەکان ئەو بارودۆخەی ئێرانیان بەهەلزانی و دەستیانگرت بەسەر هەندێ ناوچەی باکوری ئێران. ئەمەش پاڵی بەتەهماسبەوە نا پەیانیان لەگەڵ ببەستێ. تا لەو ڕێگەیەوە بتوانی یارمەتی روسەکان بەدەستبهێنی دژی ئەفغانیەکان و، گەڕانەوەی بۆ تەختی شاهانە زامن بکات. ئەم هەنگاوەی روسەکان نایان ڕێخوشکرد بۆ هاتنی هێزێکی تریش لەرۆژهەلاّتەوە ئەویش عوسمانیەکانن[٣٠]. ئینجا تەهماسب پاش ئەوەی بەرەو ئەردەبیل گوزەری کردبوو، هاوکات عوسمانیەکانیش هەوڵیان دەدا دەسەلاّتی خۆیان بەسەر

تەواوی ئازەربایجـان دا بـسەپێنن، تەهماسـب بڕیاریـدا بـەرەو گونـدی " ئەنـدەرمان" لەباشوری تاران بنەوبارگەی تێکبنێـت[31]. بـەم هـەنگاوە تەهماسـب خـۆی لەبـەردەم هێزێکی ئەشرەف بینیوە کە چاوەڕێ بـوو تـا لێبـدات، دەرەنجـام چـاری نـەما بـەرەو مازەندەران و ئەستەرئاباد هەڵهات ولەوی چووە پاڵ فەتح عەلی خانی قاجار[32] و دوای ئەویش چووە پاڵ نادرخان، ئەوەش پاش ئەوەی نادرخان وەك کەسـێکی بـەهێز لەسـەر گۆڕەپانی ئێران دەرکەوت.

نادرخان بەلێهاتوویی وزیرەکی خۆی توانی تەواوی گرفـت وتەنگـژەکانی بـەردەمی خۆی ڕامبکات، ئینجا پەلاماری ئەفغانیەکانی دا. لەچەند شەڕێکدا تێکیشکاندن و لە شەشی نۆڤەمبەری (١٧٢٩) چووە ناو ئەسفەهانی پایتەخت و، ئەفغانیەکانی لێوەدەرنا و، تەهماسـبی هێنایـەوە سـەرتەختی پاشـایەتی وفـەرمانڕەوایی سـەفەوییەکانی بوژاندەوە[33]. لێرەوە مـاوەی حـوکمڕانی تەهماسـب دەسـت پێـدەکات کـە تـا سـاڵی (١٧٣٢) درێژە کێشا. ئەگەرچی دەبێ ئەوە بڵێین کە لەماوەیەدا واتە: لەنێوان سـالانی (١٧٢٩-١٧٣٦) سەفەوییەکان تەنها بەناو حوکمڕانیان دەکرد[34].

ماوەتەوە ئەوە بڵێین، کـە تەهماسـبی دووەم لەسـاڵی ١٧٣٢ لەلایـەن نادرخانـەوە لەسەر حوکم لادەبرێ[35] و، لەسـاڵی (١٧٤٠) لەسـبزاور لەگـەڵ هـەر دوو کوڕەکـەی (عەباسی سێ یەم و ئیسماعیل) دەکوژرێ[36].

## ب- لابردنی تەهماسبی دووەم لەسەر حوکم:

دوای ئەوەی تەهماسبی دووەم ئێرانی خستەژێر باری ڕێککەوتنێکـەوە لەئـەنجامی سـەرنەکەوتنی لەشـەڕێکدا لەگـەڵ عوسمانییـەکان، کـە بەهۆیـەوە ناوچـەیەکی زۆری لەڕۆژهەلاتی ئێران لەدەستدا. ئەمە بێ سەبری وڕق وکینـەی لـەلای نادرخـان دروست

کرد، کە ئەو کات لەبەرەکانی جەنگ لەئەفغانستان — ڕاپەڕینی هەراتیەکان- گەڕابووە، هەواڵی ئاشتنامەکەی بەرگوێ کەوت وبەندەکانی خوێندبووە. بۆیە نادر دەستبەجێ هەنگاوی نا دژی ئەم ئاشتینامەیە، لەیەکەم هەنگاوی دا سەفیری ئێرانی کە لە (ئەردوو) بوو بانگ کردو پەیامێکی بۆ دەوڵەتی عوسمانی پێدا نارد؛ یا تەواوی ویلایەتەکان بگەڕێنێتەوە، یاخود خۆی بۆ جەنگ ئامادە بکات[٣٧].

لەلایەکی تر نادرخان ئەمەی بەهەلزانی، دەمێ بوو چاوەڕی دەکرد تاوەکو لێدانێك ئاڕاستەی دەزگای سەلتەنەتی سەفەوی بکات. نادر زیرەکانە هەڵسوکەوتی کرد. سودی لەبێزاری وهەلاّیسان ورەخنەی خەڵك وەرگرت دژی دەسەلاّتی سەفەوی. بۆ ئەمەش، کە دەکرێ بەهەنگاوی دوودەمی وەسف بکەین لەبەدەستهێنانی ئەو مەبەستەی هەیەتی نامەیەکی ئاڕاستەی ئەمیندارانی گەلی ئێرانی کورد وبە زمانی مەزهەب ونیشتمان ومیللی و مرۆڤدۆستانە موخاتەبەی کردن. گوتی: (( ئەم کارە تەحمول ناکرێ و دژی سروشتی ئازایانەیە چونکە ئەم ڕێکەوتنە دژە لەگەڵ بەرژەوەندی دەوڵەت... هەرکەسێکیش نەیتە چوارچێوەی ئەم دژایەتی یەوە ئەوا دەکەوێتە بەر نەفرەتی حەزرەت و لەئیسلام دەردەچێ ولەکۆمەڵی خەواریج ئەژمار دەکرێ))[٣٨]. لەهەمان کاتیشدا نامەیەکی نارد بۆ سەروکاری گشت ویلایەتەکانی ئێران و پێراگەیاندن بەم ڕێککەوتنامەیە رازی نییە و، ئامادەیە جەنگ دژی عوسمانیەکان بکات و، ناچاریان بکات بەبەستنی ڕێکەوتننامەیەك کە شکۆ وحەیا بۆ ئێران بگەڕێنێتەوە[٣٩].

لەهەنگاوی دواتریدا نادرخان هەر یەك لە حەسەن عەلی بێك ومیرزا کافی خەلفا ومەلا عەلی ئەکبەر مەلاباشی و میرزا ئەبولقاسمی کاشانی بۆ ئەسفەهان نارد تا ناڕەزایی خۆی بەرامبەر گرێدانی ئەم ڕێککەوتننامەیە بە تەهماسبی دووەم بگەیەنن[٤٠]. ئینجا نادرخان کاتەکەی بەهەلزانی تا شایەتی خۆی ڕابگەیەنێ. ئەوەبوو بەرەو ئەسفەهانی پایتەخت بەڕێکەوت و لەوێدا سەرەتا بەنەرم ونیانی مامەڵەی

لەتەکدا کرد وخوانێکی گەورە سزا دا لەنزیك ئەسفەهان لە لەباخی هـەزار جەریب دا. ئەم خوان وئاهەنگـە مـاوەی سـێ رۆژ وشـەوی خەیانـد. هـەموو جۆرێـك خواردنـەوە لەشەراب و مەی وخواردەمەنیەکی پێشکەش بەتەهماسب کرد. هاوکات فەرماندەکانی سـوپا وخانـەدان و قزلباشـەکان بانگێهـشت کردبـوو. تەهماسـبی دووەم، کـە نغـرۆی خواردنەوە ورابواردن ببوو تەواو سەرخۆش بوو[41] هەرچەند گومانی ئەوە دەکرێ کە (( دەرمانی بێهۆشکەر تێکەڵ بەشەرابەکەی کراوە))[42]. ئەمەش بوو بەپاساو بۆ نادرخان لەبەردەم تەواوی سەروکار وخانەدانەکان تا پێیان بڵی کە چیتر سـوڵتان شایـستە نییـە وکەسێکی سـستە ومتمانەی پێ ناکرێ تا وڵات بەرێوەبەرێ[43]. بۆیە هەموو بڕیاریاندا کە شا لەسەر حوکم لابەرن. لەمەشـدا نـادر خـۆی بـە شـا نەناسـاند چـونکە دەترسـا تۆمەتباری بکەن بەوەی دەیەوێ جیگا ودەسەلاتی میراتگری شەرعی بگرێ[44].

بۆیە لە ٧ی سیبتمبەری (١٧٣٢) مناڵە هەشت مانگەکەی کە ناوی عەباسی سـێ یەم بوو لەسەر تەختی پاشایەتی دانا و، خۆی کرد بە جێگری سەڵتەنەت. ئەمەش پاش ئەوەی لە ٣١ی ئۆگۆستۆسی سـاڵی (١٧٣٢) تەهماسـبی دووەم لەسـەر حـوکم لابـرد ولەگەڵ حەریەکەی ناردی بۆ مـەشهەد[45].

## تەوەرەی دووەم

## تەهماسبی دووەم وبارودۆخی ناوخۆ

### أ- تەهماسبی دووەم ونادرشا:

تەهماسب دوای ئەوەی لەجێ باوکی دانیشت ولەقەزوین سوپای کـۆکردەوە. ئینجـا بەرەو تـاران ڕۆیـشت پاشـان لـەوێوە فـەتح عـەلی خـان سـەرۆك هـۆزی قاجـار کـە لەئەستەرئاباد بوو لەکاتێکدا گوێبستی ئەوەبوو، کە وا ئەشرەف بەرەو ئەو شارە دێـت

ودەیەویَ گەمارۆی بدات بۆیە هەوڵیدا هاریکاری بکـات وئـەویش دەسـتبەجیَ بـەرەو مازەندەران ڕایکرد وپەیوەندی بەسـوپای سـەرۆکی هـۆزی قاجـار کـرد، تەهماسـبیش لەپاداشتی ئەوەدا فەتح عـەلی خـانی بـە جێگـری سـەلتەنت و مـیری مـیران دەسـت نیشانکرد[٤٦]. لەم سەروبەندەشدا کەسایەتیەك لەسـەر شـانۆی ڕووداوەکـان دەرکـەوت ئەویش نادرخان بوو، نادرخان پاش ئەوەی بابا عەلی مرد، جێگـەی گرتـەوە. هەوڵیـدا ناوچەکانی دەسەڵاتی فراوان بکات و، دەست بگرێت بەسەر تەواوی خوراسـاندا، بـەڵام ئەم کارەی لەسەرەتاوە بۆ نەچووە سەر وبووبە ڕێگرێك ودەستی گرت بەسـەر قەڵایەکـدا کە دواتر بەقەڵای نادر ناسرا، ئنجا نادر لە بنکە سـەرەکی یەکـەی خۆیـیـەوە دەسـتی بـەفراوانخوازیکرد ئـەوەبوو نیـسابووری گـرت، وڕایگەیانـد کـە هـیچ مەبەسـتێکی سەربەخۆی لەژێر سەردا نییە بەڵکو بەناوی شـا تەهماسـبەوە میراتگـری ڕەوا دەسـتی بەسەرداگرتووە چونکە دەرکی بە پێگە وشوێنی شا کردبووە تا بەئاسانی بتوانیَ دەست بگـریَ بەسـەر تەهماسـبدا وبیخاتـە ژێـر کاریگـەری خۆییـەوە لەلایـەك[٤٧] و، خۆهەڵواسینیشی بەخانەدانی سەفەوییەوە لەلایەکی تر مەبەستی چاوبڕین بوو لەتەخت وپاشایەتی سـەفەوی[٤٨]. بەتایبەتی شا تەواو نغرۆی گەوجێتی بوو و بەنرخ وبـیَ نرخـی لێکجیا نەدەکردەوە[٤٩]. نادرخان هەر لەسـەرەتای چـوونە خزمـەتی شـا تەهماسـبەوە وهەوڵیدا ببێتە جێگای سەرنج ومتمانەی، ئەوەبوو تـوانی متمانـەی ئـەو دەسـتبخات بەجۆرێك فەرماندەی سوپای دایەدەسـت و نازنـاوی (تەهامـسب قلـی واتـە: کویلـەی تەهماسبی) پیَ بەخشی[٥٠]. لەمەوە بۆمان ڕووندەبێتەوە سیاسەتی نادر لەم قۆناغـەدا بەدوو ئاڕاستە دەڕوات: ((یەکەم: لەهەرێمەکانی باکوری فارسـدا بـەناوی تەهماسـبەوە فراوانخوازی بکات و وڵات لەئەفغانەکان پاکبکاتەوە. دووەم: بـۆ هەمیـشە پارێزگـاری لەهەژموونی خـۆی لـە جوڵـە سیاسـی وسـەربازییەکان بکـات))[٥١]. بـۆیە دەکـریَ ئـەمەش بـەوێستگەیـەکی تـری پەیوەندییەکانی نێوانیان دابنـێن. بەتایبـەتی لێـرەدا

پرۆسەکانی نادرخان و ئازایەتی ولێهاتووی وبەناوبانگی نادر بەتایبەتی لەهەرێمەکانی باکور و باکوری رۆژهەلآت بووە جێگای سەرنجی تەهماسب، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی نێردەی شا محەمەد خان تورکمەن کە دەیویست مەحمود سیستانی لەخوراسان لەناوبەرێت، چونکە لەم سات ووەختەدا بەهەمان شێوە هەولێدەدا ناوچەی تر بخاتەژێر دەسەلآتی خۆیەوە، هانابەرێ بۆ نادرخان چونکە خودی شا پێویستی بەپاسگە وکەسایەتی تری لێهاتوو هەبوو[٥٢]، بەتایبەتی نادر کە ئەوکات نزیکەی (٥٠٠٠ هەزار) جەنگاوەر لەژێر فەرماندەیی ئەو دابوون[٥٣]. ئەمەش جۆرێك لەهێز وتوانا بەتەهماسب دەدا.

نادر بۆ ئەوەی گۆرەپانەکە لەبەردەم خۆی والآ بکات، دەستیکرد بەلەناوبردنی دوو لەدوژمنە سەرسەختەکانی ئەوانیش: فەتح عەلی خان قاجاری جێگری سەلتەنەتە و مەحمود سیستانی فەرمانڕەوای خوراسانە). سەبارەت بەوەی یەکەم لەساڵی (١٧٢٦) دوژمنە سەرسەختە بەهێزەکەی خۆی لەناوبرد. کە ڕکابەری دەکرد لەلای تەهماسب ئەوەبوو بە خیانەت و هەبوونی دەست لەگەڵ مەحمود سیستانی تاوانباری کرد و، کوشتی. بەمەش مەیدانەکەی بۆ چۆڵ بوو[٥٤]. دوای ئەوە ڕوویکردە مەشهەد لەوێش پاش چەند شەڕێك توانی مەحمود سیستانیش لەناوبەرێ و دەستبگرێ بەسەر مەشهەد دا [٥٥]. بەمەش پێگەی وشوێنی لەلای تەهماسب زیاتر بەرزبووە و ئەوەندەی تریش کەوتە نێو چوارچێوەی دەسەلآتەوە[٥٦].

وێڕای ئەمانەش، پەیوەندییەکانی نێوانیان بەم شێوەیە لەمەو پێش بەردەوام نەبوو، کە دەکرێ بەپویەندی نێوان مورید وشیخ وەسف بکرێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە، چەند ڕووداوێك هاتەپێش کە جۆرێك لەساردوسڕی کەوتە نێوانیانەوە، ئەوەتا لەمەسەلەی دەربەڕاندنی ئەفغانییەکاندا جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە بەتایبەتی کاتێ تەهماسب یەك لەمیرەکانی خۆی بەناوی محەمەد عەلی خان کرد بە جێگری سەلتەنەت و سەرداری ناوچەکانی لای عێراق و ئازەربێجان، ئەمەش لەلای نادرخان خراپ خوێندنەوەی

بـۆکراو، بۆیـە بـەر لـەوەی بـچێت ئەفغانـەکان دەربـەرێنێ، محەمـەد عـەلی خـانی لەناوبرد[٥٧]. هەر لەهەمان ئاراستەدا پاش سەرکەوتنەکانی، نادرخان زیرەکانـە تـوانی ویـست وئـیرادەی خـۆی بـسەپێنێ بەسـەر تەهماسـبدا. ئـەوەش بەسـەندنی مـافی کۆکردنەوەی باج لەولآت[٥٨]، بەم شـێوەیە نـادر تـوانی هـەردوو دەسـەلآتی سـەربازی ودارایی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

سەرەڕای ئەوەش، دوای ئـەوەی ئەفغانـەکانی دەرکـرد وسـەفەوییەکانی هێنایـەوە سـەرحوکم، نـادر وەك یـەك لەتوێـژەرەکان دەڵـێ: (( هـەر خـۆی حیـساب بـوو، دام ودەستگای ئێران هەمووی بەدەست خۆیەوە بوو))[٥٩] تا ئەو ڕادەی دەکرێ بـوترێ، کـە حوکمڕانی سەفەوییەکان لەماوەی سالآنی ١٧٢٩-١٧٣٦ تەنها بەناو بـوو، دەسـەلآتی سەرەکی لەژێر دەسەلآتی نادرخان دابوو[٦٠]. لەپاڵ ئەمەشدا نادر هەر بەمەوە نەوەسـتا بەڵکو لەناکامی ئەو پەیماننامەی تەهماسب لەگەڵ عوسمانییەکان بەستێ وەك پێشوتر ئاماژەمان پێکرد بە پەلە چەند هەنگاوێکی نا تا بەمەرامەکانی خۆی بگات، چـونکە بەم هەنگاوەی ئەوەندەی تر هەم ناکۆکی فراوانکرد، هەمیش زیاتر ڕقـی نـادری زیـاتر کرد، بۆیە تەهماسبی لەسەر حوکم لابرد[٦١].

بەم شێوەیە بەڕوانین لەپەیوەندی نێوانیان، ئەوەمان بۆ دەردەخات تەهماسب ناچـار بوو لەپێناو وەرگرتنەوە دەسەلآت لەئەفغانەکان پشت بەنادر ببەستێ، تا ئەو ئامانجەی هەیەتی بەدەستی بهێنێ، هەرچەندە چەند جارێکیش هەوڵیدا خۆی لەبالآدەستی وهێزی نادر ڕزگار بکات، بەلآم پێنەکرا، هەرچی نادرخانە هەر لەسەرەتاوە بەهای چوونە پـاڵ خانەدان ومیراتگری سەفەوییەکانی پـاش زانـی ولاوازی تەهماسبیـشی بەهـەلزانی تـا لەورێگەیەوە دەست بەسەر دەسەلآتدا بگرێ. بەتایبەتی توانا سەربازییەکانی ئەو ناکرێ لەپرۆسەیەکی وادا فەرامۆشـبکرێ، کـە بـەجوانی تـوانی لەبەرژەوەندیـەکانی خۆیـدا بەکاریان بهێنێ. بۆیە دواجار دەکرێ بڵێین ئەم پەیوەندییـە دۆسـتانە نـەبوو و، بـەڵکو هەریەك لەلای خۆیەوە هەوڵی بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانی خۆی دەدا.

**ب- تەهماسبی دووەم وئەفغانییەکان:**

دوای ئەوەی ئەفغانییەکان توانییان دەست بگرن بەسەر ئەسفەهانی پایتەختدا، هەروەك پێشتر باسمان کرد تەهماسب بۆ ئەوەی بەهانای باوکی بێت بەرەو قەزوین لەگەڵ هێزیکدا ڕایکرد و، لەوێ خۆی بەشا تەهماسبی دووەم ومیراتگری ڕەوای خانەوادەی سەفەوی ڕاگەیاند. ئەمە لەکاتێکدا، کە شا حوسێن بەدەستی خۆی تەختی شایانەی پێشکەش بەمیر مەحمودی ئەفغانی کرد. میر مەحمودی ئەفغانی هەر زوو ئەمەی بەهەڕەشە بۆ سەر دەسەلاتەکەی زانی، بۆیە دەستبەجێ هێزیکی ناردە سەری[٦٢] هەرچەندە هەولەکانی تەهماسبی دووەم لەو کاتانەدا بۆ کۆکردنەوەی هاوکاری هەولێکی نەزۆکانە دەرچوو، وەهیچیشی لێ شین نەبوو[٦٣]. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە تەهماسبی دووەم نەیتوانی لەماوەی حوکمڕانی میر مەحمود کاریگەرییەکی وا دروست بکات.

ئەم بارودۆخە لەدوای جێنشینەکەی ئەشرەفی ئەفغانی وەرچەرخانێکی بەخۆوە بینی، ئەودتا هەر زۆری نەبرد تەهماسب بۆ یەکەمجار لەگەڵ ئەفغانەکان کەوتە ڕووبەڕووبوونەوە. ئەمەش پاش ئەوەی تەهماسب قەزوین بەجێهێشتبوو و بەرەو باشووری گوندی ئەندەرمان ڕایکردبوو، بەلام لەوێش کاتێ نیازی ئەشرەفی ئەفغانی بۆ ڕوون بووە لەو بانگهێشەی کردبو،و کە مەبەستێ لەناوبردنی بوو، دەستبەجێ بەرەو مازەندەران وئەستەرئاباد هەلهات[٦٤]، ئیتر لەسەردەمی ئەشرەفدا ڕووبەڕووبوونەکە زیاتر پەرەسەندنی بەخۆوەبینی بەتایبەتی کاتێ تەهماسبی دووەم چووە پاڵ کەسایەتیەکی وەك نادرخان وبارەگەی خۆی لەناوچەی ئەستەرئاباد تەواو بەتین کرد لەلایەك و، لەلایەکی تریش گرتنی هەردوو شاری مەشهەد وهەرات لەئەفغانیە ئەبدالیەکان. ئەوەندەی تر مەترسی خستە ناو دلی ئەشرەفەوە هەر بۆیە ئەم بارودۆخە پالی پێوەنا خێرا لەسالی (١٧٢٧) پەیمان لەگەڵ عوسمانییەکان ببەستێ تا مەترسی

تەهماسبی دووەم کە خەریك بوو قورقوراگەی ئەشرەفی دەگـرت لـەکۆڵ بکاتـەوە[٦٤].
لەمـــەوە بۆمـــان دەردەکـــەوێ لەســـەردەمی ئەشـــرەفدا مەترســـییەکانی تەهماســـب بەشێوەیەکی خێرا کاریکردە سەر ئەفغانییەکان وبارێکی تری لەبـەردەم ئەفغانییـەکان خستەبەردەمیان.

ئەم هەنگاوانە، کە لەڕاستیدا بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئازایەتی نادرخان بـووە هۆی ئەوەی کە هێزی تەهماسب بەشێوەیەکی فـراوان بەرزبێتـەوە و، ببێتـە مەترسـی لەسەر ئەشرەف، ئەمەی دوایش هەر زوو لەم هەنگاوانە تێگەیشت بۆی دەرکـەوت کـە بەپێویستە بەپەلە هەنگاوبنێ تا کـار لـەکار نـەترزاوە، بۆیـە بەسـەرۆکایەتی هێزێـك بەپەلە بەرەو خوراسان کەوتەڕێ تا لەهێرشێکی کتوپڕدا نادرخان وتەهماسب لەناوبەرێ بەر لەوەی ئەوان بتوانن خۆیان ئامادەبکەن، بەتایبەتی ئەشـرەف وهـەروەك پێـشتریش باسمان کرد تەهماسبیش لەوە گەیشتبوون کە ئەم شەڕە شەڕی یەکلاکـەرەوە دەبـێ[٦٦].
ئەوەبوو لەساڵی (١٧٢٩) لەخاکی دامغان شـەڕی (مهماندۆسـت) لـەنێوان ئەشـرەف ونادر ڕوویدا. لەو شەڕەدا ئەشرەف زۆر بەخراپی شکا وبـەرەو ئەسـفەهان پاشەکـشەی کـرد[٦٧]. ئنجـا ئەشـرەف لـەناو ئەسـفەهاندا قەسـابخانەیەکی سـازدا لەخانـەدان وگەورەپیاوان وزانایانی، کە بە سەد هەزار کەس مەزەندە دەکرێ — ئەم ژمارەیە جێـی گومانە- بەجۆرێك هیچ مرۆڤدۆستێك وکەسێکی ئاقڵ قبوڵی ناکات[٦٨]، هەروەها نەك هـەر ئـەم کەسـایەتیانە بـەڵکو خـودی سـوڵتان حوسـێن ولایەنـدارە دڵسۆزەکانیـشی کوشت[٦٩].

دوای ئەم شکستە ئەشرەف دووبارە خۆی سازکردەوە. بەم شێوەیە لەشەڕێکی تـردا لە٢٠ ی ڕەبیعل ئەوەلی ساڵی(١٧٢٩) لە(مورچە خورت) پێکـدادان لـەنێوان هـەردوو هێز ڕوویدا، هەرچەند ئەمجارەیان هاوکاری لەسوپای عوسمانی وەرگرتبوو، بەڵام ئەشرەف تووشی شکستێکی گەورە بووە. بۆیە بەرەو شیراز هەڵهات و، تەهماسبیش چـووە نـاو

ئەسـەفەهانەوە وتـەختی ئەسـەفەهانی گرتەدەسـت. لێـرەوە نادرخـان بەپێـچەوانەی تەهماسبەوە سووربوو لەسەر ئەوەی کە ئەم هێزانە لەناوبـەرێ بۆیـە بـەخێرایی بـەدوو هێزەکانی ئەشرەف کەوت و، لە زارەغان لەدووری بیست میل لەشیرازەوە جـارێکی تـر بەسەر هێزەکانی ئەشرەفدا سـەرکەوت و تـەواو تێکیـشکاندن[٧٠] هەرچـەند ئەشـرەف داوای دانوستانی کرد، ئەوەبوو محەمەد صیەدال ومیا صادق ومەلا زەعفرانی نارده لای کە رێ بدات بەخۆی وخانەدانەکانیانەوە بـەرەو قەنـدەهار بگەڕێنـەوە[٧١]، بـەلام نـادر پێداگیربوو لەسەر ئەوەی دەبـێ تـەواوی ئەفغانیـەکان لەناوبـەرێ، هاوکـات ئەشـرەف تووشی گرفتێکی گەورە بووە ئەوەبوو ئەفغانیەکان بوونە چەند کوتلە وکەرتێکی جیاواز و، هەریەکە بۆ خۆی بەرەو قەندەهار دەگەڕایەوە. ئەمەش تـەواو هێزەکـەی ئەشـرەفی لاوازکرد، سـەرەڕای ئـەوەش هەوڵیـدا دەسـتبگرێ بەسـەر لار وکرمانـدا، بـەلام لـەم هەوڵەشی سەرنەکەوت و، خەڵکی ئەو دوو شارە لێهاتنە وەلام و بەروویدا ڕاپـەڕین[٧٢]. ئیتر چاری نەما بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ قەندەهار، هەرچەندە لەو ڕێگەیـەدا ڕووبـەڕووی مەترسی وتوندوتیژی وسەرما وسۆڵەیەکی زۆر بووەوە[٧٣].

دواجار لەساڵی (١٧٣٠) ئەشرەف لە بلوجستان، بەدەست یەك لە بلوجییـەکان بـە ئەڵماس کوژرا و سەریـشیان نـارد بـۆ شـای سـەفەوی. تەهماسـبیش لـەلای خۆیـەوە ئەڵماسـەکەی پێشکەش بە پەیامبەرەکە کرد. بەم شێوەیە حوکم وفەرمانڕەوای ئەفغانی بەیەکجارەکی کۆتایی هات لەئێراندا[٧٤]. وێڕای ئـەودش هەنـدێ لەئەفغانـەکان دواتـر هەوڵیاندا لەڕێگەی دەریا لە بەحرێنەوە لەئێران ڕابکەن، بەلام خـەرێك بـوو بەتـەواوی سـەری خۆیان تێبنێن بە هۆی ئەم کارەیانەوە[٧٥].

## تەوەرەی سێیەم

## تەهماسبی دووەم وپەیوەندییە دەرەکیەکانی ئێران لەگەڵ وڵاتانی دەوروبەر

### أ- ئێران و ڕوسیا:

سەرەتاکانی پەیوەندی ئێران وروسیا، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست، کە بایەخدان وگرنکیان بەناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دوور، لەچوارچێوەی بازرگانی ونایینی سەرچاوەی گرتبوو. بەڵام بایەخدانی روسیا بەئێران تەنها لەسەر ئەو شێوەو تەرزەی خۆی بەردەوام نەبوو، بەڵکو لەسەردەمی پەتروسی مەزن (١٦٨٢-١٧٢٥) کە سەردەمی ئەو لەمێژووی روسیادا بەخاڵی وەرچەرخان لەسەر ئاستی ناوخۆ ودەرەکی دادەنرێ. گۆڕانکارییەکی گەورەی بەخۆوەبینی و، سەرەتاکانی هەڵمەتی فروانخوازی دەستی پێکرد لەسەر حیسابی خاکی ئێران[٧٦]. ئەمەش لەو ڕوانگەوە کە (( دەریای قەزوین چارەنووسی ئەوەیە ببێتە دەریاچەیەکی ڕووسی))[٧٧]. چونکە دەستگرتن بەسەر ئەوێدا- ناوچە دەشتە بەرفراوانەکانی نێوان دەریای ڕەش ودەریای قەزوین- پانتاییەکی ستراتیژی پێدەبەخشێ و، دەتوانێ ڕێگایەکی بازرگانی لەڕێگای ئەو دەریاوە بنیادبنێ وکۆنترۆلی دەریای ڕەش بکات. لەوێشەوە بەئاسانی ئەو ئاواتەی هەیبوو کە گەیشتنە بەدەریای ناوەڕاست وئازادی دەریاوانی لەڕێگای تەنگەبەرەکانەوە بێنێتەدی. لەبەرئەوەی لەلای ئەو بەدەستهێنانی ئەم ئامانجە خاڵی جەوهەری بوو بۆ ئەوەی ڕووسیا ببێتە دەوڵەتێکی مەزن[٧٨].

لەم سەروبەندەدا ئێرانیش تەواو شپرزە وشلەژابوو، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی ڕووسیا بکەوێتە خۆ، کە دەمێکبوو خۆی بۆ مەلاسدابوو، لەم پێناوەشدا پلانێکی زیرەکانە داڕشت. هەر لەسەرەتاوە کاری لەسەر دانەنان بەشای ئەفغانی میر مەحمود کرد. پاشان هەر بەوەشەوە نەوەستا نوێنەرێکی خۆی نارده لای میرمەحمود تا قەرەبووی ئەو زەرەد وزیانە بازرگانیانە بۆ بکاتەوە کە لە ناوچەکانی باکوری ئێران لێیکەوتبوو. بەڵام

لەڕاستیدا ئەو وەڵامەی میر مەحمود بە نوێنەرەکە دا ((خۆتان بازرگانی خۆتان بپارێزن)) هەڵوێستێکی لای ئەوان دروست کرد کە ئەمانە لەڕووی سیاسیەوە تەواو بێ ستراتیژ ونەزانن[79]. بۆیە دەستبەجێ پەتروس لە سەرەتاکانی هاوینی (١٧٢٢) بەسەکردایەتی خۆی، هەڵمەتە سەربازییەکانی دەست پێکرد کە لەمێژوودا بەناوی (( هەڵمەتی یەکەمی فارسی یان هەڵمەتی پەتروس لەسەر ئێران)) ناسراوە[80]. پەتروس لەسەرووی ٢٢ هەزار شەڕەکەر لەڕێگای ڕووباری ڤۆلڤاوە دابەزی ودەستیگرت بەسەر شاری دەربەند لەسەر لێوارەکانی باکوری رۆژئاوای دەریای قەزوین[81].

ئنجا لەوێوە ڕوویکردە داغستان. بەڵام لێرەدا ڕووبەڕووی عوسمانییەکان بووە. ئەم فراوانخوازییە مەترسی لای عوسمانییەکان دروستکرد. بۆیە بەخێرای لەڕێگای نوێنەرێکەوە، کە گەیشتە بارەگای پەتروس ئاگادارکردنەوەی خۆی نارد. ئەمەش وای لەپەتروس کرد لەدەربەند بکشێتەوە بۆ ئەستراخان وگەڕایەوە بۆ پەتروسبۆرگ وژەنەراڵ ماتیوشکین لەجێی خۆی دانا[82]. ڕەنگە هۆکاری وەستانی ئەم هەڵمەتە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پەتروس دەیزانی سوپای عوسمانی بەهێزە. هاوکات سوپاکە تووشی گرفت بوو لەڕووی ئازوخەوە بەهۆی لەدەستدانی لەئەنجامی دوور ڕێگاکانی هەڵمەتەکەی[83]. بەڵام بەر لەوەی ناوچەکە بەجێ بهێڵی نوێنەری ناوچەی ڕەشت گەیشتە بارەگای ئەو تیایدا داوای یارمەتی لێکرد چونکە ئا لەو ساتەدا ئەفغانەکان لەشکریان ڕەوانەی سەر ئەو شارە کردبوو. بۆیە نوێنەرەکە بەدەستەوەدانی شارەکەی لەبەرامبەر یارمەتیدانیان دژی لەشکری ئەفغانی پێشنیارکرد. پەتروسیش پەلەی کردو ئەو شارەی گرت[84].

لەلایەکی تردوە تەهماسبی دووەمیش هەوڵیدا یارمەتی روسەکان بەدەست بهێنێ تا لەو ڕێگەیەوە بتوانی دەسەلاتی شەرعی خۆی بگەڕێنێتەوە و، ئەفغانەکان وتورکەکان — تازە پەلیان هاویشتبوو بۆ خاکی ئێران- لەولات دەربکات. ئەوەبوو

تەهماسب لەڕێگەی باڵوێزەکەیەوە ئیسماعیل بەگ توانی لەساڵی (١٧٢٣) ڕێککەوتننامەیەك لەپەترۆسبۆرگ لەگەڵ ڕووسیا ببەستێ. ڕێککەوتننامەکە چوار خاڵی لەخۆ دەگرت، کە ئەمانەن:

١. قەیسەری ڕووسیا یارمەتی سەربازی پێشکەش بە شای سەفەوی بکات دژی هێرشی ئەفغانیەکان وتورکەکان لەپێناو چەسپاندنی تەختی شاهانەی تەهماسب.

٢. شا لەبەرامبەر ئەمەدا دەبێ دان بنێ بە ناوچەکانی دەربەند وباکۆ وناوچەکانی دەوروبەری بۆ رووسیا بەشێوەکی هەمیشەیی، هەروەك وازبهێنێ لەهەریەك لەشارەکانی گەیلان ومازەندەران و ئەستەر ئاباد.

٣. شا بەڵێن دەدا، ئەو سوپایانەی رووسیا کە دێنە خاکی ئێرانەوە بە ئازوخە کۆمەکیان بکات.

٤. بنیادنانی ((پەیوەندییەکی دۆستانەی جێگر)) لەنێوان هەردوو وڵاتدا. گرەنتیکردنی ئازادی بازرگانی و هاوتوچوو بۆ هاوڵاتیانی هەردوو لا[٨٤].

ئەم کردارەی پەتروس وەك لەپێشووتر باسمان کرد، دەوڵەتی عوسمانی وروژاند، هاوکات ناوچەی سوونی شیروان هانایان برد بۆ عوسمانییەکان. عوسمانیەکانیش ئەمەیان بەهەلزانی وپێشڕەویان کرد لەدوو تەوەرە[٨٦] (ئەرمینیا- بەغدا). ئەمەش جۆرێك لەبارگرژی وتەنگژەی لەنێوان هەردوو دەوڵەت دروستکرد کە خەریك بوو بکەونە شەڕەو، بەڵام شەڕ ڕووینەدا ودەرەنجام بەپێناوی نوێنەری فەرەنسی لەقوستەنتین. لە٢٤ی ژانیوەری (١٧٢٤) ڕێککەوتننامەیەکیان مۆرکرد تیایدا باکوری ڕۆژئاوای ئیرانیان بەگوێرەی ئەم بەرژەوەندییەکانی خۆیان دابەشکرد[٨٧].

روسیا لەم ڕێککەوتننامەیەدا دەستیگرت بەسەر لێوارەکانی دەریای قەزوین وگەیلان ومازەندەران وباکوری ڕێژگەی باشووری ڕووباری ئاراس. هەروەها لەڕێککەوتننامەی نێوبراودا هاتووە داندەنرێ بە شا تەهماسب دا گەر بەم

ڕێکەوتننامەیە ڕازی بوو. لەوەش سەیر تر هەردووکیان ڕێکەوتن لەبەرامبەر هەموو هەوڵێکی تەهماسب بوەستنەوە گەر ویستی ئەم ناوچانەیان لەژێر دەست دەربهێنێ[88].
وێڕای ئەوەی لەم ڕێککەوتنامەیەدا داننرا بەشا تەهماسبی دووەم وەك شای ئێران، ناوچەکانی ڕۆژئاوای دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانی دەستی بەسەردا گرتبوو بەناوچەی دەسەلاتی تەهماسب نەژمارکرا[89].

ئەم بارودۆخە هەر بەو شێوەیە بەردەوام نەبوو، ئەمەش لەئاکامی ئەو گۆڕانکارییەی لەسەر گۆڕەپانی ئێراندا هاتە گۆڕ، ئەوەبوو ئێرانیەکان توانیان ئەفغانیەکان دەربکەن — حوکمڕانی سەفەوییەکان بەهۆی تەهماسبی دووەم وبەیارمەتی نادرخان بوژایەوە واتە: هاتنەسەر حوکمی تەهماسبی دووەم لەساڵی ١٧٢٩- ودەستیان والآ بکەن بۆ ئەوەی هەر یەك لەدەوڵەتی عوسمانی وڕووسی لەخاکەکەیان بکەنەدەرەوە. هاوکات خودی ڕووسەکانیش ئامادەباشیان هەبوو، کە ئەم ناوچانە بدەنەوە دەستی ئێرانیەکان. ئەم پێشهاتە لەبەرژەوەندی ئێرانیەکان دا. بەمە جۆرێك لەنزیك بوونە ڕوویدا ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆر فاکتەر لەوانە دەرکەوتنی نادرخان ومردنی قەیسەری ڕووس پەتروسی مەزن لەساڵی (١٧٢٥)، سەرباری ئەوەی کە ڕووسەکان دەیانویست بچنە جەنگیکەوە لەگەڵ عوسمانیەکان دا، ئەمەش پێویستی بە دۆستایەتی لەگەڵ ئێرانیەکاندا هەبوو[90] وێڕای خراپی بارودۆخی سەربازەکانی لەئێران.
بەلأم لەپاڵ ئەمەشدا نارەزووی نەدەکرد عوسمانیەکان دەسەلاتیان لەو ناوچەیەدا هەبێ.
بۆیە لەساڵی(١٧٣٢) هەریەك لەنوێنەرانی ئێرانی وڕووسی لە شاری ڕەشت ڕێککەوتننامەیەکیان گریدا بە گوێرەی ئەم ڕێککەوتننامەیە تەواوی ناوچەکانی باشووری شاری سالیان و ڕووباری کورای گەڕاندەوە بۆ خاکی ئێران، بەلأم ناوچەکانی دەربەند وباکۆیان بەستەوە بەکاتەوە. کە لەڕێککەوتنێکی تردا پاش ئەوەی نادرشا شماخی وداغستانی گرت ئەو دوو ویلایەتەی لەساڵی (١٧٣٤) خستەوە ژێر دەسەلاتی ئێران- ئەمە دەکەوێتە دەرەوەی توێژینەوەکەمان-[91].

بەم شێوەیە تێبینی دەکەین پەیوەندییەکانی نێوان ئێران وروسیا لەسەردەمی تەهماسبی دووەمدا لەسەر یەك ئاراستە گوزەری نەکردووە ئەمەش بەهۆی شوێنگەی تەهماسب کە جارێك لەدەرەوەی دەسەلآت وبێهێزیدا بوو لەلایەك ولەلایەکی تریش کاتی هاتە سەر دەسەلآت لەپاڵ کەسایەتیەکی بەهێزی وەك نادرخاندا. هەروەها پەیوەستە بەو گۆڕانکارییەیی لەسەر گۆڕەپانی روسیا ڕوویدا وەك مردنی پەترۆسی مەزن وخۆسازکردن بۆ جەنگ دژی عوسمانی.

## ب- ئێران ودەوڵەتی عوسمانی:

ئەو بارودۆخەی لەسەرتاپای خاکی ئێران هاتە گۆڕێ وەك داگیرکردنی لەلای ئەفغانیەکان ولێهەڵوەشانی حکومەتی سەفەوی جۆرێك لە پەشێوی وئاڵۆزی لەناو ئێراندا هێنایەکایەوە. ئەمە بووە جێ تەماعی ئێرانیەکان وبارودۆخەکەیان بەهەلزانی لەو ڕێگایەوە لەسەر حیسابی خاکی ئێران فراوانخوازی بکەن تا قەرەبووی ئەو زیانانەی خۆیان بکەنەوە کە لەئەوروپای (پەیماننامەی پاسارۆڤیتز) لێیانکەوتبوو لەلایەك[٩٢] و، ولەلایەکی تریش پێشڕەویکردنی هێزەکانی ڕوسیا زیاتر پاڵی نا بەدەوڵەتی عوسمانییەوە تا دەست بخاتە ناوکاروباری ئێرانەوە[٩٣].

دەوڵەتی عوسمانی کاتێ بینی خەریکە روسەکان پاش ئەوەی ناوچەی دەربەندیان گرت خەریکن بەرەو ناوچەی شماکا- شماخی- هەنگاو دەنێن، دەستبەجێ نوێنەرەکەی خۆیان ناردە لای ڕووسیا وئاگاداریکردنەوە لەوەی هەر پێشڕەوییەکی هێزەکانیان لەسەر حیسابی خاکی ئێران ماناى ڕاگەیاندنی جەنگە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، بۆیە بەپەلە ڕووسەکان هەڵمەتەکانی لەبەر چەند هۆیەك وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا وەستاند[٩٤]. دەتوانین بڵێین ئەمە هەنگاوە سەرتاکانی دەستێوەردانی عوسمانییە لەخاکی ئێران.

ئەو پێشهاتانەی دواتر گۆڕانکاری زۆری دورستکرد ئەوەبوو ناوچەی شێروانە کە ناوچەیەکی سوونی مەزهەبە وجیاوازە لەگەڵ ناوچەکانی تر دوای ئەوەی کەوتە دەستی رووسەکان بەهۆی خراپی مامەڵەوە هانایان برد بۆ دەوڵەتی عوسمانی، ئەمەش بووە هۆی پەشێوەی لەنێوان هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی وورووسی، دەرەنجام وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا لەساڵی (١٧٢٤) بەهۆی نوێنەری فەرەنسا لەئەستەنبول لەسەر مێزی گفتوگۆ دانیشتن تا خاکی ئێران دابەش بکەن لەنێوان خۆیان داورێککەوتنامەیەکیان بەست[٩٥] بەگوێرەی ئەم رێککەوتننامەیە هەردوو دەوڵەت بڕیاریاندا دان بنێن بەپاشایەتی تەهماسبی دووەم لەسەر خاکی ئێران - بەندەکانی تری ئەم رێککەوتننامەیەمان لە پەیوەندی ئێرانی رووسی دا نووسیومانە- هەروەها ناوچەکانی رۆژئاوای بکەوێتە ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانی[٩٦]. واتە: ئازەربێجان و کوردستانی ئێران و تا شاری هەمەدان[٩٧]

دەوڵەتی عوسمانیش هەر دوای ئەم رێککەوتننامەیە دەستی کرد بەهەنگاوەکانی خۆی بۆ دەستگرتن بەسەر ئەو ناوچانە، کە بەگوێرەی رێککەوتنامەی ئەستەنبول(١٧٢٤) دەستی کەوتبوو. هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەدوو بەرەی جیاوازەوە هەنگاویان نا؛ لەباکورەوە بەناو ئەرمینیا بەرەو نەخچەوان وئەوی تریان لەبەغداوە بەرەو کرماشان[٩٨]. هەر زوو عوسمانییەکان لەبەرەی باکوور، کشانیان لەناو خاکی ئێرانەوە بەرەو یەریڤان تووشی شکستی هات، بەشێوەیەك دوای شەڕێکی خوێناوی وئامادەسازییەکی مەزن توانیان دەست بەسەر تەبرێز دا بگرن. هەرچی بەرەی بەغدایە، هەر یەك لەحەسەن پاشای والی بەغداد وکورەکەی ئەحمەد پاشا لەدوای خۆی توانیان لەرێگەی کرماشان ناوچەکانی رۆژئاوای ئێران تا هەمەدان بگرن . ئەمە لەسەردەمی مەحمود شای ئەفغانییەکان ولەسەردەمی ئەشرەفی جێنشینیشی بەهەمان شێوە بەردەوام بوو تا ئەشرەف رێکەوتننامەیەکی لەگەڵ دا عوسمانییەکان گرێدا

لەساڵی (١٧٢٧) بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەیە دانی نا بەو هەموو ئەو ناوچانەی دەستی بەسەرداگرتبوو[٩٩]. شیاوی باسە کوردەکان لەپاڵ عوسمانییەکان بەشدارییەکی سەرەکیان لەگەڵ عوسمانییەکان کرد وبەشێکی گرنگی سوپاکەیان پێکدەهێنا[١٠٠].

پاش ئەوەی شا تەهماسبی دووەم بەهاوکاری نادرخان توانی ئەفغانەکان لەسەرتەخت بهێنێتە خوارەوە ولەئێران دەریان بکات وپایتەخت بخاتەوەژێر دەستی تەهماسبەوە و، لەساڵی (١٧٢٩) حکومەتی سەفەوی ببوژێنێتەوە. دەستەبەجێ هەوڵیدا ئەو ناوچانەی، کە لەرۆژئاوای ئێران بەهۆی ئەو ڕێککەوتننامەی ئەشرەف لەگەڵ عوسمانییەکان گرێدابوو لەساڵی (١٧٢٧) کەوتبووە دەست عوسمانییەکان، بخاتەوە ژێر سەروەری ئێرانییەکان[١٠١]، بۆ ئەمە نوێنەری ئێرانی بەناوی رەزا قلیخان شامیلۆ کە لەلایەن نادرخانەوە راسپێرابوو گەیشتە ئەستەمبول بۆ ئەوەی ئەو پەیامەی نادرخان بگەیەنێتە دەوڵەتی عوسمانی کە تیایدا داوای ئەو ناوچانەی رۆژئاوای دەکردەوە، هەرچەندە وەڵامی دەوڵەتی عوسمانی وەڵامێکی باش نەبوو[١٠٢]، بەڵام نادرخان هەر زوو چاوەڕێ ئەوەی نەکرد کێشەکە لەڕێگای دبلۆماسییەوە چارەسەربکرێ چونکە ئەو وا باوەڕیبوو، کە تەنها شێوازێك دەوڵەتی عوسمانی تێبگات هێزە[١٠٣]. بۆیە لەساڵی(١٧٣٠) نادرخان بەشێوەیەکی کتوپڕی هەلیکوتایەسەر هەمەدان، هێزی عوسمانیەکانی بەسەرۆکایەتی عوسمان پاشا تێکشکاند، ئەمیش لەلای خۆیەوە ناچاربوو پاشەکشە بکات وبچێتە پاڵ هێزەکانی تەیور پاشای وان، نادرخان توانی لەم هەنگاوەیەدا هەردوو پاشا بکوژێ وبچێتە شار هەمەدانەوە[١٠٤]. لەم بێنەو بەردەدا تەنها لەناوچەی کرماشان هێزەکانی نادر شکستیان خوارد، بەڵام هەر زوو نادر ئەو ناوچەیەشی خستەوە ژێر ڕکێفی خۆی. بەوشێوەیە تەواوی هێزەکانی عوسمانی لەلورستان وکوردستان دەرکرد وبەرەو بەغدا ڕاوینان. دواتر نادرخان بەرەو ناوچەکانی ئازەربێجان چوو، تا لەو کاتەدا هەواڵی ڕاپەڕینی ئەفغانەکانی پێگەیشت ئەویش،

ئازەربێجان بەجێ هێشت وبۆ دامرکاندنەوەی ئەفغانەکان بەڕێکەوت، بـەڵام لـەم کـات وساتانەدا تەهماسبی دووەم بەسەرۆکایەتی هێزیکی ١٨٠٠٠هەزار کەسی بەرەو تەبرێز چوو لەجەنگێکدا لە نزیـك ئـیروان شکـستی بەعوسمانیـەکان دا کـە نزیکـەی ٩٠٠٠ هەزارکەسی لێکوشتن و بەمەش ئیروانی گەمارۆ دا[١٠٥].

عوسمانییەکان پاش ئەو شکـستەی ڕووبـەڕوویان بوویـەوە، بەپەلـە داوای لـە والی بەغدا ئەحمەد پاشا و والی دیاربەکر مستەفا پاشا و والی سیواس حسێن پاشـا لەگـەڵ هەر یەك لە موتەسەریفی مەرعەش و موسڵ، تا بەسەرکردایەتی والی بەغدا پەلاماری هێزەکانی ئێرانی بدەن، بەڵام مردنی سوڵتان ئەحمەد وهاتنی سوڵتان مەحمودی سـێیەم بۆ سەرتەخت، هێزەکانی بۆ ماوەی سـێ مـانگ لەشـارەزوور دواخـست تـا فـەرمانی شەڕیان پێڕابگەیەنێ، ئـەوەبوو فـەرمان بەهێرشـکردن گەیـشت و، شـاری کرماشـانی بەئاسانی گرتەوە و، خانەبەگی میری بابانی سەرۆکایەتی سوپای گرتـە دەسـت وبـەرەو هەمەدان کەوتەڕێ، بەڵام ئەو شارە زۆر ئازایانـە جـەنگا[١٠٦] لـەم لاشـەوە تەهماسـب دوای ئەوەی زانی کە وا عەلی سەرلەشکری ئیروان و ئەحمەدپاشا بەرەو ناوچەی عێراقی عەجەم دەچن، خێرا بەرەو هەمەدان پێـشڕەویکرد[١٠٧]، ئنجـا ئـەحمـەد پاشـا لەسـاڵی (١٧٣١) لەکوریجان — قوریجان- لەگـەڵ هێزەکـانی تەهماسـبی دووەم ڕووبـەڕووبوەوە. دەرەنجام تێك وپێکیدا وشکستی بەهێزەکانی شای ئێرانی دا، شای ئێرانیش ناچار بـوو هەڵبێت[١٠٨]، کە لەم شەڕەدا سوپای خانەبەگ ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو هەر لەبەر ئـەم ئازایەتی ولێهاتوویەیی پێشانی دا خەلاتکرا وتوانی جێی خۆی بکاتەوە لـە دڵـی والی بەغدا دا[١٠٩].

ئەم شکـستە تەهماسبی دووەمـی ناچـارکرد لەسـاڵی (١٧٣١) ڕێککەوتنامەیـەك لەگەڵ عوسمانییەکان ببەسـتێ تـا لـەو ڕێگەیـەوە دەمکوتیـان بکـات، بناغـەی ئـەم ڕێککەوتننامەیە بەم شێوەی خوارەوە بوو:

١. دانانی ڕووباری ئاراس بە سنوری فارس.

٢. شا وازیهێنا لە جانجا وتەفلیس ونەریڤان ونەخشاوەند -نەخچەوان- هەمەدان ولارستان- لوڕستان- و هەموو ئەوناوچانەی پێشتر دەوڵەتی عوسمانی چاوی لێکردبوو.

٣. ئاسانکاری بازرگانی و ئالوگۆڕی بالێوز لەنێوان هەردوو پایتەخدا ئەستانە وئەسفەهان. هاوکات لەنێو خودی پەیماننامەکەدا ئاماژەی بەدیلەکانی ئێرانی نەکرد[١١٠].

نادرخان هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد بەم پەیماننامەیە ڕازی نەبوو، دەستبەجێ ئەم پەیماننامەی کردە بیانوو تا تەهماسبی دووەم لەسەر دەسەڵات لابەرێت و لەجێ ئەو منداڵە شیرخۆرەکەی عەباس سێ یەم دابنێ[١١١]. ڕووداوەکان هەر بەم شێوەی خۆی نەوەستایەوە ونادر توانی هەموو ئەوناوچانە و تەنانەت هەڕەشە بکات لەبەغداد وگەمارۆی موسڵیشی بدات — بەڵام ئەمە دەکەوێتە دەرەوەی توێژینەوەکەمان بۆیە باسی ناکەین-.

## ئەنجام

توێژەر، لەخوێندنەوەی بۆ ڕوداوەکان وژیانی تەهماسبی دووەم گەیشتۆتە ئەم دەرەنجامانەی خوارەوە:

١. ماوەی داگیرکاری ئەفغانەکان، بەقۆناغێکی گرنگ لەمێژووی ئێران دادەنرێ. هەم لەڕووی خوێندنەوەمان بۆ لاوازی وداڕووخانی دەوڵەتی سەفەوی کە لەماوەیەدا ئەم دەوڵەتە تەنها بەناو حوکمی دەکرد وشاکانی هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو، هەم لەو ڕووەوەی هێزێکی بچووکی ژێر دەستەی دەوڵەتەکە کەئەفغانەکان توانیان دەست بەسەر خاکی ئێران دابگرن.

٢. تەهماسبی دووەم کە یەکێکە لەشاکانی سەفەوی، کەسایەتیەکی لاواز وهەرزەکار ولێنەوەشا و بێ جەوهەر بوو، ماوەی حوکمڕانیەکەش لەماوەی لاوازی وخراپی باری سیاسی دەوڵەتی سەفەوی هەژمار دەکرێ، ئەمەش لەدوو ڕوانگەوە بەجوانی دەردەکەوێ؛ لەنەبوونی ڕاوتگبیرێکی جدی وکەوتنەژێر کاریگەری کەسانی دەوروبەری ونەبوونی دەسەلات و، لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ نادرخان وپێگە وشوێنی ئەو لەنێو ڕووداوەکاندا.

٣. لەم ماوەیەدا هەریەك لەدەوڵەتی عوسمانی وروسیای قەیسەری بەهۆی نەبوونی حوکمڕانێکی بەهیز بەشێکی خاکی ئێرانیان داگیرکرد وخستیانە پاڵ خاکی خۆیانەوە، لەبەرامبەر ئەمەدا حوکمڕانێکی وەك تەهماسب نەك هەر هیچی پێنەکرا بەڵکو لەچوارچێوەی ئەو پەیماننامانەی لەگەڵ ئەواندا گرێیدا دانی نا بەو داگیرکارییەوە وجۆرێك لەفەرمی وقانونیبوونی پێ بەخشین.

٤. پەیوەندییەکانی نێوان تەهماسبی دووەم ونادرشا بە پەیوەندی بەرژەوەندیخوازی وخراپ دەناسرێ چونکە تەهماسب لەلای خۆیەوە هەوڵیدەدا پارێزگاری لەدەسەلاتی خۆی بکات لەتەماع وچاوچنۆکی نادر، هەرچی نادرە دەسەلاتگرتنەدەستی کردبووە ئامانجی خۆی وهەوڵەکانی خۆشی بۆ ئەمە تەرخانکردبووە وکاری لەسەر دەکرد بەتایبەتی لەبەردەم کەسایەتیەکی لاوازی وەك تەهماسبدا. دواجاریش سەرکەوتنی بەدەست هێنا

٥. ئەفغانەکان بەچاوی پڕمەترسییەوە بەتایبەتی لەسەردەمی حوکمڕانی ئەشرەفی ئەفغانی دا دەیانڕوانیە هەوڵەکانی تەهماسب بۆ کۆکردنەوەی هێز لەدەوری خۆی لەپێناو گەڕانەوەی دەسەلات، هەربۆیە زۆر هەوڵیاندا لەناوی ببەن بەلام سەرکەوتوو نەبوون.

٦. ململانێ لەسەر دەسەلأت بەیەك لەسیما وخەسڵەتەكانی ئەم ماوەیە دادەنرێ. ئەمەش لەهەوڵەكانی تەهماسبی دووەم بۆ سەندنەوەی دەسەلأت لەئەفغانەكان، كە خۆی بەمیراتگری ڕەوای دەوڵەتی سەفەوی دەزانی لەلایەك و، لەلایەكی تریش لەهەوڵەكانی نادر بۆ سەندنی دەسەلأت لە تەهماسبی دووەم دەردەكەوێ.

٧. ناوچە كوردییەكان، لەم ماوەیەدا ناوچەی ململانێ بوون لەنێوان هیزە داگیركەرەكان خاكی ئێران و هەروەها دەسەلأتی تەهماسب وداگیركاری ئەفغانەكان. وە تاكی كورد وهێزی كوردیش لەم ماوەیەدا ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە لەئاراستەكردنی ڕووداوەكان چونكە ئەفغانەكان و عوسمانیەكان وتەهماسبیش كوردیان بەكاردەهێنا بەڕادەیەك ژمارەیەكی بەرچاو لەكورد لە هێزەكانیاندا بوونی هەبوو.

## سەرچاوەكان


**أ- بەزمانی كوردییەكان:**

١. توفیق قەفتان، مێژووی حوكمدارانی بابان لەقەلاچوالان تا دروست كردنی شاری سولەیمانی ١٠٨٠-١١٩٩ كۆچی، ١٦٦٩-١٧٨٤ زایین، چاپخانەی سلمان الاعظمی، بەغدا ١٩٦٩.

٢. راجر سێڤری، ئێرانی سەردەمی سەفەوی، و: سەلاحەددین ئاشتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ٢٠٠٦.

٣. محەمەد ئەمین زەكی، خولاصەیەكی تاریخی كورد وكوردستان، چاپ وئۆفیستی دەزگای سەردەم، سلێمانی ٢٠٠٠.

**ب- بەزمانی عەرەبی:**

٤. ابراهيم خليل احمد و خليل علي مراد (دكتور)، ايران وتركيا دراسة في التاريخ الحديث والمعاصر، دار الكتب للطباعة و النشر، الموصل ١٩٩٢.

٥. حسن كريم جاف (دكتور)، الوجيز في التاريخ ايران دراسة في التاريخ السياسي، ج٣، دار ئاراس للطباعة والنشر، اربيل- كوردستان العراق، ٢٠٠٦.

٦. حسين ناظم بيگ، تاريخ الامارة البابانية، ت: شكور ومحمد الملا عبدالكريم المدرس، ط١، مؤسسة موكرياني للطباعة و النشر، اربيل-كوردستان، ٢٠٠١.

٧. ستيفن هيمسلي لونگريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث كتاب يبحث عن تاريخ العراق في العصور المظلمة، ت: جعفر الخياط، بغداد ١٩٦٨.

٨. سعدى عثمان حسين (دكتور)، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، مكتبة سوران كوردستان اربيل، ٢٠٠٦.

٩. عبدالعزيز سليمان نوار (دكتور)، تاريخ الشعوب الاسلامية في العصر الحديث، ج١، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت ١٩٧١.

١٠. كمال المظهر احمد (دكتور)، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، الامانة العامة للثقافة والشباب، بغداد، ١٩٨٥.

**ج- بەزمانی فارسی:**

١١. پژوهش در دانشگاه كمبريج، تاريخ ايران دوره صفويان، مترجم: دكتر يعقوب اژند، جامی تهران ١٣٨٠.

١٢. حسن پيرنيا، تاريخ ايران از اغاز تا انقراج قاجاريه، چ٨، چاپخانەی حيدری ١٣٧٦.

١٣. رضا شعبانی (دكتر)، تاريخ اجتماعی ايران در عصر افشاريه، جلد اول، نشر قومس – تاران.

### د- بەزمانی ئینگلیزی:

١٤. EDWARD G. BROWNE, A LITERARY HISTORY OF PERSIA Modern Times (١٥٠٠-١٩٢٤), VOL. ٢, CAMBRIDGE UNIVERSITY PRESS, ١٩٦٩.

١٥. H.J.KISSING & others, THE MUSLIM WORLD A HISTORICAL SURVEYP- THE LAST GREAT MUSLIM EMPIRES, Pa. III, LEIDEN, E.J.BRILL, NETHERLANDS, ١٩٦٩.

---

(١) ابراهيم خليل احمد، خليل على مراد، ايران وتركيا دراسة في التاريخ الحديث والمعاصر، دار الكتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٢، ص٤٥.

(٢) حسن كريم جاف، الوجيز في تاريخ ايران دراسة في التاريخ السياسي، ج٣، ط٢، مطبعة مؤسسة ناراس-اربيل، كوردستان، ٢٠٠٨، ص٥٣.

(٣) راجر سێیڤری، ئێرانی سەردەمی سەفەوی، و: سەلاحەددین ئاشتی، چاپخانەی شڤان- بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٣٧٠.

(٤) پژوهش از دانشگاه کمبریج، تاریخ ایران دوره صفویان، مترجم: دکتر یعقوب اژند، چ٢، جامی- تهران، ١٣٨٠، ص١٢٦.

(٥) كمال المظهر احمد، دراسات في تاريخ ايران الحديث والمعاصر، الامانة العامة للثقافة و الشباب، بغداد، ١٩٨٥، ص١٦.

(٦) رضا شعباني، تاريخ اجتماعى ايران در عصر افشاريه، ج١، نشر قومس، تهران، ص١١.

(٧) عبدالعزيز سليمان نوار، تاريخ الشعوب الاسلامية في العصر الحديث، ج١، دار النهضة العربية للطباعة والنشر- بيروت، لبنان، ١٩٧١، ص ص٩٦،٩٧ ؛ حسن كريم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٥٨.

(٨) زۆربەی سەرچاوەکان ئەم ماوەیە بەم شێوە ناوی دەبەن ودەیناسێنن، بۆ نموونە:

- EDWARD G. BROWNE, A LITERARY HISTORY OF PERSIA Modern Times (١٥٠٠-١٩٢٤), VOL. ٢, CAMBRIDGE UNIVERSITY PRESS, ١٩٦٩, PP. ١٢٢ ff.

- ابراهيم خليل احمد و خليل علي مراد، المصدر السابق، ص٤٥ والصفحات التاليه.

(٩) المصدر السابق، ص٤٥، ٤٦.

(١٠) راجر سێیڤری، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧١.

(١١) لەنێو ئەفغانستان دا لەم سەروبەندەدا دوو هۆزی گەورە لەنێو گۆڕەپانەکە ڕۆڵیان دەدی ئەویش هەردوو هۆزی دورانی Durrani کە دواتر ئەبدالی یان پێدەوترا لەناوچەکانی ڕۆژهەلات بوون و هۆزی غیلزی Ghilzai لەبەشەکانی باشوور نیشتەجێ بوون. لەکاتی سولتان حوسێن دا ناوچە قەندەهار سەر دەوڵەتی سەفەوی بوو وە خەلکەکە بەردەوام سکالایان دەکرد بەلام وەلامگویەك نەبوو بۆ داوکانیان. پاشتر دەرەنجامی ئەمە میر وەیس دەستی گرت بەسەر قەندەهار و ڕاپەڕی وهەرچەند سولتان حوسێن، خەسرەوی نارد تا تێکیان بشکێنێ بەلام هیچ ئەنجامی بەدەست نەهێناو بەپێچەوانەوە زۆر بەگەرم وتوندوتیژی ئەفغانیەکان بەرگریان کرد وخەسرەویشیان کوشت پاش میر وەیس، عەبدوللای برای دەستی گرت بەسەر دەسەلاتدا و میراتگرەکەی کە مەحمودی برازی بوو لەسەر دەسەلات لابرد بەلام ئەمە زۆر نەخایاند کە مەحمود، عەبدوللای مامی لابرد لەسەر دەسەلات و جێگای گرتەوە بەهەمان شێوە هۆزەکانی ئەبدالیش توانیان دەسەلات خۆیان بەسەر هرات بسەپێنن وسەربەخۆی خۆیان بەدەست بهێنن. بۆ زانیاری لەسەر ئەم گۆڕانکاریانە نێو گۆڕەپانی ئەفغانستان بروانە: د.عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص ٨٣-٩٠.

(١٢) حسن پيرنيا، تاريخ ايران از اغاز تا انقراض قاجاريه، چ٨، چاپخانەی حيدری، ١٣٧٦، ص ٧٠٤، ٧٠٥.

(١٣) ابراهيم خليل احمد وخليل علي مراد، المصدر السابق، ص٤٧.

(١٤) د.حسن كريم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٥٨، ٥٩.

(١٥) رضا شعبانی، مصدر پێشین، ج١، ص٢٢.

(١٦) H.J.KISSING & others, THE MUSLIM WORLD A HISTORICAL SURVEYP- THE LAST GREAT MUSLIM EMPIRES, Pa. III, LEIDEN, E.J.BRILL, NETHERLANDS, ١٩٦٩, P. ١٩٩.

(١٧) EDWARD G. BROWNE, Op.cit. p.١٣٠.

(١٨) حسن پیرنیا، مصدر پیّشین، چ٨، ص٧٠٤.

(١٩) د.حسن کریم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٨٢

(٢٠) ئەشرەف لە سالآنی ١٧٢٦-١٧٢٧ شەڕی لەگەڵ عوسمانیەکان ڕاگەیاند، هەرچەند لەم شەڕانەدا هەندێ سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام دواجار بەهۆی بەهێزبوونی تەهماسبەوە کە ئەو مەترسی بۆ سەر خۆی دەزانی ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ عوسمانیەکان بەست لەسالی ١٧٢٧ بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیە عوسمانیەکان دەبێ لەلای خۆیانەوە پارێزگاری کاروانەکانی حاجیان بۆ مەککەو عێراق بکەن ودەست لەکاروباری یەکتر وەرنەدەن وهەڵهاتوو وتاوانکاری یەکتر وەرنەگرن: گرنگترین بەندەکانی ئەم پەیماننامەیەش ئەمانەبوون: ١- دەوڵەتی عوسمانی ناوچەکانی پێشوو لەژێر دەسەلآت بهێنێتەوە. ٢- حەوێزە بکەوێتە نێو چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی. ٣- ئەشرەف دانینا بە سوڵتانی عوسمانی بەوەی خەلیفەی موسڵمانانە وسوڵتانیش لەلای خۆیەوە دانینا بەئەشرەف وەك شای ئێران.
بۆ زانیاری زیاتر بروانە: د.عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١٠٤-١٠٧.

(٢١) پژوهش از دانشگاه کمبریج، مصدر پیّشین، ص١٣٧.

H.J.KISSING & others, OP.Cit. p.٢١٠

(٢٢) راجر سیێڤری، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٥.

(٢٣) رضا شعبانی، مصدر پیّشین، ج١، ص٣٠.

(٢٤) ابراهیم خلیل احمد وخلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٤٦.

(٢٥) رضا شعبانی، مصدر پیّشین، ج١، ص٣٠.

(٢٦) EDWARD G. BROWN, Op.Cit. PP. ١٢٩, ١٣٠.

(٢٧) پژوهش از دانشگاه کمبریج، مصدر پیّشین، ص١٣٧

(٢٨) رضا شعبانی، مصدر پیّشین، ج١، ص٣٠.

EDWARD G. BROWN, Op.Cit. P, ١٣٠

(٢٩) پژوهش از دانشگاه کمبریج، مصدر پیّشین، ص١٣٨.

(٣٠) ابراهیم خلیل احمد وخلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٤٨. لەتەوەرەی سێ یەمدا بەتێروتەسەلی باسی پەیوەندی عوسمانی وروسیەکان لەگەڵ تەهماسب دەکەین.

(٣١) رضا شعبانی، مصدر پیّشین، ج١، ص٣٢.

(٣٢) همان کتاب، ص٢٢

(٣٣) راجر سیێڤری، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٩، ٣٨٠. لەتەوەرەی دووەمدا باس لەپەیوەندی نێوان نادرخان وتەهماسب دەکەین.

(٣٤) ابراهیم خلیل احمد وخلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٥٠.

(٣٥) H.J.KISSING & others, OP.Cit. p.٢٠٢.

(٣٦) پژوهش از دانشگاه کمبریج، مصدر پێشین، ص١٣٨.

(٣٧) حسن پیرنیا، مصدر پێشین، ص ٧١٧، ٧١٨.

(٣٨) رضا شعباني، مصدر پێشین، ج١، ص٦١، ٦٢.

(٣٩) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٨٦.

(٤٠) رضا شعباني، مصدر پێشین ، ج١، ص ٦٢.

(٤١) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٨٦؛ رضا شعباني، مصدر پێشین ، ج١، ص٦٢.

(٤٢) همان کتاب، ص٦٣.

(٤٣) پژوهش از دانشگاه کمبریج، مصدر پێشین، ص١٣٨" حسن پیرنیا، مصدر پێشین ، ص٧١٨.

(٤٤) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٨٦

(٤٥) H.J.KISSING & others, Op.Cit. p. ٢٠٢.

(٤٦) حسن پیرنیا، مصدر پێشین ، ص٧٠٨.

(٤٧) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٨٢.

(٤٨) توفیق قەفتان، مێژووی حوکمدارانی بابان لەقەڵاچوالان تا دروست کردنی شاری سولەیمانی ١٠٨٠-١١٩٩ کوچی/ ١٦٦٩-١٧٨٤ زایین، چاپخانەی سلمان الاعظمی بەغدا، ١٩٦٩، ل٤٤.

(٤٩) حسین ناظم بیگ، تاریخ الامارة البابانیة، ت: شکور ومحمد الملا عبدالکریم المدرس، ط١، مؤسسة موکریانی للطباعة و النشر، اربیل-کوردستان، ٢٠٠١، ص٨٧.

(٥٠) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٨٣.

(٥١) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١١٥.

(٥٢) رضا شعبانی، مصدر پێشین، ج١، ص٥١-٥٢.

(٥٣) ابراهیم خلیل احمد وخلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٤٩.

(٥٤) حسین کریم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٨٣.

(٥٥) رضا شعبانی، مصدر پێشین، ج١، ص٥٣

(٥٦) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١١٥.

(٥٧) حسن پیرنیا، مصدر پێشین، ص٧١٣.
(٥٨) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١١٨.
(٥٩) توفیق قەفتان، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤.
(٦٠) ابراهیم خلیل احمد وخلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٥٠.
(٦١) حسن پیرنیا، مصدر پێشین، ص٧١٨.
(٦٢)
(٦٣) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص٩٤
(٦٤) رضا شعبانی، مصدر ثێشین، ج١، ص٢٢، ٣٢.
(٦٥) ابراهیم خلیل احمد وخلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٤٨
(٦٦) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٨٣-٨٤.
(٦٧) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١١٦
(٦٨) رضا شعبانی، مصدر پێشین، ج١، ص٢٥
(٦٩) حسن کریم جاف، المصدر السابق، ج٣، ص٨٤.
(٧٠) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١١٨
(٧١) رضا شعبانی، مصدر پێشین، ج١، ص٢٧
(٧٢) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١١٨.
(٧٣) Edward.G.Brown. Op.Cit. P.١٣٣.
(٧٤) حسن پیرنیا، مصدر پێشین، ص٧١٥
(٧٥) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١١٨.
(٧٦) کمال مظهر، المصدر السابق، صص ١٣-١٧.
(٧٧) H.J.KISSING, Op.Cit, p.٢٠٠.
(٧٨) ابراهیم خلیل احمد وخلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٤٨.
(٧٩) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص٩٩.
(٨٠) کمال مظهر، المصدر السابق، ص١٨.
(٨١) ابراهیم خلیل احمد وخلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٤٨.
(٨٢) کمال مظهر، المصدر السابق، ص١٨-١٩.
(٨٣) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١٠٠.

(٨٤) حسن پيرنيا، مصدر پێشين، ص٧٠٧.

(٨٥) كمال مظهر، المصدر السابق، ص١٩.

(٨٦) لەپەیوەندی نێوان دەوڵەتی عوسمانی وئێران. بەتێروتەسەلی باس لەهەڵمەتەکانی عوسمانی دەکەین.

(٨٧) H.J.KISSING. Op.Cit. p٢٠٠.

(٨٨) عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١٠١.

(٨٩) H.J.KISSING. Op.Cit. p٢٠٠

(٩٠) كمال مظهر، المصدر السابق، ص٢٠-٢١.

(٩١) حسن پيرنيا، مصدر پێشين، ص٧١٥.

(٩٢) ابراهيم خليل احمد وخليل علي مراد، المصدر السابق، ص٤٨

(٩٣) كمال مظهر، المصدر السابق، ص١٩.

(٩٤) عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١٠٠.

(٩٥) H.J.KISSING, Op.Cit, P. ٢٠٠.

(٩٦) عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١٠١.

(٩٧) كمال مظهر، المصدر السابق، ص٢٠.

(٩٨) H.J.KISSING, Op.Cit, P. ٢٠٠.

(٩٩) عبدالعزيز سليمان نوار، المصدر السابق، ج١، صص١٠١ والصفحات التالية.

(١٠٠) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بەشداری کورد لەو هەڵمەتانەی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر خاکی ئێران لەماوەی فەرمانڕەوایی ئەفغانیدا وهەروەها شەڕی نێوان نەشرەفی ئەفغانی ودەوڵەتی عوسمانی بڕوانە: محەمەد ئەمین زەکی، خولاصەیەکی تاریخی کورد وکوردستان، چاپ ونۆفسێتی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ١٤٦-١٤٧؛ سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، اطروحة الدكتورا( المنشورة)، مكتبة سۆران، اربيل ٢٠٠٦، صص٢٩٣-٣٠١.

(١٠١) محەمەد ئەمین زەکی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٨.

(١٠٢) حسن پيرنيا، مصدر پێشين، ص٧١٦.

(١٠٣) سعدي عثمان حسين، المصدر السابق، ص٣٠٢.

(١٠٤) ستيفن هيمسلي لونگريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث كتاب يبحث عن تاريخ العراق في العصور المظلمة، تر: جعفر الخياط، ط٤، بغداد ١٩٦٨، ص١٦٨.

(١٠٥) حسن پیرنیا، مصدر پێشین، ص٧١٦-٧١٧.

(١٠٦) توفیق قەفتان، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥-٤٦

(١٠٧) حسن پیرنیا، مصدر پێشین، ص٧١٧.

(١٠٨) محەمەد ئەمین زەكی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٩

(١٠٩) توفیق قەفتان، سەرچاوەی پێشوو، ٤٦-٤٧.

(١١٠) عبدالعزیز سلیمان نوار، المصدر السابق، ج١، ص١١٩-١٢٠.

(١١١) ابراهیم خلیل احمد وخلیل علی مراد، المصدر السابق، ص٥٠.

# دۆزی کورد لەجەنگی یەکەمی جیهانی یەوە تاکو پەیماننامەی لۆزان (١٩١٤-١٩٢٣ز)

سلیمان صنعان سعید

دەروازە:

بارودۆخی سیاسی کوردستان لە نێوان سالانی (١٩٠٨–١٩١٤)

بارودۆخی سیاسی کوردستان لەسەرەتای سەدەی بیستەم تاکو هەلگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی ،بەقۆناغێکی گرنگدا تێپەر بوو ،کەوتە ژێر کاریگەری ئەو گۆرانە سیاسیانەی کەلەهەریەکە لەدەولەتی عوسمانی و فارسیدا روویاندا.ئەم گۆرانکاریانە بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ گۆرەپانی سیاسی کوردستانیشی گرتەوە ،بەتایبەتی سەرهەلدانی بیری نەتەوایەتی وهۆشیاربوونەوەی گەلانی ژێر قەلەمرەوی ئەم دوو ئیمپراتۆریەتە،کوردیش بەشێك بوو لەم نەتەوانەوهەستی نیشتیمانپەروەری لەلایەن رۆشنبیران وسیاستمەدارانی کورد لەسەرەتای چەکەرەکردن وگەشەکردندابوو.

(١)دیارترینیشیان نەوەکانی هەردووبنەمالەی شەمزینان وبەدرخانیەکان کەرۆلێکی دیارو بەرچاویان هەبووە لەم قۆناغەی بزاڤی سیاسی و رۆشنبیری و نەتەوایەتی لەکوردستانداو بەدامەزرێنەری بیری نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەری دادەنرێن.(٢) ئەم چینە بیرمەندو سیاسەتمەدارانە لەهەولی دۆزینەوەی دەرفەتێك بوون بۆ بەئەنجام گەیاندنی کاری سیاسی کەبتوانن لەگەلَ قۆناغە نوێیەکە هەلَبکەن ، بۆ ئەم مەبەستەش هەولَیان دەدا بۆخۆ نزیك خستنەوەیان

لەداوا کارانی چاکسازی لەهەریەکە لەدەولەتی عوسمانی و فارسیدا بۆ ئەوەی لەم رێگەیەوە بتوانن چالاکی سیاسی و سەربەخۆی کوردستان بەدەست بهێنن.(٣)

سەبارەت بەدەولەتی عوسمانی ئەوا بەهۆی لاوازی دەسەلاتی سولتان عەبدول حەمیدی دووەم(١٨٧٦-١٩٠٨) لەسالی ١٩٠٨ز دا کودەتایەکی لەدژی ئەنجام درا لەلایەن کۆمەلەی (اتحاد وترقی )وتوانیان سولتان ناچاربکەن یاسایەك دەربارەی چاکسازی دەستوری مۆربکات ،بەپێی ئەم دەستورە هەموو نەتەوەکانی ژێر قەلەمرەوی دەولەتی عوسمانی بۆیان هەبوو بەمافی سیاسی و روشنبیری ونەتەوایەتیان شاد بن ،دواتریش سولتان ناچار کرا کەواز لەدەسەلات بهێنێت.(٤) کوردەکانیش لەکۆمەلەی ئیتحادو تەرەقی وکودەتای دەستوریدا رۆلێکی دیارو بەرچاویان هەبووە ،بۆ ئەم مەبەستەش دووکەسایەتی کورد لەسەرکردایەتی کۆمەلەکەدا بوون ،ئەوانیش (عەبدوللا جەودەت) و (ئیسحاق سکوتی) بوون.(٥) هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرانی کورد کە نیشتەجێی شارەکانیئەوروپابوون پەیوەندیان بەم کۆمەلەیەوەکردو بەشداری چالاکیەکانیان کرد بەئامانجی سوود وەرگرتن لەو دەرفەتەی کەبەهۆی چاکسازی دەستووری لەدەولەتی عوسمانی و لابردنی سولتان عبدول حەمیدی دووەم،کە کۆمەلەکە هەولی بۆ دەداو دێتە پێش سوودی لێ وەربگرن وبتوانن بەمافە بنەرەتیەکانیان شادبن.(٦) لەو مافانەش بەشداری نەتەوەکان بەبێ جیاوازی لە دەسەلاتداو مافی خوێندن بەزمانی دایك،ئازادی کاری سیاسی ورۆژنامەگەری،دامەزراندنی کۆمەلەویانەی رۆشنبیری،سەرەرای ئەمانەش دەولەتی عوسمانی بگۆرن بەدەولەتێکی فیدرالی وهەموو گەلانی ئیمبراتۆریەت لە حکومەتەکەدا بەشداربن.(٧)

پاش کودەتای ١٩٠٨ز وەرکرتنی دەسەلآت لەلایەن ئیتحادیەکان ئەوا کوردێك بەشداری لەحکومەتەکەدا کردو (عەبدول قادر شەمزینی )دەکرێت بەسەرۆکی ئەنجومەنی پیران.(٨) هەروەها یەکەم کۆمەڵەی سیاسی کوردی لەئەستەمبولّ بەناوی (کۆمەڵەی تەعالی وتەرەقی کوردستان) دادەمەزرێت،لەلایەن (ئەمین عالی) و(شەریف پاشا)وچەند کەسایەتیەکی تر،دواتریش رۆژنامەیەکیان بەناوی (کورد تەعاونی تەرەقی جەمعیەت غەزەتسی) دەرکرد، قوتابخانەیەکی کوردی لەئەستەمبولّ کرایەوە،ئەم کۆمەڵەیە چەند یانەیەکیان لەشارە جیاجیاکانی کوردستان کردەوە و ژمارەی ئەندامانی رۆژدوای رۆژ لەزیادبوندابوون.(٩) ئەم کۆمەڵەیەلقێکی تری هەبوو کە کۆمەڵەیەکی رۆشنبیری بوو بەناوی کۆمەڵەی (نەشری مەعارفی کوردی)کە ئامانجیان بلّاوکردنەوەی خوێندەواری بوولە نێو مندالّانی کورد لەرێگەی کردنەوەی قوتابخانەو دەرکردنی رۆژنامەیەك بەناوی (کـــورد) کە گرنگی بەلایەنی رۆشنبیری وبلّاوکردنەوەی زانیاری دەدا ،هەروەها ئەرکی لەچاپدانی کتێبی بەزمانی کوردی لە ئەستۆ گرتبوو.(١٠)

یەکێکی تر لەو کۆمەلانە کۆمەڵەی (هــیڤی ) بوو لەسالّی ١٩١٢ز لە ئەستەمبوولّ دامەزرا،لەلایەن کۆمەلّێك رۆشنبیری کورد،دوای ئەوەی ئیتحادیەکان (کۆمەڵەی نەشری مەعارفی کورد)یان داخست ،ئەم کۆمەڵەیە بەسەرۆکایەتی (ممدوح سەلیم)بوو ،لەرێگەی بلّاوکراوەکانیەوە بەتایبەتی (رۆژی کورد )هەروەها (هەتاوی کورد) گرنگی زۆریان دەدا بەبلّاوکردنەوەی زانست وزانیاری،رێنوسی کوردی ،بانگەوازی بۆ یەکریزی گەلی کورد ،بایەخدان بەدیارخستنی کێشەکانی کورد ،هەروەها یارمەتی پێشکەش بەو قوتابیانە دەکرد کەلەناوچەکانی تر روویان لە ئەستەمبوولّ دەکرد بۆ مەبەستی خوێندن .(١١)

لەشاری (خووی)کوردستانی ئێران کومەڵەیەکی رۆشنبیری بەناوی (جیهانزانی ) لەلایەن (عەبدول رەزاق بەدرخان )لەساڵی ١٩١٢ز دامەزرا ،کەئامانجی بلاوکردنەوەی خوێندەواری وکردنەوەی قوتابخانە بوو لەشارەکانی کوردستان ودەرکردنی بلاوکراوەیەك بەناوی (کـوردستان) لەشاری (وورمـێ) هەروەها کۆمەڵەکە هەوڵیانانی ئەلف و بیّ ی کوردی دەدا .(١٢) سەرەرای ئەمە چەند بلاوکراوەیەك لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان دەردەچوون کە ئامانجیان وشیارکردنەوەی گەلی کوردبوو لەورووداو پێشهاتانەی لەناوچەکەدا روودەدەن ،هەوڵدان بۆ بەرزکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی تاکی کورد وئاشنابوونی لەگەڵ ئەو واقعە نوێیەی هاتۆتە پێش .لەوبلاوکراوانەش رۆژنامەی (تەعاون وتەرەقی) ،(خۆرهەلات) ،(کوردستان) کەبەهەردووزمانی کوردی وتورکی دەردەچوون ،هەروەها چەندان کەسایەتی سیاسی ورۆشنبیری کورد لەتاراوگە گەرانەوە بۆ ئەستەمبووڵ(١٣) لەلایەکی ترەوە ژمارەیەك لەسەرکردەکانی کورد لەساڵی ١٩١٢ز لەئەستەمبووڵ کۆبونەوەیەکیان ئەنجامدا بۆ هەموو کۆمەڵەو رێخراوە سیاسیەکانی کورد ،لەسەرئەوە رێك کەوتن کەپێویستە یەك پارتی کوردی هەبێت تاکو نوێنەرایەتی هەموو کورد بکات ،لەم کۆبونەوەیەدا ئامانجە سیاسی وبنەما سەرەکییەکان وچۆنیەتی کرداری یەکگرتنەوەکەیان دەست نیشان کرد .(١٤)

ئیتحادوتەرەقی لەکاتی هاتنیان بۆ سەردەسەلات پروپاگندەی ئەوەیان دەکرد کەیەکسانی ودادپەروەری وئازادی لەنێونەتەوەکانی دەوەڵەتی عوسمانی بلاودەکەنەوە ،بەلام پاش ماوەیەکی کورت پاشگەزبونەوە لەوبەلێنانە ،سەرەتاش هەڵسان بەقەدەغەکردن وداخستنی کۆمەڵەورێخراوە کوردیەکان ودەستگیرکردن ودوورخستنەوەی رۆشنبیرانی کورد بۆ دوورە وولات .(١٥) ئەم سیاسەتەش پیادەکرا دوای ئەوەی کودەتاچیەکان پیّ ی خۆیان لەدەسەلات

قایم کرد،پاشان دەستیان کرد بەپیادەکردنی سیاسەتی رەگەزپەرستی وبەتورك کردنی نەتەوەکانی تری ناو دەوڵەتی عوسمانی ،ئەم سیاسەتەش بەشێوازێکی زۆرە ملێ لەسەر خەڵکەکە چەسپێنرا.(١٦) ئەمەش شتێکی چاوەروانکراوبوو لەئیتحادیەکان چونکە کۆمەڵەکەیان لەسەر ئایدولوژیایەکی تورکیزم وناسیونالیزم دامەزرابوو، ئەگەرچی لەسەرەتادا ئاشکرایان نەکردبوو،بەلأم ئەمەیان بەکردەوە سەلماند ،هەروەها بیری سیاسی ئیتحادیەکان کەوتبووە ژێر کاریگەری بیرو ئەزموونی جیهانی رۆژئاوا بەتایبەتی لەمەسەلەی رەگەزپەرستیدا ،لەم روانگەیەوە کاریگەری ناسیونالزمی فەرەنسی ویەهوودی لەسەر تورکەکان راستیەکی حاشا هەڵنەگرە .(١٧)

ئەم بارودۆخە لەلایەن کوردەکانەوە جێگەی قبولکردن نەبوو، چونکە هۆکاری بەشداری کوردەکان لەکودەتای ئیتحادیەکان ویارمەتی دانیان بۆئەوە بووەکەدەرفەتێکی گونجاویان بۆ برەخسێت وبەئازادی بژین، بەلأم کاتێك بۆیان روون بووەوە ئەمدەسەلأتە نوێ یە زۆر سەرسەختره بەرامبەر بەمافە نەتەوەیەکانی کورد بۆیە هەوڵی راپەرین وشۆرشیان ئەنجامدا .(١٨)

بەهۆی ئەو کۆمەڵ وریخراوانەی لەو ماوەکورتەدا (١٩٠٨-١٩١٤ز) دا سەریان هەڵدا بوو کاریگەریەکی گەورەی کردبووە سەر هۆشیارکردنەوەو بەرزکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی لەلایەن کوردەکان، بۆیە لەم ماوەیەدا چەندان شۆرش وراپەرینی جەماوەری لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان سەریان هەلدا . ( ١٩ )

لەم شۆرشانەش شۆرشی ئیبراهیم پاشای میللی کە لە دەسەلاتی تورکە لاوەکان یاخی بوونی خۆی راگەیاند بوو مەترسیەکی گەورەی لەسەر دەسەلاتی نوێی دەولەت دروست کرد چونکە پاش ماوەیەکی کورتی گرتنە دەسەلات لە لایەن تورکە لاوەکان ئەم شۆرشە سەری هەڵداو مەترسی ئەوەیان لەلا دروست بوو کە

سەرکەوتنی شۆرشەکە ببێتە هۆی لاوازکردنی پێگەو دەسەلآتیان لەناوچەکە .(٢٠) لەگەڵ ئەوەی کە ئیبراهیم پاشا لەشۆرشەکەیدا دروشمی نەتەوەایەتی بەرز نەکردبووە بەلآم هۆیەکی گرنگی هۆشیارکردنەوەی دانیشتوانی ناوچەکە بوو بەرامبەر بەخراپی پیادەکردنی سیاسەتی دەوڵەت بەرامبەر بەکورد ،بۆیە زۆربەتوندی لەلایەن دەسەلآتەوە بەرپەرچی شۆرشەکە درایەوەو سەرکوت کرا.(٢١)

بەهەمان شێوە لەبەتلیس شۆرشێکی تر لەلایەن (مەلا سەلیمی بەتلیسی)لەساڵی(١٩١٣–١٩١٤ن)دژبەکاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی سەری هەڵدا ، بەلآم دەوڵەت بۆ رێگە گرتن لەتەشەنەکردنی شۆرشەکە هێرشێکی بەربلآویان کردە سەرناوچەکەو شۆرشەکەیان دامرکاندەوە.(٢٢) سەرکردەی شۆرش دوای ئەوەی پەنای بردە بەر بالیوزخانەی روسیا ،دەستگیردەکرێت ولەگۆرەپانی شاری بەتلیس لەسێدارە دەدرێت .(٢٣)

لەکوردستانی عێراقیش شۆرشێك بەرێبەرایەتی (شێخ عەبدول سەلامی بارزانی ) دژ بەدەسەلآتدارانی ناوچەکەو ئەوزولّم وستەمەی والی موسل (سلیمان نەزیف) بەناوی دەوڵەتی عوسمانی لەکوردەکانی ئەو ناوچەیەی دەکرد ،شۆرشێکی بەرپاکرد.(٢٤) لەمیانەی شۆرشەکەدا چەند داخوازیەکی پێشکەش بەدەسەلآتدارانی عوسمانی کرد بۆباشترکردنی ژیانی ئیداری وکۆمەلآیەتی ناوچەکە، بەلآم تورکە لاوەکان کەپەیرەوی بیرێکی شۆڤینیان دەکرد دژبەداخوازیەکانی شێخ عەبدول سەلام وەستان وهێرشی سەرناوچەکەیان کرد ،توانیان شۆرشەکە دابمرکێنەوە و شێخ عەبدول سەلام بەپیلانێکی خیانەتکارانە دەستگیربکەن ورەوانەی مـوسڵی بکەن، پاش دادگایەکی گاڵتە جارانە حوکمی لەسێدارەدانیان بۆ دەرکرد ولە ١٤–١٢–١٩١٤ز حوکمەکەیان بەجێ گەیاند .(٢٥)

لەپاڵ ئەم شۆرشانە کوردستانی ئێرانیش بێ بەش نەبووە لەخەباتکردن، بەهۆی خراپی بارودۆخی سیاسی وکۆمەڵایەتی لەم وولاتەدا ،کوردەکان هەرهەولێکی شۆرشگێری یان راپەرین لەناوچەکانی دەولەتی عوسمانی سەریان هەلدابوایە ئەوا لەلایەن کوردەکانی ئێران وهۆزەکانی کوردستان ،یارمەتی وهاوکاریان پێشکەش بەشۆرشەکەدەکرد،ئەم هاوکاریەش بەدیاردەکەوێت لەپەیوەندی نێوان شێخ عەبدول سەلام وسمکۆ ئاغای شکاك هەروەها عەبدول رەزاق بەدرخان و سمکۆ وهۆزەکانی تر .(٢٦)

هۆکاری ئەم راپەرین وشۆرشانە دەگەرێتەوە بۆ ئەو بارودۆخە ناهەموارەی بەهۆی حوکمی ئیتحادیەکان بەسەر کوردستاندا هاتبوو بەتایبەتی لەرووی کارگێری وئابووری ،رێژەی باجەکان لەسەر جوتیاران بەرێژەیەکی زۆر بەرزکرابونەوە هەروەها بەرپرسەکان لەناوچە کوردنشینەکان ئیدارەیەکی خراپیان پەیرەودەکرد ،بەرتیل وەرگرتن وگەندەلی ئیداری هەمووبەرپرسەکانی گرتبووە،حکومەت دەستی کردبوووبەگرتن ورواەدونانی ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەو رۆشنبیرانی کوردو دەستگرتن بەسەر زەوی جوتیاران ،ئەم هۆکارانە پالنەری بەهێزبوون بۆسەرهەلدانی ئەوشۆرشانەی ئامارەمان بۆکردن.(٢٧)

ئەو پەشێوی و ئالۆزیەی بەسەر دەولەتی عوسمانی وئێرانیدا هاتبوو لەماوەی سالأنی (١٩٠٨-١٩١٤)ز ) بەشێوەیەکی گشتی و بەسەرکوردستاندا بەتایبەتی بەهۆی ناسەقامگیری سیاسی لەلایەك و دەولەمەندی ناوچەکە لەرووی ئابووری یەوە وشوێنی ستراتیجی کوردستان لەلایەکی ترەوە ئەوا ولآتە زلهێزەکان هەرلەزووەوە چاویان بریبوە ناوچەکە ،هەریەکە لەلای خۆیەوە دەیویست دۆخەکە بۆئامانج وبەرژەوەندی خۆی یەکلای بکاتەوە .(٢٨)

رووسەکان بەمەبەستی گەیشتن بەئاوە گەرمەکان لەهەوڵی لاوازکردنی دەسەلاّتی عوسمانی وئێرانی دابوون ،هەروەها بۆدەستگرتن بەسەر ڕێگە بازرگانیەکان کەناوچەکانی کوردستانی دەگرتەوە پشتگیری شۆرشەکانی کوردیان دەکرد بۆئەوەی دەستیان بگاتە ناوچەکە .(٢٩) هەرچی بەریتانیا بوو بۆپاراستنی ڕێگا بازرگانیەکانی خۆی وداگیرگەکانی لەهیندو کەنداوی عەرەبی وەبۆ لاوازکردنی دەسەلاّتی رووسەکان لەناوچەکانی قەفقاس ،گرنگی تایبەتی دەدا بەکوردستان ،سەرەرای بونی نەوت لەناوچەکە بەگرنگترین هۆکاری چاوتێبرینی بەریتانیا دادەنرێت .(٣٠)

ئەڵمانیا بەهۆی پەیوەندی باشیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی ،هانی عوسمانیەکانی دەدا بۆ هێرشکردنە سەرکوردستانی ئێران ،تاکو لەپال سوپای عوسمانی بتوانێت بەرژەوەندیەکانی خۆی لەکوردستانی ئێراندا دەستەبەربکات.(٣١) بۆیە دەبینین کوردستان لەم ماوەیەدا(١٩٠٨-١٩١٤) ببووە شانۆیەك کەووڵاتە زلهێزەکان هەریەکە لەلای خۆیەوە هەوڵی دەدا هێزەکانی خۆی تێدا نما یش بکات و شوێن پێی خۆی تێدا قایم بکات وخێروبێری ناوچەکە بۆبەرژەوەندی خۆی بەکاربهێنێت .(٣٢)

دەوڵەتی عوسمانیش لەلای خۆیەوە بەهەرجۆرێك بێت هەندێك لەهۆزەکوردیەکانی بۆلای خۆی راکیشکردبوو بۆئەوەی وەکو هێزێکی یەدەك بەکاریان بهێنێت بۆلێدانی جولانەوە جوداخوازیەکانی کوردو نەتەوەکانی ناتورك .(٣٣) ئامانجی دەوڵەتی عوسمانیش لەم هێزانە کەبە(سوپای حەمیدی) ناسرابوون بۆئەوە بووە کەمتمانەی سەرکردەی هۆزەکان بۆ لای خۆی کێش بکات بەتایبەتی سەرکردە ئاینیەکان بۆ ئەوەی لەپال دەولەتی عوسمانی شەڕبکەن دژی نەیارەکانیان..(٣٤) جگە لەمە سولّتان ئەوهێزەی

وەکوبەربەستێك بەکاردەهێنا بەرامبەر بەفراوان خوازیەکانی رووسیا لەسەرسنورەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەکاتی بەرپابونی هەرشەرێکی چاوەروانکراو لەگەڵ دەوڵەتی رووسیا ،سەرەرای ئەمە سوڵتان دەیویست لەرێگەی گرینگی دان بەم هێزە سەرنجی کوردەکان بەتایبەتی هۆزەنەیارەکانی دەوڵەت بۆخۆی رابکێشێت وپەیوەندی نێوان کورد وسەڵتەنەتی عوسمانی بەهێزبکات .(٣٥) سەرەرای ئەمانەی ئامارەمان بۆ کرد ئەوا هەوڵی ئەو ولآتانە لەئارادابوو بۆ دروست کردنی ناکۆکی وململانێ لەنێوان کوردو ئەرمەن بۆئەوەی ناوچەکە زیاتر ناسەقامگیربێت وبتوانن بەئاسانی دەست بخەنە ناوکاروباری ناوچەکە بەبیانووی پارێزگاری کردن لەمەسیحیەکان .(٣٦)

## بەشی یەکەم : دۆزی کورد لەسالآنی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤–١٩١٨ز)

### تەوەرەی یەکەم : جەنگی یەکەمی جیهانی وکاریگەری لەسەر کوردستان

جەنگی جیهانی لەحوزەیرانی ١٩١٤ز هەڵگیرسا وبەردەوامبوو تاساڵی ١٩١٨ز.(٣٧) ئەم جەنگە یەکێك بوو لەرووداوە پرکارەساتەکان لەمێژووی مرۆڤایەتیدا کەتیایدا ٧٥ملیون ئەفسەروسەرباز بەشداریان تێداکرد،نزیکەی ١٠ملیون کەس بوونە قوربانی سەرەرای برینداربون وپەککەوتە بوونی نزیکەی ٢٠ملیون،ئەمەجگەلەوەی کەچەندان کەس بەهۆی برسێتی وقات وقری گیانیان لەدەستدا، ئەم جەنگە کاریگەری لەسەر بارودۆخی ئابوری وکۆمەلآیەتیو سیاسی هەموو ولآتانی جیهانی کرد.(٣٨) کوردستان بەهۆی شوێنە

ستراتیژیەکەی وبوونی سەرچاوەیەکی زۆری کانزای خاو وسروشتی ببووە شوێنی چاوتێبرین وجێگەی ململانێ لەنێوان وولاتە داگیرکەرو زلهێزەکان ،هەریەکە لەبەریتانیا، فەرەنسا،روسیا ،ئەڵمانی هەوڵی بەدەست هێنان وقایم کردنی شوێن پێی خویان دەدا بەئامانجی دەستگرتن بەسەر سامانە سروشتی یەکەی لەم پێناوەشدا هەموو ئامرازێکیان بەکاردەهێنا بۆ کۆنترۆلکردنی ناوچەکە.(٣٩) بوونی نەوتیش لەکوردستان هۆکارێکی سەرەکی وبنەرەتی بوو بۆ چاوتێبرینی وولاتە شەروانەکان چونکە گرنگی نەوت لەوەدابوو کەقەرەبووی زیانەکانی شەری پێ دەکرایەوە هەروەها وەکو کەرەستەیەکی بنەرەتیش بوو بۆ بەرەوپێش چوونی پیشەسازی وولاتە شەروانەکان .(٤٠) ئەمەش پاڵی بەوولاتە رکابەرەکانەوە نا زووبکەونە خۆ وسیخورەکانیان بەناوچەکەدا بلاوبکەنەوە بۆکۆکردنەوەی زانیاری لەپێناوی ئاسانکردنی کارەکانیان لەپاشەرۆژێکی نزیکدا ،چونکە کوردستان وەك شارێگا وابوو دەتوانرا لێرەوە پەلبهاوێژن بۆناوچەکانی تر.(٤١) بۆیەدەبینین لەسەرەتای سەرهەلدانی جەنگ ودەست پێ کردنی یەکەم پریشکی ئاگری شەر لە٢٨ی حوزەیرانی١٩١٤ز وهەلمەتە سەربازیەکان ولەشکرکێشیەکان ،دوڵەتی عوسمانی دەچێتە پاڵ ئەڵمانیاو وولاتانی میحور دژبە هاوپەیمانان ،ئیتر لێرەوە کوردستان دەبێتە شانۆیەکی گەورەی وولاتە شەروانەکان .(٤٢) بەچونی دەوڵەتی عوسمانی بۆنێو شەرەوە بەواتای ئەوەبوو کەهەموو بەشێکی خاکی ئەم وولاتە چاوەروانکراوبوو بکەوێتە بەرئامانجی هێرشەکانی هاوپەیمانان،کوردستانیش بەشێکی ستراتیژی وگرنگی دەوڵەتی عوسمانی پێك دەهێنا بۆیە ئاسایی بووبکەوێتە بەرئەم هێرشانە ،بۆیە لازاریف دەڵێت :((یەکەم پریشکی شەری جیهانی لەکوردستانەوە دەستی پێ کردووە.))(٤٣)

هەرلەسەرەتای دەست پێكردنی جەنگی جیهانی هریەكە لەتوركەكان ورووسەكان هەوڵیان داوە كوردەكان بەلای خۆیاندا رابكێشن ولەجەنگدا بۆمەبەستی خۆیان بەكاربهێنن ،تورك پاڵنەری ئاینی واتە موسلمانبوونی كوردیان وەكو هاندەرێك بەكاردەهێنا بۆئەوەی والەكوردەكان بكات بەشداری شەربكەن لەریزی سوپای عوسمانی .(٤٤) بانگەوازی جیهاد كەدەوڵەتی عوسمانی بەرزی كردبووە بۆبەرگریكردن لەئیسلام هەستی كوردەكانی بزواند وچوون بەپیل بانگەوازەكە ،ئەگەرچی ئەم دروشمە بریقەدارە هیچ بەرژەوەندیەكی نەتەوەیی كوردی نەدەهێنایەدی .(٤٥) بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لەسەرەتادا ژمارەیەكی زۆری كوردەكان لەسەر داخوازی سەرۆك هۆزەكانیان بەرەو بەرەكانی شەری بردن ،لەوانەش كوردەكانی عێراق بەرێبەرایەتی (شێخ مەحمود)وهۆزەكانی جاف لەشەری (شوعـێبە) دژی ئینگلیزەكان وەستان وبەرگریان لەدەوڵەتی عوسمانی كرد، هەروەها كوردەكانی ئێران وتوركیا دژی فراوانخوازیەكانی رووسیا بەرگریان لەعوسمانیەكان كرد ،هۆكاری بەشداری كردنەكەش لەپاڵ لایەنی ئاینی بۆئەوە دەگەرایەوە كەدەولەتی عوسمانی بەڵێنی حوكمی زاتی بەكوردەكان دابوو.(٤٦) لەبەرامبەریشدا رووسەكان بەهەمان شێوە بەڵێنیان بەكورد دابوو كەسەربەخۆییان پێ ببەخشن بەومەرجەی كەدژی رووسەكان شەرنەكەن لەبەرەی قەفقاس ،ئەم هەنگاوەش یارمەتی دەربوو كەرووسەكان لەم بەرەیەدا پێشرەوی بكەن وبەسەر توركەكاندا زاڵبن .(٤٧)

سەبارت بەو هێزە كوردی یانەی لەپاڵ سوپای عوسمانی بەشداری شەریان كردووە پێكهاتبوون لەسوپای (نۆ–٩) كەبارەگایەكەی لەئەرزەرووم بوو، سوپای (دە –١٠) بارەگایەكەی لەسێواس ،سوپای (یانزدە و دوانزدە )كەبارەگایان لە موسڵ بوون ،سەرەرای ١٣٥ كەتیبەی سواری وئەو هێزە سنوریانەی كەلەنێوان

دەوڵەتی عوسمانی و رووسیادا هەبوون ،کورد بەشێکی سەرەکی ئەم هێزانەی پێك دەهێنا وئەرکی ئامادەکردنی ئەم هێزانە لەئەستۆی کوردەکاندابووە .(٤٨) دەوڵەتی عوسمانی لەپاڵ سیاسەتی بانگەوازی جیهاد ،سەربازی پیّ کردنی زۆرەملێی لەناوچە کوردیەکاندا پەیرەودەکرد ،هەروەکو جەلیلی جەلیلی دەڵێت :"هەڵسوکەوتی سەربازە تورکەکان لەناوچە کوردیەکان بەشێوەیەك بووە هەروەکو هێزێکی داگیرکەر مامەڵەیان لەگەڵ خەڵکەکە کردووە .(٤٩)

لەسەرەتای دەست پێکردنی جەنگ کوردستانی رۆژهەلاّت کەوتە بەرشالاّوی هێزەکانی عوسمانی وئەڵمانی وورووسی ،ئەگەرچی ئێران بیّ لایەنی خۆی لەشەرەکەدا راگەیاندبوو ،بەلام بەهۆی گرنگی وستراتیژی ناوچەکە ئەوا ببووە شوێنی چاوتێبرینی هێزە شەروانەکان ،هەر بۆیەش کوردستانی رۆژهەلاّت گەورەترین قوربانی شەری نێوان زلهێزەکان بووە .(٥٠) رووسەکان لەکانوونی دووەمی ١٩١٥ز بەسوپایەکی گەورەوە هێرشیان کردە سەرشاری تەورێزو ئورمیەو شنۆ وسابلاغ ودەستیان بەسەرداگرتن ولەشوباتی ١٩١٦زدەستیان بەسەر کرماشاندا گرت،لەپاڵ هێزەکانی رووسیا تیپە چەکدارە ئەرمەنەکانیش بەشداریان لەم داگیرکردنەدا کردو وێرانکاریەکی بیّ وێنەیان ئەنجامدا دژی ناوچەکوردیەکان .(٥١) لەگەڵ ئەمەشدا رووسەکان هەوڵیان دەدا کەهۆزەکوردیەکان وکەسایەتیە ناودارەکانی کورد بهێنە پاڵ خۆیان تاکو بتوانن شوێنیان لەئێراندا قایم بکەن ،بۆئەم مەبەستەش پەیوەندیان بە(سمکۆ ئاغای شکاك )کرد چونکە کەسایەتیەکی ناوداری ناوچەکەبوو ،کوردێکی زۆر پالپشتیان لەسمکۆ دەکرد بۆیە رووسەکان بەهەر نرخێك بێت ئەم کارەیان بەئەنجام گەیاند .(٥٢)

هەرچی کوردستانی باکورە ئەوا بەهۆی شوێنە جوگرافیەکەی کەکەوتبووە سەرسنوری عوسمانی ورووسیا وەهێڵی بەیەکگەیشتنی هەردوو سوپایەکەبوو کەلە (سری قەمیش) لەباکور درێژدەبووەوە تاکو خانەقین لەباشور ،لەئەرزەرووەمەوە لەرۆژهەلآت تاکو ئەرزنجان لەرۆژئاوا ،ئەم ناوچە فراوانە بەردەوام جێگەی پێگدادانی ئەم دووهێزە بوو،ئەودەست وئەودەستی پێ دەکرا لەماوەی جەنگەکەدا.(٥٣)هۆکاری ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوە کاتێك رووسەکان هێرشیان کردە سەر ئەرزەرووم و وان هێزە ئەرمەنیەکان پالپشتیان لەرووسەکان کرد ،کاولکاریەکی زۆریان لەناوچەکەدا ئەنجامدا ،بۆیە کوردەکان ناچاربوون بۆ بەرگریکردن لەدەست درێژیەکانی ئەرمەن بەرگری لەناوچەکانی خۆیان بکەن ،هەرچەندە بریاروابوو کە کوردەکان دژی رووسەکان نەوەستن بەلآم کاتێك سوپای رووسیا هاوکاری ئەرمەنەکانی کرد ،ناچاربوون بچنە پاڵ عوسمانیەکان .(٥٤)

سەبارەت بەکوردستانی باشور ئەوا لەژێر دەسەلآتی عوسمانیەکاندا بوو،کاتێك هێزەکانی هاوپەیمانان گەیشتنە ناوچەکە ئەوا شەری جیهانی لەکۆتاییەکاندا بوو،جگە لەناوچەی رەواندوز کەلەلایەن رووسەکان داگیرکرابوو،ئەوابەشێوەیەکی گشتی کەمتر کەوتە بەر زەرەر وزیانەکانی جەنگ .(٥٥)پاش داگیرکردنی بغداد لەلایەن ئینگلیزەکان لەئاداری ١٩١٧ز ئەواهێزەکانیان بەرەو باکور کشان،شاری خانەقین وپاشان کفریان داگیرکرد،لەنیسانی ١٩١٨زگەیشتنە شاری کەرکوك ،ئینگلیزەکان هەوڵیان دەدا لەرێگەی پەیوەندی کردن بەسەرکردەکوردەکان بۆئەوەی بێ بەرگریکردن بێنە ناوچەکە،بۆئەم مەبەستەش پەیوەندیان بەشێخ مەحمود کردو رێککەوتنیان لەگەڵ کرد بۆئەوەی گەلی کورد لەناوچەکە حوکمی خۆی بەرێوە ببات وحکومەتێك لەسلێمانی بۆ شێخ مەحمود پێك

بهێنرێت.(٥٦)ئەم سیاسەتەی بەریتانیاش بۆپێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی تەکتیکێکی کاتی بوو بۆدەربازبوون لەو بارەپەشێوەی کەلەبەرەکانی تری شەردا لەرووی سیاسی وسەربازی لەسەری بوو،بۆیە بۆدەربازبوون لەم بارەنالەبارە هەولیدا کەلەبەرەکانی عێراق هیچ جۆرە بەرگریەك لەبەرامبەری نەکرێ وبتوانێت ئامانجەکانی بەدەست بهێنێت ،هەربۆیەش دوای ماوەیەکی کورت بەریتانیا لەوبەڵێنانەی پاشگەزبووەوە کەبەکوردی دابوو.(٥٧)

بەم شێوەیە تێکرای کوردستان لەماوەی چوارساڵی شەردا (١٩١٤-١٩١٨) لەلایەن سوپای هاوپەیمانانەوە داگیرکرا

کوردستانی باشور لەلایەن بەریتانیا ،کوردستانی باکور بەشێکی لەژێر دەسەلاتی رووسیا وبەشێکی لەژێردەسەلاتی عوسمانی ،هەرچی کوردستانی رۆژهەلاتە ئەوا لەنێوان رووسیاو بەریتانیادا دابەشکرابوو ،ئەم هێزەداگیرکەرانە هەریەکەو لەلای خۆیەوە بێ بەزەیانە کەوتبووە گیانی خەلکەکەو کاولکردنی ناوچەکە .(٥٨)

ئەگەر بێت باس لەو زیان ومالوێرانیەی کەبەسەر کوردستاندا هاتووە لەماوەی جەنگەکەدا بکەین ،دەبینین کەلەهەموو بەرەکانی تری شەردا زیاتر توشی کاولکاری بووە ،بەهەزاران هاولاتی کورد بوونەتە قوربانی ململانێی ولاتە شەرکەرەکان .(٥٩)هەرچەندە کورد هیچ بەرژەوەندیەکی لەشەرەکەدا نەبوو وەهیچ دەولەتێکی نەبووکەبەرگری لێبکات ،هەروەها هیچ پالنەرێکی نەتەوەیی نەبوو بۆ چونە نێو شەرەکە ،بەلام لەگەڵ ئەوەشدا رووداوەکانی شەر گەلی کوردی پێچایە ناو شەرەکە ،ناچار بوو خۆی بداتە پال لایەنێکی شەرەکەو ئەوزیان ومالوێرانیە قبول بکات کەلەئەنجامی شەرەکە بەسەری هات.(٦٠ ).

زیانەکان هەموو لایەنێکی ژیانی گرتبووەوە،هەرلەرووی مرۆیی ،سیاسی ،ئابووری،کۆمەلآیەتی ،لەرووی مرۆییەوە ئەوا بووبەهۆی لەدەستدانی ژیانی

هەزاران مرۆڤی کورد ،بەرادەیەك کەژمارەی ئەندامانی خێزانیکی پێکهاتوو لە(٢٠–٣٠)کەس ئەوا ژمارەیان کەمبوەوە بۆ (٣)کەس بەمانایەکی تر ئەوا لەهەر (١٠) کەس (٧تا٨)کەسیان گیانیان لەدەستداوە .(٦١) ئامارەکان ئاماژە بەوەدەدەن کەئەم ژمارە زۆرەی کوژراو لەئەنجامی لەشکرکێشی داگیرکەران و بەهۆی کەم بەرهەمی

وەبلاوبونەوەی برسێتی و نەخۆشی کەخەڵکی کوردستانی هەرەسانکردبوو،سەرەرای کوشتارەکان بەشێکی زۆری خەلکەکە لەبرسان گیانیان لەدەستدا ،ئەواسەرەرای ئەو راگواستنە زۆرەملێیە کەهێزەداگیرکەرەکان بەکوردیان کرد،ژمارەیەکی زۆرلە خەلکەکە بەرگەی بەفروسەرمایان نەگرت ومەرگ تەنگی پێ هەلچنین .(٦٢) شەربەلایەکی کوشندەبوو بۆگەلی کورد ،تورکە عوسمانیەکان بەبیانووی شەرکردن خەلکیان تالاندەکرد ،وەبەبیانووی ئەوەی کەکوردەکان پشت لەدەولەتی عوسمانی دەکەن چەندان خەڵکیان کۆمەل کوژولەسێدارە دەدان ،هەروەها بەتۆمەتی خیانەتکردن چەندان شارو گوندی کوردان وێران وتالانکران .(٦٣) لەئەنجامی شەروپێکدادانەکاندا زۆربەی کێڵگەوباخچەو زەوی یە کشتوکاڵیەکان توشی سوتان هاتن ئەمەش بووەهۆی ئەوەی بەدرێژای سالانی جەنگ زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بەدەست کەمی بەروبومی کشتوکالی بنالێنن وزەویەکانیان بەبەیار بمێننەوە ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر بلاوبونەوەی برسێتی ونەداری لەناوچەکانی کوردستان ،بەجۆرێك برسێتی بەرۆکی خەلکی گرتبوو کەلەناچاریان پەنایان بۆخواردنی گۆشتی مردوەکان دەبرد.(٦٤)

لەزیانەکانی تری جەنگ بۆکوردستان ئەوهێزە زۆرەی عوسمانیەکان کەلەناوچە کوردیەکاندا هەبوو،ئەوانەرکی سەرشانی خەلکی بوو کەپێداویستیەکانی

ئەوسوپایە دابین بکەن لەرووی خواردن وجلوبەرگ وئالیکی ئاژەڵەکانیان ،بەهۆی درێژەکێشانی جەنگ ونەبوونی داهاتی پێویست ئەوا خەڵکەکەی توشی قات وقری زۆرکردبوو.(٦٥) لەلایەکی تر دەوڵەتی عوسمانی بەفەرمانێکی رەسمی سولتان بۆپارێزگاری لەناوچەکانی هەولی

کۆچپێکردنی کوردەکانی دا بۆ ناوچەی ئەنادۆڵ ،بەبیانوی ئەوەی کەیارمەتی رووسەکان دەدەن،بۆئەو مەبەستەش فەرمانی بلاوکردنەوەی کوردەکانی دەرکرد لەناوچە تورك نشینەکان ونیشتەجێ کردنیان بەرێژەیەك کەلە سەدا پێنجی کوردەکانی زیاتر لێ نەبێت ،هەروەها سەرکردەی هۆزەکانی بۆناوچە شارنشێنەکانی تورکیا کواستەوە بۆ ئەوەی نەتوانن کوردەکان لەخۆیان کۆبکەنەوە .(٦٦)

بەم جۆرە کورد لەناو دەوڵەتی تورکیادا پەرش وبڵاوکرایەوە تاکوبتوانن دوای ماوەیەکی کورت زمان وکەلتوری کوردی لەناوببەن و شوێنەواری کورد بسرنەوە ،ژمارەی ئەوکوردانەی کەلەکوردستان راگوێزران بۆشارەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەگەیشتە ٧٠٠ هەزارکەس ،ئەمە جگەلەوەی کەژمارەیەکی زۆر لەوکۆچبەران لەرێگادا بەهۆی سەرماو برسێتی گیانیان لەدەستدا .(٦٧)

لەرووی ئابوریەوەش کوردستان زیانێکی گەورەی بەرکەوتووە،هۆکاری سەرەکی ئەم زیانانەش کەمبوونەوەی دەستی کاربوو بەهۆی راپێچکردنی لاوەکان بوو بۆبەرەکانی شەرو مانەوەی زەوی وزارە کشتوکالیەکان بێ خاوەن وکەمبونەوەی پێداویستیە سەرەکی وبنەرەتیەکانی ژیان.(٦٨) درێژەکێشانی جەنگ کاریگەریەکی گەورەی لەسەر ئابووری دەوڵەتی عوسمانی هەبوو،هۆکاربوو بۆداتەپینی ئابوری وولات وبەرزبونەوەی نرخی کەرستەکان وپێداویستی خواردن بەجۆرێك کەنرخی نان دوانزدە بەرامبەر زیادی کرد بەبەراورد لەگەل پێش جەنگ

،نرخی سوتەمەنی پانزدە بەرامبەر زیادی کردبەبەراورد لەگەل نرخەکانی پێش جەنگ.(٦٩)ئەم گرانیەش بۆئەوە دەگەرایەوە بەهۆی شەرەوە جوتیارەکان ناچاربوون زەویەکانیان جێبهێلن ،دابەزینی ئاستی کەل وپەلە ناردەنیەکان وداهاتی دەولەت بەرەو لاوازبوون چوو ،ئەمەش کاری کردە سەرئەوەی خەلکەکە توشی برسێتی ببێت وشارەکانیان جێبهێلن وبەرەوناوچەکانی تر کۆچ بکەن .(٧٠)

هەلوێست وسیاسەتی هێزەداگیرکەرەکانی تری کوردستان بەرامبەر بەناوچە کوردیەکان لەدەولەتی عوسمانی باشتر نەبوو،بەلکو بەهەمان شێوە وێرانکاریان لەکوردستاندا ئەنجامداوە بۆنمونە،کاتێك رووسەکان ئەرزەرووم و ئەرزنجان و وان ورەواندوزیان گرت ئەم ناوچانەیان توشی زەرەروزیان کرد.(٧١) سەرەرای کاولکاری رووسەکان چەندین کۆمەلکوژیان لەناوچەکانی کوردستان ئەنجامدا ،ئەرمەنەکان کەپێشتر هاوپەیمانیەتی وهاوسوزیان لەگەل کوردەکاندا هەبوو،بەلام لەسەردەستیان ئەم قەسابخانانە رێکخران،بەتایبەتی پاش ئەوەی کەرووسەکان هێزەکانیان لەناوچە کوردیەکان کشاندەوە بەسەدان گوندوشارۆچکەی کوردانیان تالانووێرانکرد ،ئەرمەنەکان لەپێشرەوی ئەوهێزە رووسیەدابوون کەئەم کارەیان ئەنجامدا .(٧٢) رووسەکان بۆنانەوەی ئاژاوەو دووبەرەکی لەنێوان کوردو ئەرمەنەکان ئەوا هەستی ئەرمەنەکانیان بەوە راکێشابوو کەبەلێنی دروستکردنی دەولەتێکیان پێدابوون،کەناوچەکانی کوردستان بگرێتە خۆی،ئەم کارەش دژایەتیەکی زۆری لەلایەن کوردەکان دروستکرد ،بەشێکی زۆری کوردەکان بۆبەرهەلستی کردنی هەلوێستی رووسەکان ،ناچاربوون بچنە پالّ دەولەتی عوسمانی ،لەئەنجامدا ناوچەکانیان بووبە گۆرەپانی ململانێی عوسمانی رووسی .(٧٣)

سەرەرای هەموو نەهامەتی ومالوێرانی کەلەئەنجامی جەنگەوە بەسەرکوردستاندا هات ،بەلام جەنگ پالنەرێکی سەرەکی بوو بۆوشیاربوونەوەی هەستی نەتەوایەتی و بەرزبوونەوەی گیانی تێکۆشان لەلایەن کورد،بەخۆداچونەوەیەك بوو بۆرێکخستنەوەی سەرلەنوێی بزاڤی رزگاری خوازیی ونەتەوەیی لەلایەن کۆمەلێك لەرۆشنبیران وسیاسەتمەدارانی کوردو خۆگونجاندنیان لەگەڵ پێشهات وقۆناغی نوێی جیهان .(٧٤)بۆیە دەبینین هەریەکە لە عەبدول رەزاق بەدرخان ،سمکۆی شکاك،شەریف پاشا هەولیان داوە خۆنزیك بکەنوە لەوولاتە سەرکەوتوەکانی شەر بۆئەوەی بتوانن لەم رێگەیەوە سەربەخۆی بۆکوردستان بەدەست بهێنن وپشگیری نێو دەولەتی بۆبزاڤ وشۆرشەکانیان دابین بکەن ،لەکوردستانی عێراقیشدا کوردەکان بەرابەرایەتی شێخ مەحمود هەولی خۆنزیکخستنەوەی دەدا لەبەریتانیا بەمەبەستی پێکهێنانی حکومەتێکی سەربەخۆ لەناوچەکەدا.(٧٥)

وولاتە زلهێزەکان بۆبەدەستهێنانی بەرژەوەندیە سیاسی وئابوریەکانیان چەند بەلێنێکیان بەکورد دا ،بەلام ئەوبەلێنانە هیچیان نەچوونە بواری جێبەجێ کردن کەدواتر لەکۆنگرەو پەیمانە نێودەولەتیەکانی دوای جەنگ هاتنە بەرباس ولێکۆلینەوە ،بەلام ئەم بەلێنانە ناساندنێکی نێودەولەتی بوو بەهەبوونی کێشەیەکی زیندوو لەرۆژهەلاتی ناڤین کەئەویش کێشەی کوردە.(٧٦)

جەنگ هۆکارێك بوو بۆشکست هێنان وسەرنەکەوتنی سیاسەتی تورکە لاوەکان لەلایەك ،لەلایەکی ترەوە بووەهۆی پەیدابوونی چەندین رێخراو کۆمەلەو پارتی سیاسی نوێ ی کوردی کەلەبەرنامەو پرۆگرامەکانیدا ئامانجی سەربەخۆیی کوردستانیان هەلگرتبوو وپەیوەندی ودۆستایەتیان لەگەڵ وولاتانی رۆژئاوا بەتاییەتی بەریتانیادا بەستبوو،بزوتنەوەی کوردایەتی قۆناغێکی نوێ ی

تێکۆشانی گرتبووەبەر ،بەتایبەتی ئەوگۆرانە ریشەیانەی کەلەمیانەی جەنگ لەسەرگۆرەپانی ئیمبراتۆریای عوسمانی دروست ببوو.(٧٧) ئەمانە بوون بەهۆکاری سەرهەڵدانی چەندان راپەرین لەناوچەجیاجیاکانی کوردستان دژی دەسەلاتدارانی عوسمانی ،لەوانە راپەرینی دەرسیم کەلەماوەی جەنگدا دووجار دژی خراپکاریەکانی سوپای عوسمانی راپەرین،راپەرینی خەرپوت وماردین ودیاربەکر ،ئەم راپەرینانە نیشانەی بەرزبوونەوەی هەستی نەتەوایەتی کورد دەسەلمێنن لەماوەی جەنگدا.(٧٨)

جگە لەمانە جەنگ هۆکارێك بوو بۆچەکداربوونی هۆزەکوردیەکان ،لەئەنجامی هەلگرتنی چەکی عوسمانیەکان لەلایەك و چەکی رووسەکان لەلایەکی ترەوە،هەروەها دەست بەسەرداگرتنی چەك وتەقەمەنی لەئەنجامی کشانەوەی هێزەکان لەکوردستان ،بوونە هۆکارێك کەدوای جەنگ چەندان شۆرشی بەهێزو درێژخایەن وسەرتاسەری لەکوردستاندا سەرهەڵبدەن،لەوانەش شۆرشی شێخ مەحمود،سمکۆی شکاك،شۆرشی سەعیدی پیران وچەندانی تر.(٧٩)

تەوەرەی دووەم:—

کوردستان لەبەردەم پەیماننامەی سایکس—بیکۆ دا

وولاتە سەرمایەدارەکان بۆدەست خستنی بەرژەوەندیەکانیان بەتەنها سەرقاڵی کاری سەربازی نەبوون،بەلکو لەرووی سیاسی یەوەش لەچالاکی دابوون بۆبەدیهێنانی ئامانجەکانیان ،بۆئەم مەبەستەش هەلسان بەبەستنی پەیماننامەیەك بۆدابەشکردنی ناوچەکانی دەولەتی عوسمانی بەسەرخۆیاندا ،ئەم پەیماننامەیە لە١٩ی شوباتی ١٩١٦ز لەپایتەختی روسیا بەسترا،کەلەمێژوودا بەپەیمانی سایکس—بیکۆ—سازانوف ناسراوە.(٨٠) سەرەتای پەیماننامەکە

بەشێوەیەکی نهێنی لەنێوان فەرەنساوبەریتانیا مۆرکرا،لەپایزی ١٩١٥زلەنێوان مارك سایکسی ئینگلیزی وجۆرج بیکۆی فەرەنسی بۆدابەشکردنی مومتەلەکاتی عوسمانی ،پاشان هەردوولا سەردانی رووسیایان کردوو لەگەل وەزیری دەرەوەی ئەم وولاتە سازانۆف دا کۆبونەوە بۆئەوەی روسیا تێبینیەکانی خۆی لەسەردەقی رێکەوتنامەکە دەرببرن،بەم شێوەیە پەیمانەکە بەنهێنی لەنێوان هەرسێ وولات مۆرکرا.(٨١)ناوەرۆکی رێکەوتنەکە بریتی بوو لەوەی کەروسیا ئەرزەرووم ووان وبەتلیس وتەرابزوون وچەند ناوچەیەکی تر لەرۆژهەلاتی باشوری ئاسیای بچوکی بەربکەوێت،فەرەنسا دەست بەسەرلوبنان وکەنارەکانی دەریای سوورو ئەدەنەو کلیکاو ئورفاوماردیندا بگرێت،هەرچی بەریتانیایە دەست بەسەرمیزۆپوتامیاو بەندەرەکانی دەریای ناوەراست وحەیفاوعەککادابگرێت.(٨٢) ناوچەی فەلەستین بکەوێتە ژێرچاودێری نێودەولەتیەوەو رۆژهەلاتی سوریاوباشوری عێراق لەژێردەستی فەرەنسا دابێت کەبەناوچەی(**A**)ناسرابوو،ئوردون وناوەراستی عێراق بکەوێتە ژێردەسەلاتی بەریتانیا کەبەناوچە (**B**) ناسرا ،هەردوولا رێککەوتن کەئامادەن دان بەسەربەخۆی وپاراستنی دەولەتێکی عەرەبی یان یەکێتی یەکی فیدرالی کەکەوتۆتە سەرهەردووناوچەی (**A-B**)پێك بهێنن.(٨٣) بەم شێوەیە دەبینین کەکوردستان دابەشکرا بەسەر سێ هەرێمی جیادا لەنێوان رووسیا کەبەشێکی بەرفراوانی لەکوردستانی باکوروناوەراست بەرکەوت،فەرەنسا کوردستانی رۆژئاواو بەشێکی فراوانی ویلایەتی موسلی بەرکەوت،بەریتانیاش ناوچەکانی بریتی بوو لە باشوری کەرکوك تاکو باکوری بەعقوبەوخانەقین وشاروشارۆچکەکانی تر.(٨٤)

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەپەیمانەکە ئەوەیە کەهیچ ئاماژەیەك بەدروستکردنی قەوارەیەکی سیاسی وسەربەخۆ بۆکوردستان نەکراوە،هەرچەندە پێش بەستنی

پەیمانەکە هەریەکە لەدەولەتە بەشدارەکان بەتایبەتی روسیا وبەریتانیا ئەوبەلێنەیان بەسەرکردە کوردەکان دابوو بەومەرجەی پشتگیریان لێ بکەن،بەلام لەپەیمانی نهێنی سایکس –بیکۆ دا پاشگەزبوونەوە یان پێوەدیاربوو.(٨٥) سەرەرای ئەوەی بەریتانیاوفەرەنسا بۆمسۆگەرکردنی بەرژەوەندیە سیاسیەکانیان بێ گوێدانە هەستی نەتەوەیی ناوچەکە یاری یان بەچارەنوسی وولاتەکە دەکرد،بەو پێیەی کە وویلایەتی موسل بەگوێرەی رێکەوتنەکە بەشێك بوو لەنفوسی فەرەنسی بەلام بۆبەریتانیا وازی لێهێنا بەرامبەر مسۆگەرکردنی مافی ئیمتیازاتی نەوت لەناوچەکەدا .(٨٦)

ئەم رێکەوتنە بەیەکێك لەترسناکترین رێکەوتنەکانی نێوان دەولەتە کۆلۆنیالەکان دادەنرێت دەرهەق بەگەلی کوردونیشتمانەکەی ،سەرەرای پشتگوێ خستنی ماڤە رەواکانی ئەوا ئاماژە بەدامەزراندنی چەند دەولەتێکی عەرەبی دەکات لەسەرخاك ونیشتمانی کورد.(٨٧) دەرئەنجامەکانی ئەوپەیمانە دوای وەستاندنی جەنگی یەکەمی جیهانی زیاتر بەدیارکەوت کاتێك فەرەنسا ویلایەتی موسلی بۆبەریتانیا جێهێشت کەدواتر ئەم سیاسەتە ململانێی دروستکرد لەسەرناوچەکە ،بەتایبەتی لەنێوان تورکیاوبەریتانیا ،ئەگەرچی خاکی کوردبوو بەلام

خرایەسەردەولاتێکی عەرەبی بەبێ رەزامەندی کورد.(٨٨) هەرچەندە رێکەوتنامەکە نەچووە بواری جێ بەجێ کردنەوە بەتایبەتی دوای ئەوەی کەروسیا بەهۆی شۆرشی ئۆکتۆبەری١٩١٧ز خۆی کێشایەوەو پەیمانە نهێنیەکەی ئاشکراکرد ،بەلام سود لەبەندەکانی وەرگیرا بۆدارشتنی رێکەوتنەکانی دوای جەنگ بەتایبەتی ئەو بەندانەی کەپەیوەندیان بەکوردستانەوە هەبوو.(٨٩)

تەوەرەی سێیەم:- شۆڕشی ئۆکتۆبەرو کاریگەری لەسەر کوردستان ١٩١٧ز:

شۆڕشی رووسیا لە ٢٥ی ئوکتۆبەری١٩١٧ز بەسەرۆکایەتی (فلادمیر لینین)سەری هەڵداو توانیان کۆتایی بە رژێمی قەیسەری لەرووسیا بهێنن.(٩٠) دوای سەرکەوتنی شۆڕش دەسەلاتدارانی نوێ بڕیارياندا کەهەموو پەیماننامەو رێکەوتنە نهێنی وئاشکراکان کەلەلایەن رژێمی پێشوو رەزامەندی لەسەردەربری بوو،ئەوا هەڵدەوەشێنەوە،هەروەها لەهەموو ئیمتیازاتەکانی خۆی خۆشدەبێت لەوناوچانەی کەدەستی بەسەردا گرتبوو لەگەرووەکانی ئەستەمبۆل وئەوناوچە فراوانەی باشوری کوردستان .(٩١) حکومەتی نوێ بەفەرمی رایگەیاند کەهێزەکانی خۆی لەوناوچانە دەکێشێتەوە کەداگیری کردبوون لەوانەش:ورمێ،سابلاغ ،ئەرزەرووم ،ئەرزنجان،وان،خانەقین ،رەواندوز.(٩٢) لەگەڵ ئەوەشدا رایگەیاند کەپەیماننامەی سایکس-بیکۆ هەڵدەوەشێنێتەوە ،بەپێی ئەورێکەوتنامەی کەلەگەڵ ئەڵمانیای مۆرکرد لە٢٢ی١٢ی ١٩١٧ز بەناوی پەیمانی (برێست لیتوفسکی)(٩٣) ئەوەش بووەهۆی گۆرانکاری ئێجگار گەورە لەتەرازووی هێزی وولاتانی دەسەلاتداری ئەورۆژگارە کەدەستیان بەسەر ناوچەکەدا گرتبوو.(٩٤)

سەبارەت بەکاریگەری شۆڕشەکە لەسەر کوردستان لەچەند لایەنێکەوە بووە،لەلایەك زیانێکی گەورەی بەکوردستان گەیاند ،بەتایبەتی کاتێك هێزەکانی لەناوچانە کشاندەوە سوپای رووسیا دەستی کرد بەوێرانکردن وتالانکردنی ئەوناوچانەی کەکەوتبووە سەر رێگەیان وکوشتارێکی زۆریان لەناوچەکوردیەکان ئەنجامدا.(٩٥) ئەوبۆشاییە سەربازیەی لەئەنجامی کشانەوەی رووسەکان دروست بوو ،رێگەی بۆعوسمانیەکان وبەریتانیا خۆشکرد کەپەلەبکەن وئەوناوچانە

داگیربکەنەوە وبیخەنە ژێردەسەلاتی خۆیان،بۆیە هەڵمەتی سەربازی ولەشکرکێشیان بۆسەرناوچەکە ئەنجامدا.(٩٦)

رووسەکان پێش شۆرش پەیوەندیان لەگەڵ هەندێك سەرکردەکوردەکان بەستبوو،بەمەبەستی یارمەتی دانی رووسەکان،بەلام دوای شۆرش ئەو پەیوەندیە تێکچوو،بۆیە بەریتانیا سەرکەوتنی بەدەستهێنا لەهەوڵی کێشکردنی کوردەکان بۆلای خۆی ،بەلاّم کوردەکان هەستیان بەوەکردبوو کەسیاسەتی بەریتانیا دژی خواستەکانی گەلی کوردە،بۆیە چەندان پێکدادان لەنێوان سەرکردەکوردەکانی ئێران وتورکیا لەگەڵ هێزە بەریتانیەکان روویدا،لەماوەیەکی کورتدا بەریتانیا توانی شوێن پێی خۆی لەناوچەکەدا قایم کرد.(٩٧) لەلایەکی ترەوە بەریتانیاو فەرەنسا هەوڵیاندا کەهێزێك لەئەرمەن وئاشوریەکان پێکبهێنن لەکوردستانی ئێران بۆئەوەی ئەو بۆشاییە سەربازی یە کەهاتبووە ئاراوە پربکەنەوە ،لەهەمان کاتدا ئاژاوەو دووبەرەکی بخەنە نێوان کوردوئەرمەن ،تاوەکو کوردسەرقال بکەن بەشەرەوە،لێرەوە بتوانن بەئاسانی بەرژەوەندیەکانیان لەکوردستانی ئێران دەستەبەربکەن،ئەوهێزەئەرمەنیەژمارەیان لەنێوان (٥-٧) هەزارکەس بوو لەلایەن ئەفسەرانی بەریتانی وفەرەنسی سەرپەرشتی دەکران.(٩٨) وەکو بەرپەرچدانەوە یەك بۆهەوڵەکان دەولەتی عوسمانی هێرشیان کردەسەرناوچەکەو توانیان ورمیّ،ئەرزەرووم،تەرابزوون،ئەلکسەندەرپول کەرووسەکان کشابوونەوە لێی سەرلەنوێ داگیربکەن ،ئەم بارەناهەموارە لەناوچەکەدا بووە هۆی ململانێ لەنێوان وولاتە شەروانەکان ،سەرەرای ئەمەش ناکۆکی نەتەوەیی وئاینی لەنێوان دانیشتوانی ناوچەکە سەری هەڵدا ،(٩٩)

سەرەرای ئەولایەنە نەرێنیانەی شۆرشی ئوکتۆبەر لەسەر کوردستان نواندی لەهەمان کاتدا شۆرشەکە بوو بەهەوێنی بەگەرخستنی خەباتی رزگاری ونیشتمانی

بۆگەلانی رۆژهەلات بەگشتی وکوردستان بەتایبەتی،شۆرش هەلۆمەرجێکی لەباری هێنایە ئاراوە بۆگەلانی ژێر دەستە تاکو هەول وخەبات بکەن بۆمەبەستی رزگاری وئازادی دژی داگیرکەران وئیمپریالیزم.(١٠٠) لەژێر بیروبۆچون وبنەماکانی شۆرشی ئوکتۆبەر کۆمەلگای کوردی دەستی بەراپەرین وخەباتی چەکداری کرد لەزۆربەی ناوچەکانی کوردستان،هەستی نەتەوایەتی کورد گەشەسەندنێکی دیاری بەخۆیەوە بینی وتوانیان وەك بزوتنەوەیەکی سیاسی رێکخراو خەبات بکەن بۆدامەزراندنی دەولەتێکی سەربەخۆی کوردی.(١٠١) هەروەها ئاشکراکردنی رێکەوتننامەی نهێنی سایکس-بیکۆ لەلایەن رووسیاوە ،دوای شۆرش دەنگۆیەکی گەورەی لێکەوتەوە لەنێوان دەولەتە ئەوروپایەکان وملەتانی ناوچەکە،بەتایبەتی کەپێشتر بەریتانیا بەلێنی بەکورد دابوو کەدەولەتێکی سەربەخۆیان بۆدابمەزرێنێت،ئەم شۆرشە بووەهۆی پەردەهەلمالین لەسەر نیازو مەبەستە شاراوەکانی زلهێزەکان وکاردانەوەیەکی راستەوخۆی هەبوو لەسەر وشیارکردنەوەی گەلانی ژێر دەستەی زلهێزەکان لەوانەش گەلی کورد.(١٠٢)

بەشی دووەم:. دۆزی کورد لەکۆنگرەو پەیماننامە نێودەولەتیەکاندا:

تەوەرەی یەکەم: دۆزی کورد لەکۆنگرەی ئاشتی پاریس ١٩١٩ز دا :

دوای کۆتای هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و ئاگربەستی مودروس لە٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ز وولاتە براوەکانی لەسەربەستنی کۆنگرەیەکی جیهانی رێککەوتن،بۆچارەسەرکردنی کێشەو گرفتەکانی دوای شەر .هەندێك بیرورا ئالوگۆرکران بۆچارەسەرکردنی ناوچە دابراوەکانی دەولەتی عوسمانی وجێبەجێ کردنی پرەنسیپەکانی سەرۆك (ولسن) سەرۆکی وولاتە

یەکگرتوەکانی ئەمریکا،کەخۆی لە ١٤بەند دەبینیەوە، یەکێك لەوپرەنسیپانە ،مافی چارەنوسی گەلانی ژێردەستەبوو.(١٠٣)

ئەنجومەنی بالآی وولآتانی هاوپەیمان لە٣٠یکانونی دووەمی١٩١٩ز لەپاریس کۆبونەوەیەکیان بەست ،کەدواتر بەکۆنگرەی ئاشتی ناسرا.لەمکۆنگرەیەدابریاردرا:

(هاوپەیمانان وولآتە لایەنگرەکانیان لەسەر ئەوە رێك کەتن کە ئەرمینیان ووولاتی رافدین ،کوردستان و ولآتانی عەرەبی بەتەواوی لەئیمبراتوریەتی عوسمانی دابرێن)(١٠٤) بۆ ئەم مەبەستەش کەسایەتیە سیاسی ورۆشنبیرانی کورد کەوتنە چالاکی بۆگەیاندنی داخوازیەکانیان بۆئەم کۆنگرەیە .(١٠٥) یانەکوردیەکانیش لەپایتەختی دەوڵەتی عوسمانی کەوتنە چالاکی نواندن ،هەموو پارت ورێخراوە سیاسیەکان کۆمسیونێکیان بەسەرۆکایەتی شەریف پاشا پێکهێنا بۆئەوەی نوێنەرایەتی کورد بکات وبەشداربێت لەگۆنگرەی ئاشتی.(١٠٦)

سەریف پاشا لە٢٢-٣-١٩١٩ز یاداشتێکی پێشکەش بەسەرۆکایەتی کۆنگرەکە کرد کەداوای دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی دەکرد،لەیاداشتەکەیدا داوای کوردستانی ژێردەسەلآتی عوسمانی وئێرانی دەکرد،کەلەیاداشتەکەیدا دەڵێت:"ئێمە داوا لەکۆنفرانس دەکەین کەکۆمسیونێك پێك بهێنن تابەپێی پرەنسیپەکانی نەتەوەیی سنوری کوردستان دیاری بکات،تاکو هەموو ئەوناوچانەی زۆربەی دانیشتوانی کوردن بگرێتەخۆی،بەلآم ئەگەرهاتوو کەمایەتیەك بکەوێتە نێوسنوری کوردستان ئەوا بەپێی داب ونەریتی خۆیان بۆیان دابین دەکرێت .(١٠٧) بەمەبەستی پێدانی شەر عیەت بەشەریف پاشا وەکو نوێنەری کورد ئەوا لە ناوچەکانی تری کوردستانیش پشتگیریان لێکردووە لەوانە شێخ محمود هەولێدا مەزبەتەیەك بەئیمزای خەلکێکی زۆری کورد بگەینێتە

پاریس لەرێگەی (رشیدکابان و سیداحمدبەرزنجی) بەلاّم دەسەلاّتدارانی ئینگلیز رێگەیان نەدامەزبەتەکە بگاتە کۆنگرەکەو بەهۆی دەستگیرکردنی هەردوو نوێنەرەکە لەحەلەب.(١٠٨)

لەلایەکی ترەوە کوردەکان دڵیان بە چواردە بەندەکەی وڵسن خۆش بوو کەجەختی لەسەر ئازادی گەلان ومافی چارەی خۆنووسین دەکردەوە،بەتایبەتی بەندی دووانزدەهەم کەتایبەتە بەبەدەستهێنانی مافی گەلانی ژێرقەڵەمرەوی دەوڵەتی عوسمانی وئەوانەی تورك نین وەکو کوردوعەرەب وئەرمەن.(١٠٩)لەهەمان کاتداهاندەرێکی تربۆکوردەکان ئەو راگەیاندنەی ٢٨ی تشرینی دووەمی ١٩١٨زبوو کەلەلایەن بەریتانیاو فەرنسا دەرچوو،کەئەو نەتەوانەی زیاتر هاندەدا بۆداواکردنی سەربەخۆی خۆیان کەدەقەکەی دەڵێت:"بەریتانیاوفەرەنسا بەیەکەوە هەوڵدەدەن بۆ رزگارکردنی ئەو کەلانەی کەچەندین ساڵە لەژێردەستی عوسمانیەکاندا دەناڵێنن سەربەست بن لەدامەزراندنی حکومەت وئیدارەی نیشتمانی بەپێی ئارەزووی دانیشتوانە رەسەنەکەیان وهەڵبژاردنی خۆیان ".(١١٠) بەم شێوەیە زەمینە رەخسا بۆئەو نەتەوانە کەداخوازی پێشکەش بکەن، شەریف پاشا کەشارەزایەکی باشی لەدبلوماسیەتدا هەبوو بەهزرێکی نیشتمان پەروەریەوە وەکو داخوازی کارێکی مافی کورد بەشداری لەکۆنگرەکەدا کرد.(١١١) کارێکی تری شەریف پاشا وەکو تێگەیشتنی لەپێداویستی وزەرورەتی ئەوسەردەمە بووکەهەستی بەدوژمنایەتی وناکۆکی نێوان کوردو ئەرمەن کرد،هەردوولا داخوازکەری سەر یەك زەمین بوون ،ئەرمەنەکان سودیان لەرەوتی رایگشتی نێودەوڵەتی وەرگرتبوو کەبەقازانجی ئەوان بوو،چاپەمەنیەکانی ئەورووپا رۆژانە باسی لەوزوڵم وستەمە دەکرد کەبەرامبەر بەئەرمەن کرابوو،بەتایبەتی کوشتاری ئەرمەنەکان ١٩١٥ز بابەتی رۆژانەی راگەیاندنەکانیان بوو.(١١٢)

سـەرکردەکانی کـورد گرنگـی ڕێکـەوتنیان لەگـەڵ ئەرمەنـەکان بـەباش دەزانـی چونکە:

یەکەم: وەکو دوونەتەوەی دراوسێی یەکتر دەبێت ڕێگەی بەیەکەوە ژیانی ئاشتی هەڵبژێرن.

دووەم: تێکەل بوونی خواستی نەتەوەی ئەم دوو گەلە نەبێتە بەهانەی پـشتگوێ خستنی مافەکانیان لەسەر ئاستی جیهانیدا.(١١٣) بۆیە شەریف پاشا خۆی لـە( بۆغـۆس نۆبـارا)ی نوێنـەری ئەرمـەن لـەکۆنگرەی نـاوبراو نزیککردەوە،هـەردوولا لەسـەرئەوە ڕێـك کـەوتن کەهەریەکـە لەئەرمەنـستان وکوردسـتان لەیـەك جیـابن ،بەیەکـەوە یاداشـتێکیان لەبـەرواری ١ی ئـاداری١٩١٩زدا ئاراسـتەی ئەنجومـەنی باڵای هاوپەیمانان کرد، نوێنەری کورد لەپاڵ یاداشتەکەی نەخشەیەکی پێشکەش بەسـەرانی کـۆنگرەکرد بۆدیـاری کردنـی سـنوری کوردسـتان.(١١٤) ئەمـەش سـەرکەوتنێکی گـەورەبوو وەهەڵوێـستی نوێنـەرانی هـەردوو گـەلی لەکۆنفرانـسی ئاشـتیدا بەهێزکرد،هاوپـەیمانان بەخۆشـیەوەئەم هـەنگاوەیان قبـولکرد بەتایبـەتی نوێنـەری بـەریتانیا ئاگـاداری کومـسیونی بـالای لەئەسـتەمبول کـرد کەهانی ئەم هـەنگاوە بـدات .(١١٥) بۆئـەم مەبەسـتەش گروپێـك لەخوێنـدەواران وڕۆشنبیرانی کورد کەکارمەنـدی پێـشووی دەوڵـەت بـوون رایـان گەیانـد کـەکورد هاوکـاری دامەزرانـدنی دەولـەتێکی سـەربەخۆ بۆئەرمـەن دەکـات لـەباکوری ڕۆژهەلاتی تورکیا .(١١٦) بەلام دواتر دەرکـەوت کـەگفتوگۆکانی نێـوان سـەرانی کۆنگرەکە کارێکی ئاسان نەبووە چونکە کەیشتنیان بەیەکلای کردنەوەی هـەموو کێشەکان لەرۆژهـەلاتی نـاڤین ورازی کردنـی هەمولایـەك پێویـستی بەوەهـەبوو کەهـەموو پەیمانـە نهێنیـەکان ورێکەوتنـە دووقۆڵیـەکان هـەروەها ئـەو نامانـەی

کەلەشـەردا گۆردرابوونـەوە ئاشـکراو یـەکلا یـی بکرێنـەوە ،وەکـو ڕێکـەوتنی لەندەنی ١٩١٥،پەیماننامەی سیکس–بیکۆ،ڕێکەوتنامەی بەلفۆر.(١١٧)

لایەنـەکانی کـۆ نگـرە ئەوەنـدە گوێیـان بـەداخوازی کـورد دەدا کەلەگەڵبەرژەوەندیـەکانیان دەگونجـا ،بۆیـە شـەریف پاشـا ناچـاربوو داوا لەبەریتانیا بکات کەپشتگیریان بکات،لەلایـەکی تـر هەوڵیانـدا لەگـەڵ حکومـەتی سـوڵتان دانوسـتان بکـات ، ئـەم هەلوێسته گـۆڕاوەی هاوپـەیمانان وهێزەکـانی ناوچەکە ویەکلای نەکردنەوەی دۆزەکە وای لەبیرمەندوسیاسەتمەدارانی کوردکرد کـەبروایان بەهاوپـەیمانان وبەلێنـەکانی کـۆنگرە نـەمێنێت ،بەتایبـەتیش دوای ئەوەی کەدەنگوباسی دابەشکردنی کوردستان لەنێو کۆنگرەکـەدا بـاس وخـوازی لەسـەردەکرا.(١١٨) لـەم قۆناغـە هەستیارەشـدا ولەگـەڵ ئـەوگۆڕان وپێشهاتەسیاسینەدا دەبینین یەکریزی یەك دەنگی کورد بەرەولێکترازان دەچێت ،لـەنێورای گشتیـسیاسی کوردیـدا سـێ ئاقـاری سیاسـی جیـاوازدەبینران ،بەشێکیان مەیلیان بۆدەوڵەتی عوسمـانی هەبوو،بەشـێکی تریـان بۆهاوپـەیمانان ،بەڵام کوردەکانی دەرسیم داوای سەربەخۆی تـەواویان دەکرد بێ خۆخستنە پـاڵ هـیچ لایـەنێکی بێگانـە .(١١٩) جیـاوازی بوچونەسیاسـەکان تێکەڵاوبوولەگـەڵ جیاوازی دەستکەوتی تایبەتی وخێلەکی وناوچەیی ،بۆیە بووبەهۆی جیابونەوەی چەند کەسایەتی سیاسی دروست کردنـی چـەند ڕێخراوێکـی سیاسـی نوێ،لەوانـە ئەمین عالی بەدرخان،مەمدوح سەلیم ،ئەحمەد سورەیا هەریەکە لەمانە پـارتێکی سیاسـی دامەزراند وهەریەکە بۆخۆی بەجیا کەوتـە کـارکردن وپەیوەنـدی بەسـتن لەگەڵ دەولەتان وکۆروکۆبونەوە جیهانیەکان .(١٢٠) سەرەرای ئەوەش بـەریتانیا پاشگەزبوەوە لەوبەلێنانەی کەلەکۆنگرەکە بەکوردی دابوو،چونکە بـەریتانیا پـێ ی وابووکـە کوردەکـان لەنێوخۆیانـدا یـەکگرتوونین ویەکهەلوێـست نـین ،هـیچ

کەسێکی شیاویان نیە بۆسەرکردایەتی کردنی ئەو وڵاتەی کەلەدوارۆژدا بەنیازن بۆیان دروست بکرێت ،لەبەر ئەم هۆکارانەو چەند هۆکارێکی تر کەبەربەست بوون لەبەردەم بەرژەوەندی هاوپەیمانان بۆیە لەپشتگیری کردنی کورد لەکۆتگرەکە پاشگەزبوونەوە.(١٢١) هەروەها فەرەنساوبەریتانیا مشت ومڕێکی زۆریان لەسەر دابەشکردنی کوردستان لەلادروست بوو،بێ ئەوەی گوێ بەداخوازیەکانی کورد بدەن ناوچەکەیان لەنێوخۆیاندا دابەشکرد.(١٢٢)

دەوڵەتی عوسمانی لەرێگەی (باب العالی)یەوە هەوڵی رێگەیەکی دەدا بۆئەوەی سەرانی کورد لەخۆی نزیك بکاتەوە وبەڵێنی مافی ئوتونومی کوردستانیان پێ بدات ،ئەمەش دەرفەتێکی باشی بۆ (مستەفا کەمال) رەخساند ،بەهۆی پەرتەوازەیی سەرانی کوردو دورکەوتنەوەیان لەئامانجەکانیان هەوڵی بەستنی دووکۆنگرەی دا لەکوردستان ،یەکێکیان لەسیواس وئەوی تریان لەئەرزەرووم بەمەبەستی راکێشانی هەستی کوردەکان بۆلای خۆی وبەشداری پێکردنیان لەوبزوتنەوەیەی کەدژی هاوپەیمانان ودەوڵەتە داگیرکەرەکانی خاکی تورکیا دەستی پێ کردبوو.(١٢٣)

بەم شێوەیە کۆنگرەی ئاشتی پاریس کەشەش مانگی خایاند وتیایدا ٥٠ لیژنە بۆلێکۆڵینەوە لەکێشە نێودەوڵەتیەکان دروستکرابوون ،زیاترلە ١٦٠٠ کۆبونەوەیان ئەنجامدا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەگەیشتنە هیچ شێوازێکی کۆتایی لەمەر یەکلای کردنەوەی گرفتەکانی شەرو دەرهاویشتەکانی ،ئەوەی تایبەتیش بێت بەدۆزی کورد ئەوا هورروەکو خۆی بەبێ چارەسەر مایەوە .(١٢٤)

ئەم بارودۆخە ناسەقامگیرە رێگە خۆشکەربوو بۆهاوپەیمانان بۆئەوەی چەند پەیماننامەیەکی تر سەبارەت بەکێشە هەڵپەسێراوەکان ببەستن ،لەمانەش گۆنگرەی سان ریمۆ ،قاهیرە،پەیماننامەی سیڤەر.(١٢٥)

## تەوەرەی دووەم: دۆزی کورد لەپەیمانامەی سیڤەردا

دوای کۆتـای هـاتنی کارەکـانی کـۆنگرەی ئاشـتی ومانـەوەی کێـشەکان بەچارەسـەرنەکراوی ،وولاتـانی هاوپـەیمان بۆمـسۆگەرکردنی بەرژەوەندیـە ستراتیژیەکانیان لەشاری لەندەن کۆبونەوەیەکیان بەست کەبەکۆنگرەی لەندەن دەناسرێت،لەشوباتی ۱۹۲۰زلەنێوان بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیا،بۆگفتوگۆکردن لەسەرچارەسـەرکردنی کێـشەی ویلایـەتی موصل،چـەند رایەیـەکی جیـاواز هاتنەئاراوە سەبارەت بەلکاندنی ناوچەکانی کوردستان بەناوچـەی ژێردەسەلاتی خۆیـان.(۱۲٦) بـەلام ئـەم رایانـە قبـول نـەکران ،گەرانـەوە سـەرفەرمانرەوایەکی هاوبەش لەنێوان فەرەنسا وبەریتانیا ،بەلام ئەمەشیان یەکلای نەکرایەوە چونکە ئیتالیـا داوای بەشـی دەکـرد لەناوچـەکە.(۱۲۷) بۆئـەم مەبەسـتە سـەرانی کۆنفرانسی ئاشتی لە(سان ریمۆ)کۆبونەوە لە٢٤ی نیسانی ۱۹۲۰ز ،بۆ دۆزینەوەی چارەسـەرێکی مامناوەنـدی بۆناوچـە داگیرکراوەکـان و ئەوناوچـانەی کێـشەیان لەسەرهەیە،کۆنفرانسێك بەسترا بـەئامادەبونی سـەرۆك وەزیرانـی بـەریتانیا(لوید جـورج)وشـاندی فەرەنـسا بەسـەرۆکایەتی (میـسیو میـلیران)وسـەرۆکی شـاندی ئیتاليا سيناتۆر (نيتی) (۱۲۸)لەم کۆبونەوەیـەدا زۆر کێشەی گـرنگ بـەلاداخران وسـەرەتای دروسـتکردنی مانـداتی فەرەنـساو بـەریتانیا بـوو بۆسەرناوچـە دابراوەکـانی دەولـەتی عوسمانی،لـەم کۆنگرەیـەدا بریـاردرا کەویلایـەتی موصـل وبەغـدا وبەسرەوفەلەسـتین بخرێنـە ژێـر مانـداتی بەریتانیا،ویلایەتـەکانی حەلەب،دیمەشـق،لوبنان بخرێنـە ژێـر مانـداتی فەرەنـسا.(۱۲۹) بـەم شـێوەیە بـەریتانیا بەمـەرامی خـۆی گەیـشت کەشـوێنی پـر پیـت وبەرەکـەتی دەولـەتی عوسمانی بەرکەوت ئەویش ولاتی نێوان دووروبارو ویلایەتی موصل کەناوچەیەکی

دەولەمەنـدی نەوتین،لـەپال ئـەم دەسـتکەوتانەی بـەریتانیا دەولـەتی تورکیـا بەهـەموو جۆرێـك بەربـەرەكانی بـەریتانیای دەكرد،ئامادەنـەبوو ئـەم ناوچـەیە لەدەسـت بدات،بۆیـە بـەریتانیا بـۆ چاوترسـاندنی تورکـەکان هـەوڵی بـەدیهێنانی پشتێنەیەكی ئەمنی دەدا ،بەدروستكردنی دەولەتێكی كـوردی لەناوچـەكە.(١٣٠) هەلویـستی بـەریتانیا بۆیەكـەم جـار لەكۆنفرانـسی سـان ریمـۆ دا بـەدیارو كـەوت بەرامبەر بە مەسەلەی کورد کەبریتی بوو لەدابرینی کوردستان لەتورکیاو خستنە ژێردەسەلاتی خۆیەوە ،جەخت كردن لەفەرەنسا بۆوازهێنـان لەویلایـەتی موصـل ،دانانی سیستەمی ماندات لەخواروی کوردسـتان وچەسـپاندنی دەسـەلاتی خـۆی لەعێراق وئێـران.(١٣١)كاردانـەوەی ئـەم بریـارەش بـووە هـۆی نـارەزایی گـەلانی عێراق و خۆپیشاندان وچالاكی نواندی فراوانی لێكەوتەوە كەلەمێژوودا بەشۆرشی بیست ١٩٢٠ز ناسراوە ،کوردەكانیش لـەو چـالاكی شۆرشـەدا بەشـداریان كـرد دژ بەسیاسـەتی بـەریتانیا.(١٣٢)لەگـەل ئەوهـەموو پێـشهاتانەدا كەهاوپـەیمانان بەدەستیان هێنا بوو لەدابەشكردنی زەوی یەداگیركراوەكانی دەولەتی عوسمـانی ودابەشـكردنی ناوچـە نەوتیـەكانی کوردسـتان،ئیتر رێگـەیان بۆخۆشـبوو كەكۆبونەوەكانیان بەئەنجام بگـات ،سـوربوون لەسـەر بەسـتنی پـەیمانی ئاشـتی لەگەل دەولەتی عوسمانی ،بۆئـەم مەبەسـتەش ئەنجومـەنی راوێـژكاری وولاتـانی هاوپەیمان رەشنوسی پەیماننامـەی سیڤەریان لـە١١ی ئـاداری ١٩٢٠زپێـشكەش بەشاندی دەولەتی عوسمانی كرد.(١٣٣)

پەیماننامەی سیڤەر لە١٠ی ئابی١٩٢٠زلەشاری سیڤەر ئیمزاكرا.(١٣٤) بەبەشداری هەریەكە لەولاتانیفەرەنسا،ئیتالیا،یونان،رۆمانیا،ژاپون،یوگسلافیا،پولندا،حیجاز لەگـەل دەولـەتی عوسمـانی .(١٣٥) بـەلام دەولـەتی یـەكێتی سـۆڤیەت بـانگ نەكرابوو بۆ سیڤەر ئەمەش وای كرد كەتوركەكان لەسۆڤیەت نزیك ببنەوە.(١٣٦)

بەپێی ئەم پەیمانە یۆنان تراکیای رۆژهەلاتی بەرکەوت بەبێ ئەستەمبۆل ،هاوکات ئەزمیریشی داگیرکرد،فەرەنسا کیلیکیاو چەند بەشێکی ویلایەتی مەرعەش وئورفە وعەنتابی بەرکەوت،بەریتانیاش هەریەکەلە ویلایەتی موصل وچەند ناوچەیەکی دیاریەکری بەرکەوت.(١٢٧) دورگەکانی دودکاتر وروديز دران بەئیتالیا،ئەرمینیا سەربەخۆی پێدرا ،لەپەیماننامەکەدا بریاردرا بەکەمکردنەوەی سوپای دەولەتی عوسمانی وچەکەکانی دیاری بکرێت وبخرێتە ژێر چاودێری هاوپەیمانان یان وولاتانی بێ لایەن ،هەروەها داراییەکەی سنوردار بکرێت وبخرێتە ژێر چاودێری بەریتانیا وفەرەنسا.(١٣٨) بۆیە ئەم پەیمانە بەپەیمانێکی ریسواکەرو شەرمەزارانە دادەنرێت بۆ دەولەتی عوسمانی ،کەبووەهۆی لەناوچونی دەسەلات و شکۆمەندی لەسەرزۆربەی ناوچەکانی ،جگە لەچەند ناوچەیەکی تەسك نەبێت هەمووی لەژێردەستی دەرهێنران،ئەوانەی مابونەوەش کەوتنە ژێرچاودێری هاوپەیمانان.(١٣٩) هەروەکو لازاریف دەلێت:"پەیمانی سیڤەر بریاری مەرگ بوو بەسەر ئیمپراتۆریای عوسمانیدا درا ،جگە لەدەسەلاتێکی خەیالی خەلافەت لەناوچەیەکی تەسکی ئەستەمبول هیچی تری لەبەردەستدا نەبووە .(١٤٠)

ئەوەی پەیوەندی هەیە بەدۆزی کورد لەپەیمانەکەدا ئەوا بەشێوەیەکی روون وئاشکرا باس لەپێدانی حوکمی زاتی ودەسەلاتی سەربەخۆ بۆکوردستان بریاری لەسەردرابوو،ئەو بریارەش خۆی لەسێ بەندی یاسایی دەبینیەوە،کەبریتی بوون لەبەندی (٦٢-٦٣-٦٤) دەولەتی عوسمانیش پەیمانی جێ بەجێ کردنی بریاری ئەو لیژنە تایبەتەی دا کەبۆمەبەستی دەست نیشانکردنی سنوری دەولەتە ئوتونومیەکەی کوردستانی پێکهێنرابوون .(١٤١)

دەقی بەندەکانی تایبەت بەکورد ئەمانەبوون :. بەندی ٦٢ دەڵێت:

"کومسیونی ئەستەمبول لەسێ ئەندام پێکدێت کەحکومەتەکانی بەریتانیا ،فەرەنسا،ئیتالیا بەرەسمی دەستنیشانیان دەکات ،تاکو شەش مانگ دوای مۆرکردنی ئەم پەیمانە ئەم کۆمسیونە نەخشەیەك بۆخودموختاری مەحەلی ئەومەلبەندانە پێشکەش دەکات کەزۆربەی دانیشتوانی کوردەو کەوتونەتە رۆژهەلاتی چۆمی فورات وجنوبی ئەرمەنستان،کەدەکرێت لەمەودوا سنوریان بۆدیاری بکرێت،یان کەوتونەتە شیمالی سنوری نێوان تورکیاو سوریاو بەین ئەلنەهرین وەك لەفەقەرەکانی (٢-٧-٢٠)داهاتوون ئەگەر کۆمسیۆنەکەلەسەرمەسەلەیەك نەیتوانی بریارێکی تێکرا وەربگرێ ،هەرکام لەئەندامانی کومسیۆن مەسەلەکە لەگەل حکومەتی خۆی دێنێتە گۆرێ ،ئەو بەرنامە پارێزکاری تەواوی ئاشوریەکان وکەمایەتیە قەومی ورەگەزی دیکە لەمەلبەندەکاندا دابین دەکات ،بۆبەدیهێنانی ئەو ئامانجە کۆمسیونێك لەنوێنەرانی بەریتانیا ،فەرەنسا،ئیتالیا،ئێران،کوردەکان بۆپشکینین و بریردان لەسەرهەرچەشنە دەستکاریەك کەبەگوێرەی مەرجەکانی پەیمانی سنور تورکیا ئیمکانی هەبێت سەرلەومەلبەندانە دەدات ".

بەندی ٦٣

"حکومەتی تورکیا لەئێستاوە دەست بەرداری هەموو بریارەکانی ئەودوو کۆمسیونەی کەلەبەندی ٦٢دا باسکراون قبول بکاو هەتا سێ مانگ پاش ئەوەی راگەینرا جێ بەجێ بکات"

بەندی ٦٤

"ئەگەر تاساڵێك پاش ئیمزاکردنی ئەم پەیمانە کوردەکانی دانیشتوی ئەو مەلبەندانەی لەبەندی ٦٢دا دیاری کراوە بەئەنجومەنی کۆمەلەی نەتەوەکانیان

راگەیاند کەزۆربـەی دانیـشتوانی ئەومەلبەنـدە دەیانـەوێ لـەتورکیا جیاببنـەوە وئەنجومەنیش دانی بەوەنا کەئەوانە دەتـوانن سـەربەخۆ بـژین وتەوسـییەی کـرد کەسەربەخۆیان پێ بدرێت،تورکیا لەئێستاوە دەستەبەر دەبـێ کەئـەو تەوسـییە قبول بکا ولەهەموو حەقێکی خـۆی لەومەڵبەندانـە دەست هەڵدەگرێت،چۆنیەتی دەسـت بـەرداربوونی تورکیـا لەوماڤانـە بەدرێـژی لەپـەیمانێکی تایبەتیـدا بـاس دەکرێت کەلەنێوان تورکیاو هاوپەیماناندا دەبەسترێ،ئەگەر کوردەکانی ویلایـەتی موسـل بـەدڵخوازی خۆیـان ویـستیان بـچنە پـاڵ ئەوحکومەتـەوە ،هاوپەیمانـە گەورەکان هیچ چەشنە رێگری یەکیان ناکەن".(١٤٢)

بـەم شـێوەیە پەیماننامـەی سـیڤەر یەکـەم پـەیمانی نێودەولـەتی بـوو کەباسـی مافەکانی کـوردی کـردووە ،هاوپـەیمانان وەکـو کێـشەیەکی گرنگـی نێودەولـەتی مامەلەیان لەگەل کردوە و چەندین کۆبونـەوەو دانیـشتنیان ئـەنجام دا تـا بتـوانن بەرژەوەندیەکانی خۆیان لەگەل ئەو دۆزەدا یەك بخەن . ( ١٤٣ ) هەر چەندە ئەم پەیمان نامەیە کۆمەڵە هێمایەکی ئەرێنی تایبەت بـە نەتـەوەی کـوردی تێدا بـوو بەلاّم لەگەل ئەوەشدا هەندێك کەم و کـوری بەرچـاوی تێـدا بـوو ، سـەبارەت بـە ئایندەی ئەو دەوڵەتە پێشنیار کراوەی کورد ، هەر وەکو ( فوئاد حەمە خورشـید) دەلێت :" وەکـو کەشـتیەکی بـچوکی بەنـدکراو بـووە کەدەوڵـەتی چـاوەروانکراو دەبوایە هەردەم لەحالەتی بەرگری کردندا بوایـە بەرامبـەر بـەو ولاّتـە بەهێزانـەی دەوروبـەری"(١٤٤) لەپەیمانەکـەدا بـەپێ ی بەنـدی ٦٢ لـەمیکانیزمی پێـدانی ئوتونـومی دەدوێـت بۆبەشـێکی ناوچـە کوردیـەکان نـەوەك هـەموو ناوچـەی کوردستان ،کەکەوتوتـە رۆژهـەلاّتی فـورات وباشـوری هێلـی سـنوری ئـەرمینیا و باکوری هێلی سنوری تورکیا لەگەڵ سوریاومیسوپوتامیا.(١٤٥) لەگـەڵ ئەوەشـدا کەباسی ئوتونومی دەکـات کوردسـتانی رۆژهـەلاتی نەگرتۆتـەوەو بـاس نـەکراوە

،ئەودەولەتـــەی بـــەنیازی دروســـتکردنی بوونـــە لـــەژێر کۆمەڵـــە مـــەرجێکیان داناوە،لەبەرامبـەردا کـەباس لەسـەربەخۆیی وولآتـانی تـر دەکـات بـەبێ مـەرج سـەربەخۆییان پـێ دراوە .(١٤٦) هـەروەها لەپەیمانەکـەدا هـاتووە کـەدان بەسەربەخۆی ئەرمینیا دەنرێت بەو رووبەرەی کەهەیەتی ،لەکاتێکدا رووبـەرێکی زۆری ناوچە کوردیەکان کەوتبووە پاڵ ئەرمینیا وەکو ئەرزەرووم،تـەرابزوون،وان وبەتلیس، ئەم ناوچانە لەکوردستان دابرابوون وخرابونە پاڵ سنوری ئەودەوڵەتـە (١٤٧).

یـەکێکی تـر لەوکەمووکوریانـەی کەلـە پەیمانەکـەدا بـەدی دەکـرێ ئەوەیـە کەپاشماوەیەکی کورت لەراگەیاندنی بەندەکانی پەیمانەکە ،وولآتـانی بـەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیـا رێکـەوتنێکی سێ قولییـان بەسـت بەمەبەسـتی دابەشـکردنی ناوچەکوردیەکانی بـاکوری کوردسـتان لـەنێوان خۆیانـدا.(١٤٨) لەهـەمان کاتـدا ئەوبەندەی کەباس لەپاشەرۆژی کوردەکـان دەکـات بۆهاتنـە پـاڵ ئەودەوڵەتـەی کەبەنیازن دروسـتی بکـەن چـەند مـەرجێکی بۆدانرابـوو لەوانـە،دەبێت بۆمـاوەی ساڵێك لەژێر تاقیکردنەوە دابێت،کۆمەڵەی گەلان دەبێت رەزامەنـدی لەسـەر ئـەم یەکگرتنـــە دەربـبرێـــت و وولاتـــە هاوپەیمانـــە ســـەرەکیەکان نـــارەزایی دەرنەبرن،ئەمەش بەهۆکارێك دادەنرێت بۆتەگەرەخستنە بەردەم یەکگرتنەکـەو مایـــەی رەخنـــە گرتنـــە لەپەیمانەکـــە.(١٤٩) ئەوفەقەرەیـــەی تایبـــەت بـــوو بەکوردســـتانی بـــاکور لـــە بەنـــدی ٦٤دا جگـــە لـــەیاری یـــەکی بـــەریتانیا بـــۆ دامرکاندنەوەی شـۆرش وبزاڤـە سیاسـیەکانی کـورد لەناوچـەکە ،درێژکردنـەوەی ماوەی جێ بەجێ کردنی داواکاریەکانی کورد هیچی ترنەبوو،هەروەها جگەلەوەی کـە وەکـو کـارتێکی فـشار بـەکاری دەهێنـا بۆبەرژەوەندیـەکانی دژی حکومـەتی تورکیاوعێراق،بۆیە زۆرلە مێژوونوسـان ولێکۆڵـەران بەچـاوی گومانـەوە دەروانـنـە

پەیمانەکە.(١٥٠) لەوانە کریس کۆچێرا وەسفی پەیمانەکە بەوەدەکات "کە بەمردوویی لەدایك بوو،جگە لەکاغەزێکی بۆش وبەتاڵ هیچی تر نەبوو،نەیتوانی مەسەلەکانی رۆژهەلات چارەسەربکات،ئەگەرچی یەکەمین پەیمانە کەدان نانێکی جیهانی بوو بەبونی کورد".(١٥١)

لەگەڵ ئەوکەموو کوریانەی ئامارەمان بۆکرد کەلەپەیمانەکەدا هاتوون سەبارەت بەدۆزی کورد،ئەوا چەند هۆکارێکی دیاری کراویش هەبوون بۆئەوەی پەیمانەکە لەپال یەکتر هەڵبوەشێتەوەو ئامانجەکانی نەپێکێت لەچارەسەرکردنی کێشەکان ودۆزی کورد،لەوانەش ناکۆکی وململانێ لەنێوان باڵە سیاسیەکانی کوردو ساغ نەبونەوەی کورد لەسەربەرنامەیەکی دیاری کراو ویەککگرتوو بۆئایندەی کوردستان لەسەرداوای سەربەخۆی یان ئوتونومی لەگەڵ دەسەلاتدارانی عوسمانیدا، ناکۆکیگەورەیان لەنێوان کوردا دروست کردبوو.(١٥٢) یەکێك لەهۆرەکانی تر دەگەرێتەوە بۆئەوەی کاتێك پەیمانەکە راگەینرا ئەوا سوپای سولتان ئابلوقەی کەمالیەکانی دابوو لەئەنقەرەو زۆری نەمابوو بەسەریاندا زالبن،کاتێك پەیمانەکە راگەینرا دەسەلاتی سولتان سنورداركرا،لەبەرامبەردا کەمالیەکان کەبزوتنەوەیەکی نەتەوەیی تورك بوون،تازە سەریان هەڵدابوو،بەرەو بەهێزبوون هەنگاویان دەنا ،پەیمانەکە وەکو فریاد رەسێك بوو بۆیان وبووبە وروژاندنی رای گشتی لەتورکیا دژ بەسولتان.(١٥٣) ئەم بزوتنەوەیە تەکانێکی گەورەی بەبزوتنەوەی کەمالی دا بۆئەوەی بتوانن ئەوناوچانەی کەلەلایەن هێزە داگیرکەرەکان وهاوپەیمانان داگیرکرابوون ،رزگاریان بکات ومەترسی لەسەربەرژەوەندی هاوپەیمانان دروست بکات ،لەرێگەی خۆنزیککردنەوەیان لەرووسەکان ووروژاندنی هەستی نەتەوایەتی تورکەکان وتۆمەتبارکردنی سولتان بەوەی بۆتە یاریەك بەدەست ئینگلیزەکانەوەو فشارخستنە سەرهاوپەیمانان

بەوەی کەنارازین لەسەر بەندەکانی سیڤەرو ناچارکردنیان بەپاشگەزبوونەوە لەهەندێك لەبەندەکانی سیڤەر.(١٥٤)

جگەلەمانە فاکتەری نێودەولەتیش بێ بەش نەبووە لەکاریگەری خۆی لەسەر لەباریەك هەلوەشاندنەوەی پەیمانەکە ،لەمانەش رووسەکان پەیمانی سیڤەریان وەکو هەرەشەیەك دادەنا کەمەترسی دەخاتە سەرباشوری رۆژئاوای سۆڤیەت ودەبێتە هۆی ئابلوقەدانی ئامانجەکانی شۆرشی ئوکتۆبەر.(١٥٥) سۆڤیەت لەمەرامی بەریتانیای هاوپەیمانی گەیشتبوو کەدابەشکردنی ئەو ناوچانە بەتایبەتی کوردستان ،بۆئەوەیە کەبەریتانیا وەکو کارتێك بەکاریان بهێنێت وبتوانێت بەئاسانی تیایدا هات وچۆ بکات وکۆنترۆلی ئەو وولاتانە بکات ورێگاکانیبازرکانی وگواستنەوە بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە،بۆیە رووسیا بۆمەترسی دروستکردن لەسەر بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا هەلوێستی وەرگرت وکەوتە یارمەتی دانی کەمالیەکان،بەراشکاوی رایگەیاند کەدان نانێت بەبەندەکانی سیڤەرو پابەندنابێت بەبریارەکانیەوە.(١٥٦)

ئەمریکاش وەکو زلهێزێکی تر رۆلی هەبووە لەکۆنگرەی ئاشتیداو بەبێ زیان لەجەنگی جیهانی دەرچووبوو،گەورەترین وولاتیتەمویل کردنی قەرزی شەربوو،بەتایبەتی قەرزێکی زۆری بەدەولەتی عوسمانی دابوو،دوای سەرکەوتنی کەمالیەکان ئەمریکا هەولی پشتگیری حکومەتی تورکیای دەکردو هانی دەدا کە ویلایەتی موسل دەست بەسەردابگرێت،چونکەناوچەیەکی دەولەمەندی نەوتی بوو،ئەمریکاش لەم رێگەیەوە دەیویست یارمەتی کەمالیەکان بدات بۆسوود وەرگرتن لەم ناوچە نەوتیە،بەنیازی وەرگرتنەوەی ئەوقەرزانەی لەکاتی جەنگدا بەخشیبووی بەدەولەتی عوسمانی ،بەم شێوەیەمەترسی لەسەر بەریتانیا دروست بکات.(١٥٧)

ئـەم هۆکارانـە بوونـە رێگـر لەبـەردەم پـەیمانی سـیڤەر تـاکو نەچێتە بـواری پراکتیکیەوە،بـەلام بـۆدۆزی کـورد سـیڤەر وەکـو بەڵگەنامەیـەکی یاسـایی بـوو سـەبارەت بەزینـدوویی مەسـەلەی کـورد لەئەرشـیفی زلهێزەکاندا،ئەگەرچـی پەیمانەکـەوەکو مەرەکـەبی سـەرکاغەز مایـەوەو نەچـووە بـواری جـێ بـەجێ کردن،بەلام بوویە بەڵگەیەکی نێودەولـەتی لەسـەر بـەرەوپێش چـوونی دۆزەکـەو بایـەخی خـۆی هەبوولـە وێنـاکردنی سیاسـەتی وولاتـان بەرامبـەر بـە بزاڤـی رزگایخوازی کورد کەنەکرێت فەرامۆش بکرێت.(١٥٨) هـەروەها پەیمانەکـە بـەپێ ی بەندەکانی کەدانی نابوو بەناوچە دیاری کراوەکانی کەلەبەندەکانی (٦٢-٦٣-٦٤)دا هاتوون ئەوا بەدەستکەوتێکی مێژووی دادەنرێت بۆ گەلی کورد،بۆ یەکەمین جـارە بـەپێی پـەیمانێکی نێودەولـەتی مـافی داننـانی قەوارەیـەکی سیاسـی وسەربەخۆیی تایبەت بۆ کورد سەلماندووە بۆیـە سیاسـەتمەدارانی کـورد دەبێـت بایـەخی ئـەم بریارانـە لەبەرچـاو بگرن،بایـەخی سیاسـی ویاسـایی پەیمانەکـە فەرامۆش وپشتگوێ نەخەن.(١٥٩)

تەوەرەی سێیەم:. دۆزی کورد لەسیڤەرەوە بەرەو لۆزان (١٩٢٠-١٩٢٣ز)

یەکەم: دەرکەوتنی مستەفا کەمال وهەڵوێستی بەرامبەر بەدۆزی کورد.

گـۆرانی هەڵوێـستی هاوپـەیمانان وهاتنـە پێـشی چـەند پێـشهاتێك لەسەرئاستی هەرێمی ونێودەوڵەتی دا رێخوشکەربوون بۆ هاەپـەیمانان کەچاوێك بەبەنـدەکانی سـیڤەردا بخـشێنەوەو چـەند دەسـتکاریەکی مەترسـیداری تێدابکەن،کەکاریگـەری لەسەرچارەنوسـی دۆزی کـوردو کێـشەرەوایەکەی پەیدابکەن،لەدیارترینیشیان دەرکەوتنی بزوتنەوەی نەتەوەیی تورك بووکـەتوانی سەرکەوتنە یەك لەدوایەکەکانی بەسەر هاوپەیمانان بەدەست بهێنێت وناچاریان

بکات چاوپێداخشانێك بەسیاسەتەکانیاندا بکەن.(١٦٠) فراوانبوونی دەسەلاتی کەمالیەکان لەناوچەکانی ئەنادۆڵ بەپاڵپشتی رووسەکان رێخۆشکەربوو بۆ بڵاوبوونەوەی بەلشەفیەکان لەرۆژهەلاتی ناوەراست ودروستکردنی مەترسی بۆسەر پێگەی هاوپەیمانان لەناوچەکەدا بەتایبەتی دوای دەست بەسەرداگرتنی ئەرمینیا لەلایەن رووسەکان لەسالی١٩٢٠ز هۆکاربوو بۆئەوەی فەرەنساوئیتالیای هاوپەیمانی بەریتانیا بووچونیان بگۆرن لەبارەی کەمالیەکان وهەولی خۆنزیك کردنەوە بدەن ورێکەوتنی دووقۆلی لەگەڵ کەمالیەکان مۆربکەن.(١٦١)

بەریتانیا بۆئەوەی بەرژەوەندیەکانی نەکەوێتە مەترسیەوەو زۆرترین دەسکەوت ولەبارترین پێگەی هەبێت ،بەشێوەیەك رێگە لەرووسیای کۆنەدوژمنی وفەرەنساوئیتالیاوئەمریکای هاوپەیمانی بگرێت لەرۆژهەلاتی ناقین وکوردستاندا،هەروەها بەکارهێنانی کەمالیەکان وەکو داردەستێك بوبەدیهێنانی مەرامەکانی .(١٦٢)

ئەوبارودۆخەی بەسەرکوردستاندا هات لەئەنجامی دەرکەوتنی کەمالیەکان ،جێگای خۆیەتی باس لەهەلوێستی کوردبکەین لەوجولانەوەیەدا رۆلی کورد بەدیاربخەین،مستەفاکەمال بۆیەکەم جار لەمایسی ١٩١٩ز لەسەرشانۆی سیاسەت بەدیاردەکەوێت ،کاتێك لەلایەن (باب العالی)یەوە وەکو پشکێنەری سوپای سێیەم لەرۆژهەلاتی ئەنادۆل دا دەست بەکاردەبێت ،ناوبراو پلانێکی گەورەی بەدەستەوەبوو بۆرزگارکردنی تورکیای دۆراو ودەرکردنی هێزەداگیرکەرەکان لەسەرخاکەکەی.(١٦٣)مستەفاکەمال بۆبرەودان بەشۆرشەکەی هەولیدا خۆی لەسەرانی کورد نزیك بکاتەوە،بۆئەم مەبەستەش چەندکۆبوونەوەیەکی لەناوچە کوردیەکان لەگەڵ سەرۆك هۆزەکان ئەنجامداو چەند بەلێنێکی پێیاندا بۆئەوەی پشتگیری لەشۆرشەکەی بکەن.(١٦٤) هەروەها بەهۆی پۆشینی شۆرشەکە

بەبەرگێکی ئاینییەوە سەرنجی کوردەکانی راکێشا بۆپاڵپشتی کردنی مستەفاکەمال وچوون بەپیل بانگەوازەکەی وناردنی نوێنەر بۆئەو کۆبونەوەیەی کەبەنیازبوون لەکوردستان رێکی بخەن،بەلام لەگەل ئەوەشدا بەشێکی سەرانی کورد نەچوونەژێربالی بانگەوازەکەو دەستیان بەبیرۆکەی سەربەخۆی کوردستانەوە گرت.(١٦٥) سەرانی بزوتنەوەکە لەئەرزەرووم لە(١٠-٢٣)ی تەمووزی١٩١٩زکۆنگرەیەکیان بەست بەئامادەبونی ژمارەیەکی زۆرلەسەرکردە کوردەکان ،بابەتی سەرەکی کۆنگرە پێکهێنانی ئەنجومەنی بالای مللی وبریارەکانی میساقی میللی بوو،لەبەندێکیدا جەخت لەسەرپاراستنی ماڤی کەمەنەتەوەییەکانی تێدابوو،پاشان بریارەکانی کۆنگرە ناردران بۆسەرۆك هۆزوشێخ وکەسایەتیە ناودارەکان.(١٦٦) بەلام کوردەکان لەهەمبەر داخوازی وبریارەکانی ئەرزەرووم یەك هەلوێست نەبوون بەتایبەتی کەکۆنگرە رازی نەبوو لەسەرپێك هێنانی سوپایەکی سەربازی لەکوردستان بۆپارێزگاری ناوچەکە،هەروەها رێگەگرتن لەسەر سەرهەلدانی هەربزوتنەوەیەك بەناوی کوردوبۆداخوازی مافی کورد،بەشێك لەکوردەکان وایان بەچاك دەزانی کەپالپشتی کەمالیەکان بکەن وداخوازیە نەتەوەییەکانیان دوابخەن بۆپاش سەرکەوتنی شەری رزگاری تورکیا،بەلام بەشە هەرەزۆرەکەی سەرانی کورد لەگەلّ ئەوەدابوون کەلە رێگەی کۆروکۆبونەوە نێودەولەتیەکان ماف وداخوازیەکانیان بخەنەروو وچارەسەربکەن لەسەرووی هەموشیان کۆمەلەی تەعالی کوردستان وبنەمالەی بەدرخانیەکان.(١٦٧)پاشان لەئەیلولی ١٩١٩ز دا کۆنگرەی سێواس بەسترا ئەوبریارانەی لەئەرزەرووم درابوون زیاتر قوولبونەوەو ماهیەتی کەمالیەکان بەدیرکەوت ومافی کەمەنەتەوایەتیەکان بەتەواوی پێشێلکرا وبریاریاندا بۆهەموو کاربەدەستانی تورك لەکوردستان بەتوندی بەربەرەکانی

هەموو چالاکی یە نەتەوەییەکانی کورد بکەن وکۆمەڵەی تەعالی وسەرجەم ڕێخراوە کوردیەکان دابخەن.(١٦٨) مستەفاکەمال بۆهێنانەدی ئامانجەکانی دووریگەی گرتەبەر لەبەرامبەرکوردەکان،لەلایەك کوردەکانی بۆلای خۆی رادەکێشان بەپروپاگندەی ئەوە کەرزگارکەری کوردەکانەو داکۆکی لەخاکی موسڵمانان دەکات،دژی داگیرکەران وەپێداگری دەکردلەسەر برایەتی کوردوتورك،لەلایەکی ترەوە هەوڵی سەرکوتکردن ولەناوبردنی بزاڤەکوردیەکانی دەداکەدەبوونە بەربەست لەبەردەم ئامانجەکانی.(١٦٩)بریارەکانی ئەرزەرووم وسێواس بوون بەبنەمای دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتمانی لەسالی ١٩٢٠ز،لێرەوە کەمالیەکان کەوتنە پشتگوێ خستنی بەڵێنەکانیان،بوونە ریگروکۆسپ لەبەردەم پرسی کوردوچەند یاسایەکیان دەرکرد کەتیایدا هاتووە هەرجولانەوەیەك یان بلاْوکراوەیەك دژی خواستەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی بێت ئەوا بەتاوان وخیانەتی نیشتمانی دادەنرێت.(١٧٠) بۆئەم مەبەستەش بروسکەیەکی نهێنی بۆجێگری والی دیاربەکر دەنێرێت وتێیداهاتووە کەپێویستە ماوەنەدرێت بەهیچ کۆروکۆمەڵەو رێخراوێك وبلاوکراوەیەك کەکاربۆ نانەوەی دوبەرەکی بکات دەبێت لەناوبرێت.(١٧١)

دوای ئەوەی کەجولانەوەی کەمالی شوێن پێیان قایم کرد بۆسەرکوتکردنی داخوازی کورد چەند یاسایەکی رەگەزپەرستی دەرکرد کەدەسەلاتیان بەخۆیان دەدا زۆربەتوندی دژی جولانەوە رزگاریخوزەکانی کورد مامەلەبکەن وسەرکوتیان بکەن.(١٧٢) سەرکەوتنە گەورەکانی مستەفاکەمال هەلوێستی زلهێزەکانی بەروخۆی راکێشا کەوەکو دەسەلاتێکی راستەقینە مامەلەی لەگەڵ بکەن وکەوتنە واژووکردنی پەیماننامە لەگەڵ رووسیا ،لەپەیمانەکەدا هاتووە کەرووسیای سۆڤیەتی هاوکاری پێشکەش بەتورکیا دەکات ودان نانێت بەهیچ

سنورێك کەپەیوەندی بەتورکیاوەهەیە جگەلەوسنورەی کەلەکۆنگرەی نیشتمانی تورکیادادهاتووەو دیاریکراوە.(١٧٣) سەرەرای ئەمەش رووسیا بەرهەلستی لەهەموو بزوتنەوەیەکی جوداخوازی دەکات کە مەترسی دەخاتە سەرئاسایشی ئەو وولاتە ،یارمەتی دارایی وسەربازی پێشکەش بەسوپای تورکیا دەکات.(١٧٤) ململانێی زلهێزە سەرکەوتوەکانی شەر بەتایبەتی روسیاوفەرەنساوبەریتانیا بۆدەستکوتنی زۆرترین ناوچەی پرخێرو بێری رۆژهەلاتی ناوین ومسۆگەرکردنی بەرژەوەندیە سیاسیەکانیان،هەریەکەو لەلای خۆیەوە هەولی دەدا پشتگیری خۆی بۆ جولانەوەکەی مستەفاکەمال دەربرێت ،دۆزی کوردیش کەوتبووە چەقی ئەم بەرژەوەندیانە ،بۆیەهەریەکە دەیویست سازش بەدۆزی کوردبکات ولەبەلێنە پێدراوەکانی پاشگەز ببێتەوە،بۆیە دەرکەوتنی بزوتنەوەی کەمالیەکان گەورەترین گوورزبوو بەدۆزی کورد کەوت،پرسە هەلپەستراوەکانی کوردی هەموو هەلوەشاندەوە.(١٧٥)

دووەم : کۆنگرەی لەندەن ودۆزی کورد

دبلۆماسیەتی بەریتانیا بەدروشمی کوردستانی سەربەخۆ تاکۆتای سالی ١٩٢١ز لەکۆنگرە نێودەولەتیەکاندا دەدرەوشایەوە ،بەلام لەکۆنگرەی لەندەندا کەلەبەرواری ٢٤ی شوبات تاکو ١٤ی ئاداری ١٩٢١زبەستراو ٦مانگ دوای پەیمانی سیڤەر گرێ درا ،بەشێوەیەکی روون وئاشکرا هەلوێستی بەریتانیا بەرامبەر بەکوردستان بەدیاردەکەوێت کەتاچەند لەبەلێنەکانی پاشگەزبۆتەوە.(١٧٦) ئەمەش لەیاداشتەکانی تۆسبۆرون کەکارگێربووە لەبەرێوبەرایەتی رۆژهەلات ،باس لەپێویستی لابردنی بەشە کوردیەکە دەکات لەتێکستە نوێ یەکەی پەیماننامەی داهاتوودا لەگەل تورکیاو گۆرینی بەبەلێندانی تورکیا بەبەخشینی

شێوەیەك لەشێوەکانی بەڕێوبەرایەتی خۆیەتی بەکوردەکان ،ئەویاداشت نامەیە بەبەڵگەیەکی گەورەی سیاسەتی بەریتانیای ئەوکات دادەنرێ کە ویستویانە کێشەی کورد کپ بکەنەوەو بخزێننەوە ژێر باڵی تورکیا.(١٧٧) جێگای ئاماژەیە کۆنگرەکە بۆچاوپێداخشاندن بووە لەبرگەکانی پەیمانی سیڤەر ،هاوپەیمانان رایانگەیاند کەلە ئامادەباشیدان بۆئەوەی کەپەیوەندی بەکوردستانەوە هەیە بۆپێداچوونەوەو هەموارکردنی پەیمانی سیڤەر لەژێر رۆشنایی تێگەیشتن لەراستیەکانی هەلْ ومەرجی پێشوو.(١٧٨)کۆنگرەکە لەنێوان هاوپەیمانان وناسیولیستە تورکەکان بەسترا لەلەندەن ،نوێنەری (حکومەتی ئەستەمبول)* بۆکۆنگرەکە بانگهێشت کرا،بەلأم نوێنەری کەمالیەکان سووربوو لەسەردەرکردنی نوێنەری ئەستەمبول ،هەروەها ئەوەشی رەتکردەوە کەلەسەر بنچینەوبنەماکانی پەیمانی سیڤەر دانوستان بکەن.(١٧٩) سەبارەت بەهەلوێستی کوردیش لەوکاتەدا ئەوا هەولی نەتەوەخوازانی کورد لەئەستەمبولْ لەئارادا بوو ،بەتامەزرۆیەوە چاودێری پەرەسەندنەکانیان دەکرد بۆئەوەی بەریتانیا بریاری بالأدەستی کەمالیەکان نەدەن وپابەندی بەندە تەرخانکراوەکانی سیڤەربن کەتایبەتن بەکورد،لەکاتی چاوپێکەوتنی شاندی کورد لەگەلْ رێگەپێدراوی بالأی بەریتانیا لەئەستەمبولْ ،شاندی کوردی ئەوەی رەتکردەوە کەئەوشاندەی نوێنەرایەتی ئەنقەرەدەکات ،هیواوئاواتی کورد بخاتەروو،هەروەها نیگەرانی خۆیان دەربری لەپاشگەزبوونەوەی هاوپەیمانان لەبریارەکانیان،ئەوەشیان رەتکردەوە کە گۆرانکاری لەمادەی ٦٤ی سیڤەردا بکرێت.(١٨٠)

لەکاروباری کۆنگرەکەدا بەوردی هەلوێستی هاوپەیمانان ئاشکرابوو بەتایبەتی لەسەرمەسەلەی کورد وسەربەخۆیان کەهەلوێستیان لەسەربەخۆی گۆردرا بۆئوتونومی ناوخۆیی ،شاندی حکومەتی تورکیا ئەوهەڵەی قۆزتەوە ورایگەیاند

کەحکومـەتی ئەنقـەرە ئامادەیـە پێـشوازی لەلیژنەیـەك بکـات کەلەکوردسـتاندا راپرسـی ولێکۆلینـەوە بکـات وحکومـەت رازی دەبێـت بـەخودموختاری بۆئـەو ناوچـانەی کەزۆرینـەی کـوردن.(١٨١)لەگـەڵ ئەوسـەرکەوتنەی تورکـەکان بەدەستیان هێنـا لـەرووی سیاسـی وبەدەسـت خـستنی هەلوێـستی نێودەولـەتی وگۆرینی هەندێك لەبەندەکانی سیڤەر بۆبەرژەوەندی خۆیان ،بەلام هەموو ئـاواتی تورکەکانی نەهێنایە دی بۆیەکۆنگرەکە زیاتر ئـالۆزی لـەنێوان تورکیـاو بـەریتانیا دروسـتکرد ،هـەروەها زیـانی گەورەشـی بـەدۆزی کوردگەیانـد بۆیـە نەگەیـشتنە بریـاری کۆتـایی.(١٨٢)کەمالیـەکان پێـداگریان لەسـەر داواکاریـەکانیان داگـرت ،هـەروەکو مـستەفاکەمال لـە یاداشـتەکانیدا نووسـیویەتی :بـەگوێرەی پـەیمانی سیڤەر دەبوایە ئێمـە بەرهەلـستی لەسـەر هـیچ نـەنوێنین بـەلام لـەم کۆنگرەیـەدا شاندی ئێمە وەلامیبەرهەڵستکاریان لەسەر هەموونەمانەدایەوە.(١٨٣) تەنانەت تورکـــــەکان زۆرداواکاریـــــشیان پێـــــشکەش کرد،لەوانـــــەش داوای کەمکردنەوەیئابلوقەیان کرد هـەروەها داوای فراوانکردنـی نیـشتەجێ کردن،ئـەو پێداگریەی تورکەکان ناکۆکی خستە ناو هاوپەیمانانیش.(١٨٤)کۆنگرەی لەنـدەن سـودێکی گـەورەی بەکەمالیـەکان گەیانـد ،وای کردکەپەیوەنـدی دروسـت بکـەن لەگەڵ وولاتـە دەسـەلاتدارەکانی وەکـو بـەریتانیاو فەرەنـسا وئیتالیـاو ناچـاریان بکـەن کەمامەلـەی نێودەولـەتی وفـەرمییان لەگـەڵ ببەسـتن ،لەلایـەکی تـرەوە لێدانێکی کوشندەی بەدۆزی کورد گەیاندو سـەرەتایەك بـوو بۆبەسـتنی پـەیمانی لۆزان.(١٨٥)

## سێیەم: کۆنگرەی قاهیرەو دۆزی کورد

خراپی پیادەکردنی سیاسەتی بەریتانیا لەعێراق وناوچەکە دەرئەنجامی خراپی لێکەوتەوە لەلایەن خەلکەوە،لەوانە بەرپابوونی شۆرش لەخوارووی عێراق وشۆرشی شێخ مەحمود بەرزنجی لەسالی ١٩١٩ز ،ئەمانە بوونەجێگەی شکستی سیاسەتی بەریتانیا لەناوچەکە ،لەناوخودی بەریتانیاش هەلمەتێکی بەرفراوان لەئارادابوو کەداوای کەم کردنەوەی تێچونی خەرجی سەربازیان دەکرد،بۆیە بەریتانیا هەولیدا بەمەبەستی دارشتنەوەی سیاغەیەکی نوێ بۆسیاسەتەکانی لەرۆژهەلاتی ناوین وعێراق دا بریاری بەستنی کۆنگرەی قاهیرەی دا.(١٨٦)لە١٢ تا ٣٠ی ئاداری ١٩٢١ز بەسەرۆکایەتی ونستون چرچل کۆنگرەکە لەقاهیرەبەسترا بۆدیاریکردنی چارەنوسی عێراق وهێزەکانی بەریتانیا لەناوچەکە.(١٨٧)کۆنگرەکە بەئامادەبونی سێر پرسی کۆکس مەندوبی سامی بەریتانیا لەعێراق وجنرالّ هالّدن سەرکردەی هێزەکانی بەریتانیا لەعێراق و دووراوێژکاری ئینگلیزی لەوەزارەتەکانی عێراق،هەریەکە لەجەعفەرعەسکەری وەزیری بەرگری لەحکومەتی کاتی عێراق وساسون حسقیل وەزیری دارایی بەشداریان لەکۆبونەوەکاندا کرد.(١٨٨)تەوەرە سەرەکیەکانی کۆنگرەکە لەچوارباسی سەرەکی دەخولایەوە کەبریتی بوون لە:

١-کەمکردنەوەی خەرجی سەربازی بەریتانیا لەعێراق.

٢-دیاری کردنی کەسایەتیەك بۆتەختی پاشایەتی عێراق.

٣-مەسەلەی کوردو پەیوەندی بەعێراق.

٤-لەشکری داهاتووی عێراق.(١٨٩)

ئەوەی لەکۆنگرەکە تێبینی دەکرێت سەبارەت بەکورد ئەوا هیچ نوێنەرێکی کورد بانگهێشت نەکرابوو،هەرچەندەش کەمەسەلەی کورد لەعێراقدا بابەتێکی سەرەکی کارەکانی ئەم کۆنگرەیەبوو.(١٩٠) بەریتانیا میر فەیسەل کوری شەریف حوسەینی دەستنیشان کرد بۆتەختی پاشایەتی عێراق،مەبەستیش لەم کەسایەتیە بۆدەستەبەرکردنی ئامانجە ستراتیژیەکانی بوو کەبریتی بوولەناوچە دەولەمەندەکانی نەوت،چونکە میر فەیسەل کەسایەتیەکی گوێ رایەل وپاڵپشتی کارێکی باشی بەریتانیا بوو.(١٩١)

لە٢٢ی حوزەیرانی ١٩٢١زفەیسەل گەرایەوە عێراق وگەیشتە بەسرەو لە٢٣ی ئابی ١٩٢١ز تەختی پاشایەتی وەرگرت ،بەریتانیاش بۆئەوەی مەسەلەی پاشایەتی فەیسەل قالبێکی دیموکراسیانەو شەرعیەتی پێبدات هەلسا بەئەنجامدانی راپرسیەك بۆهەلبژاردنی فەیسەل ورەوایی بەخشین بەکردەوەکانی دەولەتی بەریتانیا لەعێراق.(١٩٢)لەراپرسیەکەدا کوردەکان رای جیاوازیان هەبوو ،خەلکی کەرکوك دژی دانانی فەیسەل دەنگیان دا وخەلکی سلیمانی بەشداریان لەراپرسیەکەدا نەکرد.(١٩٣)هەرچی خەلکی هەولێرە بەپێچەوانەی ناوچەکانی تری وەکوسلێمانی وکەرکوك دەنگی رەزامەندیان بۆفەیسەل دا بەلام بەومەرجەی کەکارگێریەکی کوردی مەلبەندەکە بەرێوەببات وەك ئەوەی لەپەیمانی سیڤەردا هاتووە،ئەوهەلوێستەی خەلکی هەولێریش بۆچەند هۆکارێك دەگەرایەوە،لەوانە راوێژکارە بەریتانیەکان هانی خەلکی هەولێریان دەدا کەبەپاشایەتی فەیسەل رازی بن،هەروەها رۆلی چەند کەسایەتیەکی ناوداری شاری هەولێروپەیوەندیان لەگەل بنەمالەی شەریف حوسەین رۆلیان هەبوولەسەرخستنی راپرسیەکە،ئەوەجگە لەفاکتەری ئابووری کەزیاتر بازرگانی هەولێرلەگەل ناوچەکانی بەغدادا هەبووە.(١٩٤)

هەرچەندە لەکۆنگرەی قاهیرەدا مەسەلەی کوردستان ودۆزی کورد لەژێر ڕۆشنایی ئەو دەستکاریانەی کەبەنیازبوون لەسەر بەندەکانی سیڤەردا بکرێت خرانەروو،جەخت لەسەر ئەوەکراوە کەناوچەکانی کوردستانی باشوورکەبەویلایەتی موسل ناسرابوو،ناوچەیەکی سەربەخۆ بمێنێت ونەخرێتە سەرئەودەولەتە عەرەبیەی کەبەنیازن دروستی بکەن لەعێراق،بەلام لەبەلێنەکەیان راستگۆ نەبوون.(١٩٥) هەروەها چەند بیروڕایەکی جیاواز لەکونگرەکە خرانەروو بۆ مەسەلەی کوردستان ،لەوانە (پرسی کۆکس)پێداگری لەسەرئەوە داگرت کەویلایەتی موسل بەشێکی جیانەکراوە بێت لەعێراق،بەبۆچونی میجەرنۆئێل دوروست کردنی دەولەتێکی کوردی بەبێ دواخستن باشترە وئەودەولەتەش لەژێرچاودێری راستەوخۆی بەریتانیا بێت وجیاکراوە بێت لەعێراق.(١٩٦)بەبۆچونی مسس بێل جاکردنەوەی کوردستانی باشور لەعێراق بەومانایە دێت کەناوچە نەوتیە دەولەمەندەکان دەکەونە ژێر دەسەلاتی تورکیاو مەترسی دروست دەبێت بۆسەر کێلگە نەوتیەکانی کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی لەباشوری ئێران،ئەوەجگە لەوەی کەکوردستانی باشور بخرێتە سەرعێراق دەبێتە بەربەستێك وبەرگریەك بۆپاراستنی سنوری عێراق ولەمپەرێك دەبێت لەبەردەم کشانی تورکەکان بۆناوچە دەشتاییەکانی عێراق.(١٩٧) بەبروای وینستون چەرچەل پێدانی حوکمی ئوتونومی تەواو بەکوردەکان بەباش دەزانێت چونکە پێی وابوو ئەوناوچە دابراوە لەنێوان دەولەتی عێراق وحکومەتی تورکیا دەبێتە پارێزەر بۆبەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لەمەترسیەکانی تورکیا لەلایەنی دەرەوەو بزاڤە سیاسیە ناوخۆیەکانی عێراق لەلایەنی ناوەوە، هەروەها رای وابوو کەدەولەتی عێراق پاش دروست بوونی دەبێتەهۆی چەوساندنەوەی کەمایەتیە نەتەوەییەکانی لەرێگەی سوپایەکەیەوە،کوردەکانیش یەکێك دەبن

لەوكەسایەتیانە كەدەكەونە ژێرچەوساندنەوە ،بۆیە پێدانی حوكمی ئۆتۆنۆمی سەربەخۆ بەكوردەكان رێگردەبێت لەبەردەم تێكچونی بارودۆخی ناوخۆی عێراق وپاراستنی بەرژەوەندیەكانی بەریتانیا.(١٩٨)

هەرچۆنێك بێت لەكۆنگرەكە بریاردرا كەفەیسەل بكرێتە پاشای عێراق ولە٢٣ی ئابی ١٩٢١زلەرێورەسمێكی گەورەدا بەئامادەبونی نوێنەری سەرجەم چین وتوێژەكان ونوێنەری شارەكان تاجی پاشایەتی لەسەری میر فەیسەل نراو عێراق بووبەدەولەتێكی پاشایەتی ولەراپرسییەكدا ٩٦ ٪ی دەنگەكان بەپاشایەتی میر فەیسەل رازی بوون.(١٩٩)

دۆزی كورد پاش ئەوەی میر فەیسەل تاجی پاشایەتی لەسەرنا بەرەوگرژی هەنگاوی نا ،دوای چوارهەفتە لەوەرگرتنی دەسەلات شافەیسەل بەشێوەیەكی روون وئاشكرا رایگەیاند كەنایەوێت هیچ ناوچەیەكی كوردی لەژێردەسەلاتی جودابێتەوە وەك ئەوەی لەپەیمانی سیڤەرداهاتووە.(٢٠٠) چونكە بوونی كورد بۆشافەیسەل گرنگی یەكی لەرادەبەدەری هەبووبۆهاوسەنگ كردنی تەرازووی پێكهاتەی سونەكان لەبەرامبەر بالادەستی شیعە لەعێراقدا،هەروەها ترسی ئەوەی هەبووكە پێدانی سەربەخۆی بەكوردەكانی عێراق ئەوا پەیوەندی لەگەل كوردەكانی ئێران وتوركیادا دەبەستێ ئەوەش مەترسی دروست دەكات بۆسەرعێراق.(٢٠١)

بەم شێوەیە كۆنگرەی قاهیرە نەگەیشتە چارەسەرێكی كۆتایی بۆكێشەی كورد جگە لە دانانی فەیسەل بەشای عێراق وفەرامۆشكردنی داخوازیەكانی كورد كەلەقۆناغەكانی دوایدا رەنگدانەوەی دیاری بەسەرمێژووی عێراقدا نواند.(٢٠٢) بەریتانیا هێشتنەوەی كێشەی كورد بەچارەسەرنەكراوی وئالۆزی لەكۆنگرەی قاهیرەدا وەكو سیاسەتێك بەكاری دەهێنا بۆفشار خستنە سەرحكومەتی

عێراق،هەرکاتێك دەولەتی نوێی عێراق بەپیل بەرژەوەندی وداخوازیەکانی بەریتانیاوە نەهات ئەوا کێشەی کوردوسەربەخۆیی کوردستان وەکوکارتێکی فشار بەکاربهێنێت بۆچاوترساندنی دەسەلاتدارانی حکومەتی عێراق.(٢٠٣)

تەوەرەی چوارەم: دۆزی کورد لەکۆنگرەی لۆزاندا

کۆنگرەی لۆزان لە٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ز لەشاری لۆزانی سویسری بەستراو بەردەوام بوو بەشێوەیەکی پچرپچر تاکو ٢٤ی تەمووزی ١٩٢٣ز ،ئەو ووڵاتانەی بەشداربوون بریتی بوون لە بەریتانیا،فەرەنسا،ئیتالیا،رۆمانیا،یوگسلافیا،یونان،تورکیا وەرێگەدرا بەبەلجیك،پرتوگال، سوید،دانیمارك بەشداربن لەکاتی کفتوگۆکان لەسەرمەسەلەی دارایی وئابوری،هەروەها روسیاو بولگاریا لەکۆبونەوەکانی پەیوەندی دار بەمەسەلەی گەرووەکان ئامادەبوون.(٢٠٤)هەرچەندە چارەنوسی کورد بەکۆنگرەکەوە بەسترابوو بەلام نوێنەریان بانگهێشت نەکرابوو،هەروەها نوێنەری عەرەب وئەرمەنیش بەهەمان شێوە.(٢٠٥)هاوپەیمانان لەکۆنگرەکەدا پشتیان لەبەڵێنەکانیان کرد بۆیە تورکەکانیش بەرامبەر بەکورد لەجاران زیاتر خۆیان گورج کردو هەولیاندا کەهەموو ئاواتەکانی کورد سەبارەت بەگەیشتن بەماڤە نەتەوایەتیەکانیان پوچەل بکەنەوە..(٢٠٦) چەند فاکتەرێکی ناوخۆیی ونێودەولەتی کەدژی بەرژەوەندی کوردبوون بونە هۆی سەرکەوتنی کارەکانی کۆنگرەی لۆزان،لەوانەش سەرکەوتن وپەرەسەندنەکانی کەمالیەکان ولەناوچەکانی قەڵمرەوی بەریتانیا کەسوپایەکی تورکەکان بەسەرکردایەتی (ئوزدەمیر) ناردرایە ناوچەی رەواندزو توانی پشتگیری کوردەکان بۆخۆی دەست بخات.(٢٠٧) کوردەکانی عێراقیش بەهۆی پەراوێزخستنیان لەلایەن بەریتانیاوە

بەتایبەتی دوای کۆنگرەی قاهیرەو دانانی شافەیسەل هەروەها دوورخسنەوەی شێخ مەحمود بۆهیندستان ،ئەوا کوردەکانی بێ ئومێدکردبوو لەبەریتانیا وهاندەربوو بۆ چوونە پاڵ تورکەکان.(٢٠٨) بەریتانیا بۆئەوەی بەرژەوەندیەکانی نەکەوێتە مەترسییەوە هەولیدا کەکوردەکان لەخۆی رازی بکات ،بۆئەومەبەستەش بریاری گەرانەوەی شێخ مەحمودی دەرکرد ،هەروەها لەگەل حکومەتی عێراقی بەیانێکی رەسمییان دەرکرد کەدان بەمافی کورد دادەنێن وحکومەتێکی کوردی لەچوارچێوەی عێراقدا پێکدەهێنن.(٢٠٩)کەمالیەکان دوای بەستنی ئاگربەستی (مودانیا)لەگەل ولاتانی بەریتانیاو فەرەنساوئیتالیاویونان.لەتشرینی دووەمی ١٩٢٢ز ئەوارژێمی سەلتەنەتیان رەتکردەوەو هەموو دەسەلاتێکیان کەوتە دەست ،ئەنجومەنی نیشتمانی گەورەی تورك رایگەیاند ئەوان دەسەلاتی شەرعین وحکومەتی ئەستەمبول هیچ شەرعیەتێکی نەماوە ،هەروەها داوای گەرانەوەی هەموو خاکە دابراوەکەی تورکیایان دەکرد.(٢٠١)لەگەل دەستپێکردنی کفتوگۆکان لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ز( لۆردکێرزۆن )ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا و( عیسمەت ئینونو)ی شاندی تورکیا لەکۆبونەوەکەدا بەشاندی بەریتانیایان راگەیاند کەهیچ پابەندبونێکیان بەپەیمانی سیڤەرەوە نەماوەو داوای هەموو ویلایەتی موسلیان کرد تاکو سنوری چیای حەمرین لەباکوری عێراق.(٢١١) جەعفەر عەسکەری وەزیری دەرەوەی عێراق ونوێنەری حکومەتی عێراق لەکۆنگرەکەدا بەشداری کرد،بەریتانیاش رایگەیاند کەعەسکەری وەکو راوێژکاری بەریتانیا کاردەکات بۆهاوکاری شاندەکەیان لەمەسەلەی سنوری عێراق وتورکیا،عەسکەریش لەلای خۆیەوە رایگەیاند کەوازهێنان لەهەرپارچەیەکی باشوری کوردستان رێگەبۆدەست تێوەردانی تورکیا خۆش دەکات.(٢١٢)

داواکاری تورکیا بۆ ویلایەتی موسل لەسەرچەند بنچینەیەك وهۆکارێك بووە ،لەوانە لەرووی رەگەزیەوە تورکیا دەیووت کە کوردوتورك لەیەك رەگەزن وزۆرینەن لەموسل بەلام عەرەب کەمینەن، لەرووی ئابوریەوە ویلایەتی موسل هەمووبازرگانیەکەی لەگەل ئەنادۆڵدایە، لەرووی سیاسیەوە رایانگەیاند کەبەریتانیا موسلی دوای ئاگربەستی مۆدروس داگیرکردووە،بۆیە دانیشتوانی ناوچەکە خۆیان دەیانەوێت بگەرێنەوە سەرتورکیا.(٢١٣)بەلام لۆردکێرزونی شاندی بەریتانیا هەموو پێشنیارەکانی شاندی تورکی رەتکردەوەو جەختی کردەوە کەویلایەتی موسل لەرووی رەگەزییەوە ناوچەکە زۆرینەی کوردن ولەرەگەزی هیندوئەورووپین وجیاوازن لەرەگەزی تورك،هەروەها بازرگانی ناوچەکە زۆرینەی لەگەل عێراقدایە نەوەك لەگەل ئەنادۆل،هەروەها لەرووی سیاسیەوە ئەوا کۆمەلەی گەلان دانی ناوە بەماندات بەریتانیا بەسەرناوچەکەدا ،کوردەکان بەهیچ شێوەیەك رازی نین بەشێك بن لەتورکیا بەبەلگەی ئەوەی کەکورد بەردەوام شۆرشی دژی تورك ئەنجامداوە.(٢١٤)

لەگەل شاندی تورکیادا دووکوردیش بەشداربوون لەکۆنگرەکەدا وکاتێك ئینگلیزەکان داوایان لەهەردووکوردەکە کرد کەئەیانەوێت لەتورکیا جیاببنەوە یاخودنا ئەوا لەوەلامدا بەنوێنەرایەتی خەلکی کوردیان راگەیاند کەئێمەو تورك براین ونامانەوێت جیاببینەوە،کەمالیەکانیش بەپشت بەستن بەم قسانە رایانکەیاند کەکوردەکان دەولەتی سەربەخۆیان ناوێت بەلکو دەیانەوێت لەگەل تورکیادا بژین.(٢١٥) بەم شێوەیە کێشەی ویلایەتی موسل دوای ئەوەی نەگەیشتە ئەنجام و دواخرا بەپێی برگەی دووەمی مادەی سێیەمی کۆنگرەکە مۆلەتی ٩ مانگ بەتورکیاوبەریتانیا درا بۆچارەسەرکردنی وەئەگەر نەگەیشتنە ئەنجام ئەوا رەوانەی کۆمەلەی گەلان بکرێت.(٢١٦) بەگوێرەی یەکێك

لەبەندەکانی کۆمەڵەی گەلان لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی نێودەوڵەتی پێکهێنراو ناردرایە ویلایەتی موسل بۆدۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو بۆکێشەکە.(٢١٧) بەم شێوەیە پەیماننامەی لۆزان جێگەی سیڤەری گرتەوە وزەبرێکی گەورەی کۆلۆنیالیتی بوو بەمیلەتی کوردو بزوتنەوەکەی کەوت بەبێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەك بەگەلی کوردو نیشتمانەکەی و داواکاریە سیاسیەکانیان بکات ،هاوپەیمانانیش بەتایبەتی بەریتانیا وفەرەنساو ئیتالیاوئەمریکا ئەوەیان سەلماند کەپشتیان لەسەرجەم مافەکانی گەلی کوردکردووە.(٢١٨)لەپەیمانی لوزاندا بەهیچ شێوەیەك باس لەمافەنەتەوەییەکانی کوردنەکردووە تەنها چەند رێنمایەك نەبێت کەلەبەندی ٣٩،٣٨داهاتووە. لەبەندی ٣٨دا دەلێت"حکومەتی تورکیا بەلێن دەدات بەپاراستنی هەموو دانیشتوانی وپارێزگاری لەسەربەستیان دەکات بێ گوێ دانەجیاوازی رەگەزی وئایینی ونەتەوەوزمان" لەبەندی ٣٩دا هاتووەکە"هەموو هاونشتیمانیەکی تورکیا نەبێت سەربەست بێت لەبەکارهێنانی هەرزمانێك لەپەیوەندیە تایبەتیەکانی یان پەیوەندی بازرگانی یان لایەنی ئایینی ورۆژنامەگەری وچاپەمەنی ونوسین وکۆبونەوەگشتیەکاندا".(٢١٩) هەرچەندە لەودووبەندەی لۆزاندا هەندێ مافی سەرەتایی بۆکەمایەتیەکانی نێو دەسەلاتی دەولەتەکەیدا بریاری لەسەر درا بەلام بەهیچ جۆرێك باسی دەولەتی سەربەخۆ بۆکەمایەتیەکان لەئارادانەبوو ،تەنانت پەیمانەکە بەهیچ جۆرێك ووشەی کوردی بەکارنەهێنا تەنها بەلێنی پارێزگاری کردنی هەموو خەلکی تورکیای خستە ئەستۆی خۆی لەرووی ژیان وئازادی بێ گوێدانە رەگەزوئایین ونەتەوە.(٢٢٠) هەروەها بەپێی بەندی( ٤٤) تورکیا لەسەری پێویست بووکەبەلێنەکانی جێ بەجێ بکات بەپێچەوانەوە هاوپەیمانان وکۆمەلەی گەلان بۆیان هەیە سەرپەرشتی جێ بەجێ کردنی بەلێنەکان بکەن وتورکیا ناچاربکەن ،چونکە تورکیا بەلێنی نێودەولەتی دابووبۆجێ بەجێ کردنی بەندەکان .(٢٢١) دوای

بـەکۆتاهاتنی کارەکـانی کـۆنگرەی لـۆزان کەمالیـەکان توانیـان دانپێـدانانی نێودەولـەتی بەدەسـت بهێـنن وسـەرنجی زلهێزەکـان بۆخـۆ رابکێـشن وپاشـان لەوبەلێنانەی کەدایان بووبەکورد پاشگەزببنەوە، هەروەها توانیـان ئەوناوچـانەی کەلەئـەنجامی جـەنگی جیهـانی لەدەسـتی دابـوو داوابکاتـەوەو وەریـان بگرێتەوە،بۆیـەدوای ئەوقۆناغـە کەمالیـەکان دەسـتیان کـرد بەسیاسـەتی رەگەزپەرسـتی ولـەناوبردنی هەموودەنگـە نـەیارەکانی دژبەدەولـەتی نـویێ ی تورکیا.(٢٢٢)

بەم پێیە پەیمانی لۆزان بەبەراورد لەگەل سیڤەردا لەرووی یاسای نێودەولەتیەوە هـەنگاوێك بـوو بـەرەودواوە ،جکەلەمـە لـۆزان هۆکارێـك بـوو بۆدابەشـکردنی کوردستان ودابرینی گەورەترین بەشی کوردسـتان وخستنە سـەرتورکیاو بەشـی رۆژئـاوای خرابەسـەر سـوریا ،بۆیـە لـۆزان بووبـەدان پێـدانانێکی نێودەولـەتی بۆدابەشکردنی کوردستان بەسەر تورکیاوعێراق وئێران وسوریادا.(٢٢٣)هـەروەها لەلۆزانـدا دۆزی کـورد لەکێـشەیەکی نێودەولەتیـەوە بـچوککرایەوە بۆکێـشەیەکی نـاوخۆی نێـو دوو ولاتـی تـازە دروسـت بـوو کـەعێراق وتورکیـا بوون،ئەمـەش کاریگەریەکی گەورەوخراپی بـەدۆزی کوردگەیانـد کەلەسیڤەردا بـاس وخواسـتی دروست کردنی دەولەتێکی سەربەخۆ لەئارادابوو،بەلام دوای کۆتای هـاتنی لـۆزان ئەوا دەسەلاتێکی ئۆ تۆنۆمیشی پیێ رەوانەبینرا.(٢٢٤)

بەکۆتای هاتنی لۆزان کێشەی کورد کۆتـای پێنـەهات بـەلکو بەستراوەبەکێـشەی موسل وبەردەوام بوو لەرێگەی کۆبونەوەورێکەوتنە دووقولیەکانی نێوان تورکیـاو بەریتانیا دواتریش بەکۆمەلەی گەلان سـپێردرا،کوردەکانیش بۆبەدەسـت هێنـانی ئەومافانەی کەپێشتر بەلێنیان پێدرابوو دەستیان کـرد بەهەلگیرسـاندنی شـۆرش وراپـەرین لەوانـەش شۆرشـی شـێخ مـەحمود ،شۆرشـی شـێخ سـەعیدی پـیران وچەندان شورش وراپەرینی تر.(٢٢٥)

بەشی سێیەم: بزاف وشۆرشەکانی کورد لەماوەی نێوان (١٩١٨–١٩٢٣ز)دا

دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ١٩١٨ز زۆرگۆڕانکاری گەورەی بەدوای خۆیدا هێناو گۆڕانێکی ریشەی لەسەرئاستی ناوچەیی ونێودەولەتیدا هاتەدی،بەتایبەتی لەبواری ئابوری وهەلئاوسانی سیستەمی سەرمایەداری ،ئەم گۆڕانکاریانەش بونە سۆنگەی گۆڕان لەسیاسەتی ولاتە گەورەکان ،لەمیانەی ئەمەشدا گەلی کورد دەستی کردبەبزاف وجولانەوەی سیاسی بۆئەوەی سود لەم قۆناغە نویَ یەی نێودەولەتی وەربگرێت.(١٢٣)بەتایبەتی بلاویونەوەی بنەماکانی سەرۆکی ئەمریکا ودرو ولسون کەخۆی لە١٤بەند دەبینیەوە،تەکانێکی گەورەی بەبزاف وجولانەوە کوردیەکان بەخشی بەجۆرێك کەلەنێوەندە کوردیەکان بە(بەرنامەی ژیان بۆکورد)وەسف دەکرا،بەتایبەتی بەندی ١٢هەم کەجەختی لەسەرپاراستنی مافی کەمەنەتەوەیەکانی نێودەولەتی عوسمانی ونەهێشتنی کۆسپ وبەربەست لەرێگەی گەیشتن بەسەربەخۆیی ئەونەتەوانە دەکردەوە،(١٢٤)بۆیەش دەبینین زۆرلە نەتەوەکانی ژێردەسەلاتی عوسمانی توانیان سودلەم دەرفەتە وەربگرن،بەتایبەتیش بەهۆی پەیدابونی بۆشایەکی سیاسی لەناوچەکەدا،دوای شکستی عوسمانیەکان ئەوا هەریەکە لەنەتەوەی عەرەب وئەرمەن توانیان ئەوهەلە بۆبەرژەوەندی خۆیان بقۆزنەوەو لەرێگەی بەرپاکردنی شۆرش و پشتگیری وەرگرتن لەزلهێزەکان بەتایبەتی بەریتانیا ئەوئامانجەیان بهێننەدی (١٢٥).

رۆشنبیران وسیسەتمەدارانی کوردیش ئەودەرفەتەیان قۆزتەوەو کەوتنە چالاکی نواندن لەرێگەی کۆمەلەوپارتەکانەوە بەتایبەتی کۆ مەلەی (جەمعیەی ئیستقلالی

کوردستان وکوردستان تەعالی جەمعیەتی)کەوتنەچالاکی بۆگەیاندنی دۆزی کورد بەکۆروکۆبونەوە نێودەولەتیەکان هەروەها هەولدان بۆبەدەست هێنانی پشتگیری زلهێزەکان بەتایبەتی بەریتانیا بۆدانپێدانانی مافی سەربەخۆی بەگەلی کورد.(١٢٦) کۆمەلەی هیڤی سەرلەنوێ دامەزرایەوەو دەستی کردبەچالاکی نواندن لەرێگەی دەرکردنی گۆڤاری(ژین) چەندان لاوی چالاك لەدەوری کۆبونەوەولەبلاوکراوەکاندا بەرگریان لەدۆزی کورد دەکردوهەولیان دەدا کەسەرنجی جیهان بۆلای دۆزە رەواکەی گەلی کورد رابکیشن وهەولی بەدیهێنانی داواکاریەکانی گەلی کوردیان دەدا.(١٢٧)بۆئەم مەبەستەش بەهەماهەنگی لەگەل پارتەکوردییەکان دەستیان کرد بەناردنی بەیاننامەی داواکاری بۆهەریەکە لە بەریتانیاوفەرەنسا ،تێیدا هاتبووکەمافی سروشتی خۆمانە کەشادبین بەسەربەخۆیی وئازادی بەدەست بهێنین.(١٢٨)

لەلایەکی ترەوە بێزاربوونی گەلیکورد لەئەنجامی ئەوهەموو هێرش وپەلامارە یەك لەدوایەکەکانی کەلەئەنجامی شەر کرابونە سەرکوردستان بەهۆی شوێنە ستراتیژیەکەی ،بیزاریەکی زۆری لای کوردەکان دروست کردبوو بەتایبەتی هێرشەکانی دەولەتی عوسمانی وئێرانی لەلایەك وزلهێزەبراوەکانی شەر لەلایەکی تر ،بۆیەکۆتایی هاتنی شەر وەکو دەرفەتێك بوو بۆرگاربوون .(١٢٩) بەهەمان شێوە وەستانی جەنگ بەپێی پەیمانی مۆدرۆس وشکستی عوسمانیەکان دەرفەتی بۆ زلهێزەکان رەخساند تا بەئامانجە سترتیژیەکانیان بگەن ،بەتایبەتیش ناوچە نەوتیەکان کەگرنگی یەکی تایبەتی هەبوو،کوردستانیش بەیەکێك لەوناوچە گرنگە نەوتیە دادەنرا کەبەریتانیا هەولی دەست بەسەرداگرتنی دەدا،(١٣٠) لەبەندی ٧ی ئاگربەستی مۆدرۆسدا هاتبوو کە هاوپەیمانان بۆیان هەیە هەرکاتێك بیانەوێت دەست بخەنە سەرهەر ناوچەیەکی ستراتیژی دەولەتی

عوسمانی ،ئەوەش هاندەربوو کەبەریتانیا دەست بخاتە سەرویلایەتی موسل ،بەریتانیاش بۆئەوەی هەستی دانیشتوانی ناوچەکە نەبزوێنن رایانگەیاند کەمەبەستیان لەوداگیرکردنە بۆئەوەیە کەگەلانی ناوچەکە لەژێر ستەم وچەوساندنەوەی دەولەتی عوسمانی رزگاربکەن.(١٣١)

داگیر کردنی ویلایەتی موسل لەلایەن بەریتانیاوە بارگرژیەکی زۆری لەکوردستانی عێراق دروستکرد چونکە بەریتانیا لەوبەلێنانەی بەکوردی دابوو بۆدامەزراندنی دەولەتێکی سەربەخۆ بۆکورد بەپێی رێکوتنێك لەنێوان خوی وسەرکردەکانی کورد پاشگەز بوونەوەی پێوەدیاربوو،کوردەکانی زیاتر توشی دلەراوکێ کرد کاتێك بینیان بەریتانیا هەولی چەسپاندنی دەسەلاتی دەدات لەهەموو شارەکوردیەکان .(١٣٢) کوردستانی رۆژهەلاتیش لەسەرووبەندی کۆتایی هاتنی جەنگدا توشی ئاژاوەوپەشێوی زۆرهاتبوو بەتایبەتی دوای ئەوەی کەسوپای روسیا دوای شۆرشی ئۆکتۆبەر ناوچەکەی جێهێشت بۆشایەکی گەورەی سەربازی دروست ببوو وەچاوتێبرینی بەریتانیا بۆناوچەکە،ئەم ئالۆزیەی لەکوردستانی رۆژهەلاتدا هەبوو لەباربوو بۆسەرهەلدانی شۆرش لەلایەن کوردەکانەوە.(١٣٣) هەرچی کوردستانی باکورە بەهۆی سەرهەلدانی بزاڤی کەمالیەکان وسەرکەوتنیان،هەستی وولاتە زلهێزەکان بەتایبەتیش بەریتانیاویەکێتی سۆڤیەتی بۆخۆی راکێشابوو بۆئەوەی پشتگیری لەبزوتنەوەکەبکەن،هەروەها پشت لەوبەلێنانەبکەن کەبەکوردیان دابوو،بوونی پشتگیری بەشێکی زۆری کورد لەبزاڤی کەمالیەکان بەهۆی دورشمە بریقەدارەکانیان ئەوهەل ومەرجەیان بۆبەرژەوەندی نەتەوەیی خۆیان نەقۆزتەوە.(١٣٤) سەرەرای ئەوەش کێشەوململانێی نێوان زلهێزەکان بەتایبەتی بەریتانیاوفەرەنسا کەهەریەکەیان بۆدەستگرتن بەسەرناوچە گرنگەکان ،کوردستانیش چەقی ئەم ململانێیە

بوو،بۆیەهەریەکـــە لـــەلای خۆیـــەوە سازشـــی دەکردلەســـەردۆزی کـــورد بۆبەرژەوەندیـــــەکانیان.(١٣٥) بۆیـــــەدەبینین لەهـــــەموو لایەکـــــەوە لەباکوروباشـــوروروژهەلات کوردەکـــان کەوتنـــەخۆ بـــۆ دەســـت پێکردنـــی بـــزاف وشۆرش بۆئـەوەی بتـوانن سـودلەم دەرفەتـە وەربگـرن،چ لەرێگـەی یاداشـتنامە نوسین بێـت بۆکـۆنگرە نێودەولەتیـەکان یـاخود لەرێگـەی بـەرپاکردنی شۆرشـی چەکداری بێت بۆ گەیانـدنی دۆزەرەوایەکـەیان،وەکو نمونـەش ئامارژەبەهەریەکـە لەشۆرشی شێخ مەحمود دەکەین لەکوردستانی باشـور لـەنێوان (١٩١٩–١٩٢٣ز) وەشۆرشی سمکۆی شکاك لەکوردستانی رۆژهەلات (١٩٢٠–١٩٢٣ز)

تەوەرەی یەکەم: شۆرشی شێخ مەحمود(١٩١٩–١٩٢٣)لەکوردستانی باشور

شێخ مەحمود کـوری شـێخ سـەعید کـوری محەمـەد کـوری کـاك ئەحمـەدی شـێخە لەبنەمالەیـەکی ئـاینی بـەناوبانگی کوردسـتان لەسـالی ١٨٨١ز لەشـاری سـلێمانی لـەدایك بووە،زانـستە شـەرعیەکانی خوێندووە،لەسـالی ١٩٠٤ز لەگـەل باوکی سەردانی ئەسـتەمبولی کردووەولەلایـەن سـولتان عەبـدول حەمیـدی دووەم پێشوازی لێکراوە،بەهۆی پلەوپایە ئایینیەکەی لەلایەن خـەلکی ناوچـەکەبەکوردو عەرەبەوە خۆشەویست بووە،لـە٩یتـشرینی دوومـی١٩٥٦زلەبەغدا کۆچـی دوای کردووە.(١٣٦)

سـەبارەت بەپەیوەنـدی شـێخ بەعوسمانیەکانـەوە دەگەرێتـەوە بۆئەوپەیوەنـدی یەی کەسولتان لەگەل شێخ سەعیدی باوکیدا هەبووەو ئەوپلەوپایـەی کەسـولتان عەبـدول حەمیـد پێیـانی بەخـشیبوو بەتایبـەتی کاتێـك نازنـاوی پاشـای پێـدرا ئەوانفوزودەســـەلاتی لەناوچـــەکەدا زیـــادی کـــرد.(١٣٧) عوسمانیـــەکانیش ئەودەسـەلاتەی شـێخ مـەحمودیان بـەگرنگ زانـی بەتایبـەتی پـاش هەلگیرسـانی

جەنگی یەکەمی جیهانی وتێکشکانی هێزی عوسمانیەکان لەبەرەکانی عێراق بەرامبەر بەسوپای بەریتانیا،عوسمانیەکان بەراگەیاندنی بانگەوازی جیهاد هەولیاندا سود لەنفوزی شێخ مەحمود وەربگرن وهانی بدەن بۆئەوەی بەشداری لەپال سوپای عوسمانیەکاندابکات.(١٣٨)شێخ مەحمودیش بەلەشکرێکی زۆر کەپێك هاتبوولەهۆزە کوردەکان بەرەو شعێبە بەرێ کەوت،لەئەنجامدا لە١٢ی نیسانی١٩١٤زشەڕوپێکدادان لەنێوان سوپای عوسمانی کەپێکهاتبوو لەکوردەکان لەگەل سوپای بەریتانیادا روویدا ،بەلام سوپای بەریتانیا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو سوپای عوسمانیەکان زۆرخراپ تێکشکا ،شێخ مەحمودو ئەوسەربازانەی کەلەگەلی مابونەوە گەرانەوە سلێمانی.(١٣٩)ئینگلیزەکان دوای ئەوەی بەغدایان داگیرکردوبەرەو ناوچەکانی باکوری عێراق کشان هەولیاندا کەپەیوەندی بەسەرۆك خێلەکانی کوردی ناوچەکەوە بکەن،لەم چوارچێوەیەدا پەیوەندیان بەشێخ مەحمود کردو شێخیش پالپشتی خۆی بۆئینگلیزەکان پیشاندا.(١٤٠) ئینگلیزەکان پێویستیان بەشێخ مەحمود هەبوو بۆحوکم کردنی سلیمانی ودەورووبەری بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ،چونکە ئینگلیزەکان دەیان ویست ئەوبۆشایە ئیداریەی کەلەناوچەکەدا دروست ببوو،پاش کشانەوەی عوسمانیەکان لەناوچەکە ،بەشێوەیەك لەرێگەی شێخ مەحمودەوە ئەویش لەبەرئەو نفوزەی کەشێخ هەیبوو،جگەلەمە ئینگلیزەکان نەیان دەویست لەم قۆناغەدا رووبەرووی ناوچەکە ببنەوە.(١٤١)بۆیە هەولیاندا دەسەلاتێکی خۆجێی بۆشێخ مەحمود لەسلیمانی دابمەزرێنن ، لە١٧ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ز مێجەرنوئێل لەبەر دەرکی سەرای سلیمانی و بەرامبەر خەلکی ناوچەکە لەئەشراف وسەرۆك هۆزەکان بەناوی دەولەتی بەریتانی لەعێراق وتارێکی خوێندەوە،لەوتارەکەیدا رایگەیاند کەشێخ مەحمود لەلایەن حاکمی گشتی

عێراقەوە بەحوکمداری کوردستان ناسێنرا.(١٤٢) پاش دامەزراندنی ئیدارەکە میجەرنوئێل هەولیدا لایەنگری خەلکی هەولێرو رەواندوز بەدەست بهێنێت بۆحوکمەتەکەی شێخ مەحمود،لەلایەکی تر هەندێك لەکارمەندانی بەریتانیا لەعێراق پێیان وابوو کەپێویستە حکومتەکەی شێخ مەحمود تەواوی کوردستانی باشور بگرێتەوە،بەلام لەلایەن لەندەنەوە بەرێوەبچێت نەوەکو بەغدا.(١٤٣) چەند هۆکارێك هەبوون کەئینگلیزەکان ئەم ئیدارەیە بۆشێخ مەحمود دابمەزرێنن،لەوانەش دەیانویست دوای شەری یەکەمی جیهانی ،رۆژهەلاتێکی ناوارامستی وا دابمەزرێنن کەبەتەواوی بەپێی بەرژەوەندیەکانی خۆیان بێت،بۆئەم مەبەستەش زۆرجارسیاسەتی موراوەغەو کات بەسەربردن وتەکتیکیان بەکاردەهێنا.

١) فاتح رسول،بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ لەکوردستان،چ ١ ،سلیمانی،٢٠٠٥،ل ٣٩. ،محمد احسان،کردستان ودوامەالحرب ، گ ١ ،اربیل،ص ٢١.

٢) دیفد مکداول،تاریخ اکراد الحدیپ ،ت:راج ال محمد،گ ١،بیروت،٢٠٠٤،ص ١٥٦.

٣) ئەکرەمی میهرداد،کوردوگەران بەدوای خۆیدا،چ ١،هەولێر،٢٠٠٧،ل ٥٧.،محمد احسان،م س،ص ٢١.

٤) م.س.لازاریف واخرون،تاریخ کردستان،ت:عبدی حاجی،گ ١ دهوك،٢٠٠٦، ص ١٦٤.

٥) بێوار ئەلیما، دواین ژێردەستە ،و: جەلیل عەباسی ،چ ١،سلیمانی، ٢٠٠٤، ل ٣٩.

٦) محمد رسول هاوار،کوردوباکوری کوردستان لەسەرەتای مێژووە هەتاشەری جیهانی دووەم،چ٢ ،سلیمانی،٢٠٠٦،ب١،ل٤٦٦.،کەمال بورکانی،کوردوکوردستان لەسەردەمی باستانەوەتاکو جەنگی جیهانی یەکەم، و:عەلی فەتحی،چ١،هەولێر،٢٠٠٨،ل٤٦٧.

٧) سەلام ناوخۆش، هۆکاروکانی لکاندنی ویلایەتی موسل بەعێراقی عەرەبیەوە،چ١،هەولێر،٢٠٠٠،ل٥٥.

٨) جاسم توفیق خۆشناو،مەسەلەی کوردویاسایی نێودەولەتی،سلیمانی،٢٠٠٢،ل١٤٩.

٩) عەبدولا عەلیاوەیی،کوردستان لەسەردەمی دەولەتی عوسمانیدا،سلیمانی،٢٠٠٤،ل١٩٧., کەمال بورکانی،س پ،ل٤٧١.

١٠) حامدمحمودعیسی، القچیە الکوردیە فی تورکیا، گ ١ ،٢٠٠٢،ص٨٧.، محمدرسول هاوار،س پ ،ل٥٠٢.

١١) عبدالستارگاهرشریف، الجمعیات والمبڤمات والاحزاب الکوردیە فی نصف قرن(١٩٠٨–١٩٥٨) ،گ٢، سلیمانی،٢٠٠٧،ص ص ٣٨–٣٩.، کەمال بورکانی ،س پ ،ل ٤٧٤.

١٢) جەلیلی جەلیل، هەندێك لەسیمای ژیانی کۆمەلایەتی وسیاسی وکەلتوری کورد، و:ئەنوەرقادر،ستوکولم، ١٩٩٣،ل٦٢.،سعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی لەکوردستانی رۆژهەلات، هەولێر،٢٠٠٧،ل ١٣٩.

١٣) رۆهات ئەلاکۆم، کوردەکانی ئەستەمبۆلی کۆن، و:ئەحمەدتاقانە،چ ١، هەولێر،٢٠٠٥،ل ١٢٨.، عەلی تەتەر،بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨–١٩٢٧،دهۆك، ٢٠٠٢، ل ١٢٢.

١٤) کامەرات ئەحمەد حەمەدئەمین،کوردستان لەنێوان ململانێی نێودەولەتی وناوچەیدا ١٨٩٠ – ١٩٣٢،چ١،سلیمانی،٢٠٠٠،ل٩٢.

١٥) جویس بلو،دۆزی کورد، و:کارزان محمد،سلیمانی،٢٠٠٤،ل ٤٩.، سروە اسعد صابر،کردستان من بدایە حرب العالمیە الاولی الی نهایە مشکلە موصل ١٩١٤–١٩٢٦،گ١، اربیل،٢٠٠٢،ل ١١.

١٦) کمال مڤهر،کردستان فی سنوات حرب العالمیە الاولی ،ت: محمد ملاعبدالکریم،گ٢،بغداد،١٩٨٤،ص٩٦.

١٧) عمرمحمدمحمدکریم،القچیەالکوردیە فی صراع البریگانی العراقی ١٩١٨–١٩٣٢،سلیمانی،٢٠٠٨،ص ٤٠.

١٨) عيمان على،دراسه فى الحركه الكورديه المعاصره ١٨٣٣-١٩٤٦،اربيل،٢٠٠٢،ص١٥٢.، عەبدولاعەلياوەيى،س پ،ل٢٠٨.

١٩) تەلار عەلى ئەمين،سياسەتى كەمالى وبزاڤى رزگارى خوازى نەتەوەى كوردلەباكورى كوردستان،ماستەرنامە ،هەولێر،٢٠٠٢،ل١١.

٢٠) كمال مظهر ،م س،ص٩٧.,سەلام ناوخۆش، س پ ،ل ٦١.

٢١) تەلار عەلى ئەمين،س پ،ل١١.، عيمان على ،م س ،ص ١٧٢-١٧٥.

٢٢) محمد امين زكى،خولاصەيەكى تاريخى كوردوكوردستان،سليمانى،٢٠٠٦،ل ١٨٤.،كەمال بوركانى،س پ،ل٤٨٦.

٢٣) جەليلى جەليل، س پ، ل١٦٥.، محمدرسول هاوار، س پ ،ل٣٧٨.

٢٤) صلاح سعدالله، المساله الكورديه فى العراق،گ٢ ،٢٠٠٣،ص ٧٤.

٢٥) مسعودبارزانى ،بارزانى وبزوتنەوەى رزگارى خوازى كورد ١٩٣٢-١٩٥٨،چ١،دهوك،١٩٩٨،ل ٢٠.

٢٦) كمال مظهر، م س،ص١١٤.، موجتەبا بروزوويى،بارودۆخى سياسى كوردستان ١٨٨٠-١٩٤٦،و:نازناز محمد وئەوانى تر،چ١،هەولێر،٢٠٠٥،ل٢٢٠-٢٢٢.

٢٧) عيمان على ،م س ،ص١٦٠.

٢٨) تەلار عەلى ئەمين، س پ ،ل١٢.،عمر محمد محمد كريم،م س،ص ٥٣.

٢٩) صالح ملا عمر،قەيران خولقێنى زلهێزەكان لەكوردستانى عێراقدا، و:سليمان تاشان،چ١،هەولێر،٢٠٠٨،ل٢٩.

٣٠) دريه عونى،عرب واكراد خصام او وئام،دارالهلال،١٩٩٣،ص ٥٩..، احمد عبدالله خجر،سەرهەلدانى كێشەى كوردستان، سەنتەرى برايەتى،گۆڤار -ژ١٠،هەولێر،١٩٩٩،ل١٣٤

٣١) . كامران احمد حمدامين.،س پ ، ل٩١

٣٢) . كمال مظهر،م س،ص٩٨

٣٣) . م ن،ص٨٤

٣٤) . عيمان على ،م س،ص١٦٥

٣٥) . حسن افرع،كوردەكان ، و:حاميد گەوهەرى،چ١،هەولێر،٢٠٠٧،ل٥١

٣٦) . نوشیروان مستەفا،کوردوعەجەم–مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران،چ٣،سلیمانی،٢٠٠٥،ل٢٥٠

٣٧) . جەنگی جیهانی یەکەم هۆکاری هەلگیرسانی دەگەڕێتەوە بۆتیرۆرکردنی وەلی عەهدی نەمسایی ئەرشیدوق فرانسیس فردیناند بەدەستی ڕێخراوێکی سربی،ئەواسەرەرایی چەندهۆکارێکی تری ناراستەوخۆ بوونە هۆی هەلگیرساندنی جەنگەکە.بۆزانیاری زیاتر بروانە:فاچل حسین وکاظم هاشم نعمه،تاریخ اوروبا الحدیث ١٨١٥–١٩٣٩،گ١،عیراق،١٩٨٢، ص ١٦٢–١٧٠

٣٨) . کمال مظهر، م س، ص١٩

٣٩) . صدیق عپمان محو،العامل الخارجی ودوره فی اخماد الانتفاچات الکوردیه،رساله الماجستیر،لندن،٢٠٠٧،ص ٩.

٤٠) عەزیز شەمزینی،،ولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان،و:فەرید ئەسەسەر،سلیمانی،١٩٩٩،ل٩٧.، احمدعبالله خچر،س پ ,ل١٣٥.

٤١) تەلار عەلی ئەمین،س پ ،ل١٢

٤٢) .عمر محمد محمد کریم، م س،ص ٦٢.

٤٣) . وەرگیراوە لە:المساله الکردیه،ت: احمد اکبر،سلیمانی،٢٠٠١،ص٢٩٩.

٤٤) زنار سلوپی ،فی سبیل کردستان، ت: ر.علی،گ١،بیروت،١٩٨٧،ص٤٥.،عەتا قەرەداغی،گوتاری ناسیونالیزمی کوردی ، سلیمانی، ٢٠٠٧،ب١، ت٢٣١–٢٣٦.

٤٥) نادر ئینتسار،ئیتنو نەتەوایەتی کوردی،و:عەتا قەرەداغی،سلیمانی،٢٠٠٤،ل١٧٩.

٤٦) مهدی محمد قادر،هەولێر لەنێوان سالانی ١٩١٤–١٩٣٠،هەولێر ،٢٠٠٨،ل٦٦.،

٤٧) م .س.لازاریف واخرون،م س،ص ١٨٠،جاسم توفیق خوشناو، س پ ،ل١٥٤.

٤٨) محمد ئەمین زەکی،س پ،ل١٧٩.، محمد عبدالله کاکەسوور،ڕۆلی سیاسی وکەلتوری ئەفسەرانی کورد لەبزافی کوردایەتی کوردستانی باشور١٩٢١–١٩٤٥ز،چ١،هەولیر،٢٠٠٠،ل٢٨.

٤٩) جلیلی جلیل واخرون،الحرکه الکردیه فی العصرالحدیپ،ت:عبدی حاجی،بیروت،١٩٩١،ص ٩٠.

٥٠) کمال مظهر،م س ،ص ١٦١.،دیفید مکداول،م س ،ص١٧٧.

٥١) کمال بورکانی ،س پ،ل٥٤٩.،محسن مامل محەمەد،ئاکارومەرگەساتەکانی جەنگی جیهانی یەکەم لەسەر کوردستانی ڕۆژهەلات،گوڤاری مێژوو،ژ١،هەولێر،٢٠٠٧،ل١٧١.

٥٢) علائەدین سوجادی،شۆرشەکانی کوردو کوردو کۆماری عێراق،تاران،٢٠٠٥،ل٧١.، سروه اسعد صابر،م س،ص٢٦.

٥٣) جرجيس فتح الله،يقظه الكرد-تاريخ سياسى١٩٠٠-١٩٢٥، گ١ ،اربيل،٢٠٠٢،ص١٢٤.

٥٤) ديفد مكداول،م س،ص ١٨١.، جەلیلی جەلیل،هەندێك لەسیمای.........،ل١٧٤.

٥٥) مهدی محمد قادر،س پ ،ل٧٤.

٥٦) عزيزالحاج،القچيه الكرديه فى العشرينات،گ٢،بغداد،١٩٨٥،ص٣١.،محسن محمد المتولى،كردالعراق منڑ الحرب العالميه الاەلى١٩١٤ حتى سقوگ الملكيەفى العراق١٩٥٨ ،گ١،بيروت،٢٠٠١،ص ٧٥.،سروه اسعد،م س،ص ٣٢.

٥٧) جرجيس فتح الله،م س،ص١٢٤.

٥٨) عەزیز شەمزینی ،س پ ،ل٩٩.

٥٩) كمال مڤهر،م س ، ص٢٢٨.

٦٠) حامد محمود عيسى ،م س ،ص١٠٧.

٦١) كمال مڤهر،م س ، ص٢٢٨.

٦٢) عەزیز شەمزینی ،س پ ،ل١٠٢.،سەعدی عوسمان،س پ،ل٤٧.

٦٣) م.س .لازاريف واخرون،تاريخ كردستان.......،ص١٨٩.،جاسم توفيق خوشناو،س پ،ل١٥٥.

٦٤) کەمال بورکانی،س پ ،ل٥٤٣.

٦٥) محمد ئەمین زەکی، س پ ،ل١٨٤.

٦٦) حامد محمود عيسى ،م س ،١١٩.، جرجيس فتح الله،م س،ص ٨٩. ، کەمال بورکانی،س پ ،ل٥٣٩.

٦٧) بلەچ شێرکۆ ،کێشەی کورد-مێژینەو ئێستای کورد،و:محمد حەمەباقی،چ٣،کوردستانی عیراق،١٩٩١،ل٦٠.

٦٨) سروه اسعد صابر ،م س،ص٣٥.

٦٩) كمال مڤهر،م س٢٢٢.

٧٠) جرجيس فتح الله ،م س ،ص٨٣.،محسن مامل محمد ،س پ،ل١٧٢.

٧١) محمد ئەمین زەکی ،س پ،ل١٨٨.، ابراهيم الداقوقى، اكراد تر كيا ،گ١،اربيل،٢٠٠٨،ص١٠١.

٧٢) عیمان علی ،م س، ص٢٦٥.،موجتەبا بورزوویی،س پ ،ل١٦٣.، محمد رسول هاوار ،س پ ،ل٥٤٨.

٧٣) دیفد میکداول ،م س ،ص١٨٠.،عەتا قەرەداغی ،س پ ،ل٢٠٠.

٧٤) کمال مڤهر،م س ، ص٢١٧.

٧٥) عەتا قەرەداغی ،س پ ، ل٢٤٢–٢٤٣.

٧٦) سعد بشیر اسکندر ،سیاسە بریگانیا العقمی تجاه مستقبل کردستان ١٩١٥–١٩٢٣، سلیمانیە ،٢٠٠٧،ص٨٥.

٧٧) جەلیلی جەلیل ،هەندێك لەسیمای......،ل١٧٤.

٧٨) کمال مڤهر،م س ، ص٢٠٢.

٧٩) موجتەبا بورزوویی،س پ ،ل١٧٠.

٨٠) محمد رسول هاوار،شێخ محمودی قارەمان ودەولەتەکەی خوارووی کوردستان ،لندن،١٩٩٠،ب١ ،ل٣٣٢.

٨١) کمال مڤهر،م س ،ص٣٠٦.،عبدالرحمن قاسملو ،کوردوکوردستان،و:عبدالله حسن زادە،بنکەی پێشەوا،١٩٧٣،ل٥٠.

٨٢) ئازاد نەقشبەندی،رێکەوتنامەی سیکس–بیکۆوکوردستان،گۆفاری سەنتەری برایەتی ،ژ٧٠،هەولێر،١٩٩٧،ل٥.

٨٣) ئەحمەدسەیدعەلی بەرزنجی،سایکس–بیکۆ وترازاندنی جەمسەری کێشەی کوردی باشور،سلیمانی،٢٠٠٧،ل٢٦.

٨٤) احمد عیمان ابوبکر،کوردوکوردستان لەکۆمەلە وتارێکی مێژوویدا،و:ئازادعوبێد،چ١،هەولێر،٢٠٠٥،ل٢١.،صدیق عیمان محو،م س ،ص٩.

٨٥) عمرمحمد محمد، م س،ص٧٩.، ئەحمەدسەیدعەلی بەرزنجی ،س پ، ل٣٤.

٨٦) کمال مڤهر،م س ،ص٣٠٠ .

٨٧) سعد بشیر اسکندر، م س، ص ٦٥.، ئازاد نەقشبەندی ،س پ، ل ٧.

٨٨) محسن محمد المتولی ،م س، ص٩٧.، ئەحمەدسەیدعەلی بەرزنجی ،س پ، ل٣٢.

٨٩) ئازاد نەقشبەندی ،س پ، ل ٨.

٩٠) شۆڕشی ئوکتۆبەر بەدوو قۆناغدا تێپەڕبووە سەرەتا بەلشەفیەکان دەسەلات دەگرنە دەست دواتر بەسەرکردایەتی لینین شۆڕشێکی تر دژی مەنشەفیەکان لەئۆکتۆبەری ١٩١٧ ئەنجام دەدرێت ودەسەلات دەگرنە دەست،بڕوانە:فاچل حسین و کاظم هاشم نعمە، م س، ص٢٣٥-٢٥٠.

٩١) ابراهیم خلیل واخرون ،ترکیا المعاصرە،موصل ،١٩٨٨، ص٢٣٠.

٩٢) نەوشیروان مستەفا ،س پ ،ل٢٦٢

٩٣) ئەوپەیمان نامەیە لەنێوان روسیاوتورکیاوئەلمانیا دا بەسترا. بەپێی پەیمانەکە روسیای سوڤیەتی لەشەری جیهانی هاتەدەرەوە،هەروەها بریاردرا کەئەوناوچانەی لەکاتی شەردا لەدەولەتی عوسمانی داگیرکردووە چۆلبکات وبیداتەوە بەدەولەتی عوسمانی،کوردستانیش بەشێکی سەرەکی ئەوناوچانە بوو.بڕوانە:کەمال بورکانی ،س پ ،ل٥٥٦.

٩٤) کمال مظهر،م س ، ص٣١٣ .، کەمال بورکانی،ه س ،ل٥٥٥ .

٩٥) عیمان علی ،م س ،ص٢٦٥.

٩٦) کامران احمد حمدامین ،س پ ،ل١٠٨.

٩٧) م .س.لازاریف واخرون،تاریخ کردستان......،ص١٨٤.

٩٨) کامران احمد حمدامین ،س پ ،ل١٠٩ .

٩٩) م .س.لازاریف واخرون،تاریخ کردستان......،ص١٨٦ .

١٠٠) عزیز شەمزینی ،س پ ،ل١٠٤.،جلیلی جلیل واخرون،الحرکە الکردیە.......،ص١٠١.

١٠١) حامد محمودعیسی ،م س ،ص١٢٢.، فاتح رسول ،س پ ،ل٤٨.

١٠٢) نەوشیروان مستەفا ،س پ ،ل٢٦٥.، ئەحمەدسەیدعەلی بەرزنجی ،س پ، ل٣٠

١٠٣) نەوشیروان مستەفا ،ه س ،ل٢٧٦.

١٠٤) احمد عیمان ابوبکر ، س پ ،ل ٢٥.

١٠٥) سروە اسعد صابر ،م س ،ص١١٥.

١٠٦) کریس کوچێرا ،کوردلەسەدەی نۆزدەو بیست دا، و:حمە کریم عارف ،سلیمانی ،١٩٩٩،ل٢٩ .،عزیز شەمزینی ،س پ ،ل١٠٨.

١٠٧) جاسم توفیق خوشناو ، س پ ،ل٣٦.

١٠٨) محمد عبدالله کاکەسوور، س پ،ل٣٦.

١٠٩) گوینتەر دیشنەر،کوردگەلی لەخشتەبراوی غەدرلێ کراو،و:حمەکریم عارف،هەولێر،١٩٩٩،ل٧٣.

١١٠) سروه اسعد صابر ،م س ،ص ٨٠.

١١١) عەتا قەرەداغی، س پ ،ل٢٢٢.

١١٢) کریس کوچیرا ،س پ ،ل٢٩.

١١٣) نوشیروان مستەفا ،س پ،ل٢٧٣.،بیوار ئەلیما ،س پ،ل٤٦.

١١٤) بلەچ شێرکۆ ،س پ،ل٦٧. ،حامد محمود عیسی ،م س ،ص١٢٥.

١١٥) نوشیروان مستەفا ،س پ ،ل٢٨٣.

١١٦) حسن ئەرفەع ،س پ ،ل٦٠.

١١٧) فواد حمه خورشید ،کێشەی کورد لەنێوان کۆنگرەی ئاشتی وسیفەرولۆزاندا ،گۆفاری سەنتەری برایەتی،ژ١٩،هەولێر،٢٠٠١،ل١٦.

١١٨) تەلار عەلی ئەمین ،س پ،ل٦٤.

١١٩) دیفد مکداول ،م س،ص٢١٣.، عەلی تەتەر ،س پ،ل١٤٥.

١٢٠) نوشیروان مستەفا ،س پ ،ل٢٩٢.،عمرمحمد محمد کریم ،م س ،ص٣٦٩.

١٢١) محمدرسول هاوار ،کوردوباکوری......،ب٢،ل٣٤.، تەلار عەلی ئەمین ،س پ،ل٦٥.

١٢٢) مارف عمر کول،قچیه الشخصیه القانونیه للشعب الکوردی ،سلیمانی ،١٩٩٩، ص٤٩.

١٢٣) نوشیروان مستەفا ،س پ ،ل٢٣٩–٢٤٠.

١٢٤) فواد حمه خورشید ،س پ ،ل٦٦.

١٢٥) تەلار عەلی ئەمین ،س پ،ل٦٤.

١٢٦) احمد عپمان ابوبکر،کردستان فی عهد السلام –بعد حرب العالمیه الاولی،اربیل،٢٠٠٢،ص٩٠.

١٢٧) تەلار عەلی ئەمین ،س پ،ل٦٤.

١٢٨) نوشیروان مستەفا ،س پ ،ل٢٩٤.

١٢٩) ھ س.ل٢٩٥.،سعد بشیر اسکندر ،م س،ص٢٢٤.

١٣٠) کامران احمد حمدامین، س پ ،ل٣٣٤.

١٣١) احمد عپمان ابوبکر،کردستان فی عهد.....،ص١٢٨.، سعد بشیر اسکندر ،م س،ص٢٢٧.

١٣٢) عزیز الحاج ،م س،ص٣٤.

١٣٣) گوینتەر دیشنەر ،س پ،ل٧٤.

١٣٤) عبدالرحمن قاسملو ، س پ،ل٥٤.

١٣٥) کامران احمد حمدامین، س پ ،ل١٤٦.

١٣٦) تەلار عەلی ئەمین ،س پ،ل٦٥.

١٣٧) نوشیروان مستەفا ،س پ ،ل٢٩٦-٢٩٧.

١٣٨) هـ س،ل٢٩٧.

١٣٩) دریە عونی ،م س،ص٦٥.

١٤٠) م.س لازاریف،المسالە الکردیە،ص٢٠٩.

١٤١) عمر محمد محمد ،م س، ص١٨٠.

١٤٢) وەرگیراوە لە:عبدالرحمن قاسملو ،ل٥٥.

١٤٣) مارف عمر گول،م س،ص٥٩.

١٤٤) وەرگیراوە لە: تەلار عەلی ئەمین ،ل٦٧.

١٤٥) نادر انتسار ،س پ، ل١١٥.

١٤٦) کامران عزیز عبدالله ،هۆکارەکانی دروست نەبونی دەولەتی کوردی لەسەدەی بیست دا،گۆڤاری مێژوو،ژ٣،هەولێر،٢٠٠٧،ل٣٩.

١٤٧) فواد حمەخورشید ،س پ،ل٦٨.

١٤٨) هـ س،ل٦٨. ،عمرمحمد محمد ،م س ،ص١٨٢.

١٤٩) کمال مظهر ،م س،ص٢٤٨. ، کامران احمد حمدامین، س پ ،ل١٤٦.

١٥٠) حسین مەدەنی ،کوردستان وستراتیژی دەولەتان ،چ١ ،هەولێر،٢٠٠٠،ل٢٤٦.، گوینتەر دیشنەر ،س پ،ل٧٥.

١٥١) کوردستان لەسەدەی نوزدە وبیست دا،ل٤٠.

١٥٢) اکرمی میهرداد ،س پ،ل٦٣.

١٥٣) کامران احمد حمدامین، س پ ،ل١٤٦ .

١٥٤) فواد حمەخورشید ،س پ،ل٧٣. ، مارف عمر گول،م س،ص٦٠.

١٥٥) سلام ناوخوش ،احتلال وتقسیم کردستان،گ١،اربیل،٢٠٠٢،ص٧٩. ، مارف عمر گول،م س،ص٥٥.

١٥٦) تەلار عەلی ئەمین ،س پ،ل٦٨.، فواد حمەخورشید ،س پ،ل٧٤.

١٥٧)محمد رسول هاوار ،کوردو باکوری........،ب٢ ،ل١٢٩.

١٥٨)جليلی جليل واخرون، الحركه الكرديه ،ص١٠٨.

١٥٩) احمد عپمان ابوبكر ،کوردوکوردستان .....،ل٢٤.

١٦٠) م.س لازاريف واخرون،تاريخ كردستان...،ص١٧٩.

١٦١)سعد بشير اسكندر ،م س،ص٢٢٥.

١٦٢) م ن ،ص٢٢٦.، تەلار عەلی ئەمین ،س پ،ل٧٢.

١٦٣)نوشیروان مستەفا ،س پ ،ل٢٩٨.

١٦٤)کمال مظهر ،چەند لاپەرەیەك لەمێژووی گەلە کورد،بغداد،١٩٨٥،ل٧٩.، ابراهيم الداقوقی،م س،ص١٠٥.

١٦٥)جليلی جليل واخرون،الحركه الكرديه..،ص١٠٤–١٠٥.

١٦٦)محمد رسول هاوار،کوردوباکوری کوردستان.....،ب٢،ل١٥٢.

١٦٧) م .س.لازاريف واخرون، المساله الكرديه...،ص٥١.، ابراهيم الداقو قی،م س١٠٩.

١٦٨) م.ا.حسرتيان،یاسادەستوریەکانی تورکیاوکوردلەسەردەمی نوێ دا، و:دلێراحمد،چ١،سلیمانی،٢٠٠٧،ل١٨.

١٦٩)کامران احمد حمدامین،س پ،ل١٩١. ،سلام ناوخۆش،احتلال وتقسیم........،ص٩١.

١٧٠) م.ا.حسرتيان ،س پ،ل١٩.

١٧١)فاتح رسول ،س پ ،ل٥٣.

١٧٢)م.ا.حسرتيان ،س پ،ل١٩.، نوشیروان مستەفا ،س پ،ل٢٩٩.

١٧٣)تەلار عەلی ئەمین ،س پ،ل٦٩.

١٧٤) هـ س ،ل٦٩.

١٧٥)فاتح رسول ،س پ ،ل٥٢–٥٤.

١٧٦) فواد حمەخورشید ،س پ،ل٧٧.

١٧٧) تەلار عەلی ئەمین ،س پ،ل٧١.

١٧٨) کمال مظهر ،كردستان فی سنوات........،ص٣٤٩.،صدیق عپمان محو، م س،ص١٣.

١٧٩)سروه اسعد صابر ، م س،ص١٤٦.، جرجيس فتح الله ،م س ،ص٢٣٥.

١٨٠) سعد بشير اسكندر ،م س،ص١٤٠.، کامران احمد حمدامین،س پ،ل١٥٠.

١٨١) م .س.لازاریف واخرون، المساله الكرديه...،ص٢٦٨.

١٨٢)حامد محمود عيسى ، م س،ص١٤٥.

١٨٣)کامران احمد حمدامین،س پ،ل١٥٠.

١٨٤) هـ س،ل١٥٠.

١٨٥)م .س.لازاریف واخرون، المساله الكرديه...،ص٢٧١.

١٨٦) جليلى جليل واخرون،الحركه الكرديه..،ص١٢٥.، عيمان على ، م س،ص٢٧٥.

١٨٧) عزيز الحاج ، م س،ص٣٥.

١٨٨) مهدی محمد قادر ، س پ،ل١٢٧.

١٨٩)عمر محمد محمد كريم ، م س،ص١٧٩.، سلام ناوخۆش، هۆکارەکانی لکاندنی........،ل١٠٣.

١٩٠) مهدی محمد قادر ، س پ،ل١٢٧ .

١٩١) دريه عونى ، م س،ص٦٥.

١٩٢) صالح ملا عمر ، س پ، ل٥٩.

١٩٣) صلاح سعد الله ، م س، ص٨٤. ، محسن محمد المتولى ، م س،ص٢٦٠.

١٩٤) مهدی محمد قادر ، س پ،ل١٣٢.

١٩٥) م .س.لازاريف واخرون، المساله الكرديه...،ص٢٧١.، عمر محمد محمد كريم ، م س،ص٢٠١.

١٩٦) جرجيس فتح الله ،م س ،ص٢٣٦. ، عزيز الحاج ، م س،ص٣٦.

١٩٧)عيمان على ، م س،ص٢٧٨.

١٩٨)جرجيس فتح الله ،م س ،ص٢٣٧.، عمر محمد محمد كريم ، م س،ص٢٠١ .

١٩٩) سلام ناوخۆش، هۆکارەکانی لکاندنی........،ل١٠٤.

٢٠٠) ديفد مكداول ، م س،ص٢٦٨.

٢٠١) کریس کوچیرا ، س پ،ل٧١.

٢٠٢) سعد بشير اسكندر ،م س ،ص ٢٠٠-٢٠١.

٢٠٣) عمر محمد محمد كريم ، م س،ص٢٠١.

٢٠٤) ابراهيم خليل واخرون ، م س ،ص٣٩.

٢٠٥) عیسمەت وانلی وئەوانی تر،گەلێکی پەژموودەو نیشتمانێکی پەرت، و: م.گۆمەیی ،سوید،١٩٩٨،ل٢٧٦. ،دريه عونى ، م س، ص٦٦.

٢٠٦) مسعود بارزانی ، س پ،ل١٢.

٢٠٧) دیفد مکداول ، م س،ص٢٣٨..

٢٠٨) محمد عبدالله کاکە سوور، س پ ،ل٤٩.

٢٠٩) جرجیس فتح الله ،م س،ص٢٥٥.

٢١٠) ابراهیم خلیل واخرون ، م س،ص٣٦. ، کمال مظهر ، چەند لاپەرەیەك لە........،ل١١٢.

٢١١) عمر محمد محمد کریم ، م س،ص ٢٧٥. ، عزیز الحاج ، م س ،ص٤٥.

٢١٢) کامران احمد حمدامین ،س پ،ل١٥٧.

٢١٣) عیمان علی، م س،ص٤٢٥.

٢١٤) م .ن ،ص٤٢٦.

٢١٥) حسین مەدەنی ، س پ ،ل٢٣٧.

٢١٦) مسعود بارزانی ، س پ،ل١٢. ،صالح ملا عمر ، س پ ،ل٦٧.

٢١٧) محمد احسان ، م س،ص٢٨.

٢١٨) فواد حمەخورشید ، س پ،ل٧٩. ، مارف عمر گول، م س، ص٦١.

٢١٩) جلیلی جلیل واخرون،الحرکه الکردیه..،ص١١٧.

٢٢٠) گوینتەر دیشنەر ، س پ،ل٧٥.

٢٢١) فواد حمه خورشید ، س پ،ل٨٠.

٢٢٢) جلیلی جلیل واخرون،الحرکه الکردیه..،ص١١٧–١١٨.

٢٢٣) تەلار عەلە ئەمین ، س پ،ل٧٢.

٢٢٤) عمر محمد محمد کریم، س پ،ل٢٤٥.

٢٢٥) جیرارد جالدیان،المساله الکردیه،ت: عبدالسلام نقشبندی،اربیل،٢٠٠٧،ص٩٥.

# من مفكرتي
# ذكريات ضابط عراقي في الحرب العالمية الأولى

الدكتور عماد عبدالسلام رؤوف

كثيرون هم العراقيون الذين ذهبوا إلى الجبهات الأوربية والروسية، في أثناء الحرب العالمية الأولى، فلم يعودوا إلى وطنهم، لا أحياءً ولا أمواتاً، بل فقدت آثارهم في ثلوج القفقاس، وفي مضايق الدردنيل، وفي البحر الأسود، فلم يصل إلى أهليهم حتى خبر موتهم، حتى بات مصطلح السَّوق إلى (السَّفَر بَر) أي الحرب، كابوساً يؤرق الشبان العراقيين، ويبعث فيهم مشاعر الخوف من المستقبل المجهول. والموت شبه المؤكد.

كم من الذكريات المريرة لهؤلاء الشبان الذين ذهبوا، ضاعت بضياعهم هم، وكم من التفاصيل التاريخية كان يمكن أن تصلنا لو أنهم سجلوا ما رأوا، أو أن أحداً سجل ذكرياتهم عند عودتهم إلى وطنهم. ولذا فقد كانت سعادتنا كبيرة حينما عثرنا في دفتر أسود كبير، كان يحتفظ به الفنان محمد بن المثال المعروف خالد الرحال[1]، على صفحات كتبت بخط كبير الحرف، لرجل يبدو أنه كان في شيخوخته، كتب بعضها بقلم الحبر، والبعض الآخر بقلم الرصاص. وتضم هذه الصفحات بعض من ذكريات كتبها الضابط مهدي بن صالح بن سليم الرّحّال، وهو والد الفنان النحات المعروف خالد الرحال، في أثناء أداء واجبه العسكري ضابطاً عراقياً في الجيش العثماني، في أثناء الحرب العالمية الأولى. وتبرز أهمية هذه الصفحات،

على قلة ما فيها، شجاعة هذا الضابط العراقي بين غيره من الضباط الذين ينتمون إلى شعوب أخرى، فهو قد حصل على تكريم من الجيش العثماني، ومن الجيش العراقي، ونشر اسمه في جريدة الحرب العثمانية بوصفه من الضباط الذين تحلّوا بصفة الشجاعة.

كما تبين هذه الصفحات أيضاً سعة جبهات القتال، وتنوعها، التي قدر لهذا الضابط العراقي أن يحارب بها، فهو قد شارك في أول عهده في بعض الحركات العسكرية في منطقة الفرات الأوسط، ثم نقل للالتحاق بالجيش العثماني الرابع، وكان مقره في فلسطين، وهناك شارك في الهجوم على القطعات البريطانية المتمركزة في جبهة قناة السويس، ثم جرى نقله إلى أدرنه، ثم أعيد بعدها إلى غزة، وبعدها نقل إلى أوربا، حيث حارب مع فرقتين عثمانيتين، هما الفرقتان ١٩ و٢٠، من الجيش العثماني في منطقة جناق قلعة، للدفاع عن كليبولي. ثم نقل مع الفرقتين إلى مدينة بلغراد، عاصمة صربيا آنذاك، ومنها انتقلت الفرقتان، بالقطار، عبر جبال التيرول، والمجر، حيث شارك في الجبهة الأوربية هناك. وقد عمل مدة من الوقت تحت إمرة ياسين باشا الهاشمي، الذي عاد برفقته إلى استانبول، ثم إلى حلب.

وبعد إعلان الهدنة، انضم إلى جيش الثورة العربية في سوريا، وهو المسمى (الجيش العربي السوري)، وفي دمشق شارك في النشاط السياسي للضباط العراقيين الداعين إلى تحرير العراق، وضمه إلى الدولة العربية الوليدة بقيادة أبناء الشريف حسين،وقد حضر بعض الاجتماعات التي كان ضباط الجيش يعقدونها في بيت جعفر باشا العسكري، وقد أقام في سوريا، ملتحقاً بالجيش العربي هناك حتى سقوط حكومة الملك فيصل الأول إثر معركة ميسلون سنة ١٩٢٠. وقام بمهمة سياسية خاصة، حيث كلفته قيادة الجيش بالذهاب إلى بغداد لاستمالة الضباط العراقيين إلى حكومة فيصل, ويظهر أنه أدى المهمة بنجاح، فقد تشكل بعدها نواة

ما سمي بالجيش العراقي، وعين هو آمراً للواء المدفعية، فتشكيل هذه النواة، كما تكشف المذكرات، جرى في دمشق، قبل أن يتأسس هذا الجيش رسمياً في بغداد في ٦ كانون الثاني سنة ١٩٢١.

وفضلاً عن ذلك فإن المذكرات تكشف عن وقائع وأسرار لم يكشف عنها النقاب بعد، منها أن اجتماع الضباط العراقيين في دار جعفر العسكري، كان مخترقاً من ضابط بريطاني، يظهر أنه كان من المخابرات البريطانية، كان يأخذ موضعه في إحدى حجرات الدار، كما أن أثنين من حراس جعفر باشا كانا يتجسسان على المؤتمرين.

ومعلوماتنا عن حياة مهدي الرحال، قليلة، باستثناء ما تمدنا به مذكراته، وغاية ما نعلم عنه أنه يتحدر من أسرة عربية أصلها من راوة، على الفرات، وأن أمه تركية من مدينة كوتاهية، وأنه أب لأربعة أبناء، هم١- خالد، وأمه أرمنية تزوجها في أثناء وجوده في الأناضول في أثناء الحرب العالمية الأولى، ثم طلقها فيما بعد، ولخالد ولد واحد هو محمد. و٢- سرحان، وأمه سورية، ولذا فهو ضابط شرطة برتبة لواء في سوريا، وله ولدان. و٣- مثنى وخلدون، وأمهما عراقية، وللأول ولد اسمه محمد، وثلاث بنات، أما الثاني فهم محام، ولم يتزوج. وللرحال بنات، منهن زوجة الفنان النحات الراحل محمد غني حكمت. وقد استمر في الخدمة في الجيش العراقي، حتى إحالته على التقاعد في الثلاثينات من القرن العشرين، وكانت إحالته هذه بسبب رفضه الانصياع لأمر عسكري يقضي بقمع حركة شعبية في بلدته راوة، على ما تذكر أسرته، وتوفي في سنة ١٩٧٥.

يبدأ الضابط العراقي مذكرات معلناً عن اسمه كاملاً، وولادته بالتاريخ الرومي المتخذ آنذاك في الوثائق الرسمية العثمانية، وموطن أبيه وأمه، فيقول:

**"إني مهدي بن محمد صالح بن سليم الرحال، قد تولدت في بغداد سنة ١٣٠٦ رومي، (١٨٩١ميلادية) من عائلة عربية الأصل، ومن قرية راوة، عشيرة البو**

نووسینەوەی مێژوو لە عێراقدا پەیتا پەیتا هاتەوە سەر ڕێچکەی خۆی بەلاَم لەچوارچێوەی مەنهەجی مێژوو نووسەکۆنەکان دەرنەچوو ئەوەی کەرووداوەکان بە گوێرەی ساڵەکان تۆمار دەکران , یان کتێبەکانی ژینامە و مێژووی شارەکان و ئەم جۆرە بابەتانە . هەرچی پەیوەندی هەیە بەقوتابخانەی مێژوویی عێراقی هاوچەرخ , بەشێوەیەکی وردتر ئەکادیمیەکەی ئەوە سەرەتاکانی دەگەرێتەوە بۆ ناوەراستی سەدەی بیستەم لەو کاتەوە ناوی گرنگ دیار کەوت لەبواری نووسینی مێژوویی ئەکادیمی توانیان قوتابخانەیەکی مێژوویی عێراقی پتەوو دیار و ئاشکرا دابمەزرێنن , ئەگەرچی ئاراستەی ئەو مێژوو نووسانەش جیاواز بێت لەنێوان لیبرالی و نەتەوەیی و مارکسی ... تد و دەتوانین چەندین ناو لەم بوارەدا بهێنین وەکو : جواد علي , د . صالح الحمد العلي , د . عبدالعزيز الدوري , د . فاضل حسين , د . فيصل السامر , د . عبدالامير محمد امين , د . جعفر خصباك , د . كمال مظهر احمد , د . حسين قاسم العزيز , د . فاروق عمر فوزي , د . هاشم التكريتي .... تد . و نەوەیەکی تەواو لە مێژوو نووسە عێراقییە ئەکادیمییەکان قوتابی ئەمانە بوون و لە سەردەستیان پێ گەیشتن کەئێستا پایەی زانستی و ئیداری پێشکەوتوو لەزانکۆ و دامودەزگا توێژینەوەییەکان لە عێراق و دەرەوەیان دا هەیە لێرەشدا ئامارە بەچەند ناوێکی ئەکادیمی پسپۆر دەکەم لەبوارەکانی ئابووری و کۆمەڵناسی کەبەشداری گرنگیان هەبوو لەبواری مێژووی ئابووری و کۆمەلأیەتی لە شەستەکان و حەفتاکان دا , بەتایبەتی ناوی هەندێکیان دەبەم : دکتۆر محمد سلمان حسن لە کتێبە گرنگەکانی ( تطور العراق الاقتصادي ١٨٦٤ — ١٩٥٨ ) و دکتۆر علي الوردي لە کتێبە ناسراوەکەی ( لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث ) و کتێبەکانی تری .

لەناوەراستی حەفتاکان دا دەست کرا بەهەڵمەتی نووسینەوەی مێژوو ( اعادة كتابة التاريخ ) کە چوارچێوەیەکی عارەبی وەرگرت تیایدا دەرفەت نەما بۆ ئەوانەی ئارەزوومەند بوون بەئازادی بۆچوونەکانیان بلأوبەکەنەوە , تاگەیشتە

ئـەو رادەیـەی مامۆسـتاکانی بـواری مێـژوو بـیر لەوەنەکەنـەوە بابـەتی تێکـەڵ بەسیاسەت بنووسن بۆیـە بابەتـەکان لەوسـەردەمە بـەلای بـواری کۆمەلأیـەتی و ئابووری زیاتر ئەشکایەوە و لەم روانگەوە بابەتی زۆر بەنرخ لەم بوارانە نووسرا .

د . محمد : کاك دکتـۆر کتێبـەکانت بەکـەمی لەهـەولێر و کوردسـتان هـەن , ئایـا بیرت لەوە نەکردووەتەوە دووبارە چاپیان بکەیتەوە ؟

د . خلیـل : وەکـو پێـشتر ئامـاژەم پێکـرد بەشـێکیان تـەنیا لەهـەولێرو دهـۆك و سلێمانی چاپ کراون بەتایبەتی ئەوانەی بـەناوی خـوازراو بلأوبوونەتـەوە , بـەلأم ئەوانی تر بیرم لێکردووەتەوە .

د . محمد : مەبەستم پتر نامەی ماستەرەکەتە .

د . خلیل : بەپشتیوانی خودا لەم نزیکانە هەوڵ دەدەم نامەی ماستەرەکەم چاپ بکەم , و چەندین هاورێم ئامۆژگارییان کردووم کەنامەی ماستەرەکەم چاپ بکـەم لەوانەش خوالێخۆش بوو د . صالح العابر لەبەر ئەوەی بەداخەوە هەندێك توێـژەر زۆریان لێ وەرگرتووە بەبێ ئەوەی ئاماژەی بۆ بکەن و لـەکاتی خـۆی دا نامەکـە بەکارێکی پێشەنگ داندرا .

د . محمد : ئەگەر باس لەخاڵێکی تر بکەین و بـەراوردێك لـەنێوان مێـژوو نووسـە عێراقـی و میـسرییەکان بکـەین , میـسرییەکان بەرهـەمیان زۆرە , ئایـا ئەمـە پەیوەندی بەبابەتەکان هەیە یان ئەوان پتر دەنووسن ؟

د . خلیل : کەس ناتوانی نکۆڵی بکات لـە کەلـەپووری میسر لـەبواری نووسـینی مێژوودا , هەروەها نکۆڵی ناکرێ لەبەشداری گرنگی میسر لەبواری مێژووی نوێ و هاوچەرخ دا . نابێ ئەوەشمان لـەبیر بچێت کـە کرانـەوەی کۆمـەڵگای میـسری لەسەر ئەورووپا و کەلتووری ئەورووپی پێش کاریگـەربوونی عێراقـە بـەو کـەلتوورە بەسـەددەیەك , هـەموومان کاریگـەری لەشکرکێـشی فەرەنـسی بۆسـەر میـسر لەساڵی ١٧٩٨ دەزانین و سیاسەتی نـوێ کردنـەوە کـە محمـد علـی باشـای والـی میـسر ١٨٠٥ – ١٨٤٩ پـەیرەوی کـرد ئەمـەش کرانـەوە بەرامبـەر ئـەورووپا و

کەلـەپوری رۆشـنبیری بەدوایـدا هـات ئەمـە سـەرەرای مێـژووی دام و دەزگـا ئەکادیمیا میسرییەکان بەبەراورد لەگەڵ نوێیەکان لە عێراقدا . بۆیە سروشتی یـە چەند نـاوێکی دیـار ببیـنین لـەبواری نووسـینی مێـژوو لەمیـسردا کـە کتێبخانـەی عارەبی بە توێژینەوەی مێژووی پر بایـەخ دەوڵەمەنـد کـرد سـەرەرای چـالاکییان لـەبواری وەرگێـران دا . بـەلآم وەکـو رای خـۆم کاتێـك نووسـینی مێژوونووسـە میسرییە هاوچەرخەکان دەخوێنمەوە و بەرامبەر بەمەش نووسـینی مێژوونووسـە عێراقییـە ئەکادیمییـەکانی هاوسـەردەمیان دەخوێنمـەوە , هەسـت بەوەدەکـەم کەمێـژوو نووسـە میـسرییەکان بـەرەو ئـەوە دەچـن کـەکتێب لـەبواری گـشتی لەمێـژوودا بنووسـن و پـتر گرنگـی بەشـێوازی خـستەروو بـدەن لەسـەر حیسابی مەنهەجیـەتی مێـژوویی لـە هەنـدێك کـات دا , لەهـەمان کـات دا مێژوونووسـە عێراقییەکان پتر ورد دەبنەوە لەوەی بنووسن هەروەها گرنگی بـە بـەدۆکیۆمێنت کـردن دەدەن . و ئەگـەر ئێـستا بـچیتە کتێبخانـەکان هەسـت بـەم بـەراوردەی دەکەی . هەروەها زۆر نووسینی هەندێك لەمێژوو نووسە میسرییەکان وەکو چۆن لەلای مێژوو نووسانی ولآتانی تر هەیە دەکرێ هۆی ئەمە بێت . هەروەها لە عێراق هەنـدێك مێـژوونووس هەنـە ئەوەنـدەی گرنگـی بـە چـەندێتی نووسـین دەدەن ئەوەنـدە گرنگـی بـە چـۆنیەتی ئـەو نووسینەنادەن . لـە کاتێکدا تێبینی ئـەوە دەکەین کەهەندێك لە مێژوو نووسە عێراقییەکان توانای ئەوەیان هەیە سـاڵی دوو کتێـب یـان سـێ کتێـب چـاپ بکـەن بـەلآم گرنگـی دان بەلایـەنی مەنهـەجی و وردبونەوە لەسەرچاوەکان بەتەواوی و پەرۆش بوون بـۆ پێـشکەش کردنـی شـتی باش و نوێ وایان لێ دەکات خۆیان لەمە بـەدوور بگـرن . بەهـەر شـێوەیەك بێـت ئەمە رای خۆمە لەوانە خەڵکانی تر هەبن رای جیاوازیان لەوەی من هەبێت .

د . محمد : دکتۆر گیان لە عێراق چـەند ئـەزموونێك هـەبووە کەبابـەتی مێـژوویی وەکـو زنجـیرەی تەلـەفزیۆنی بلآوبکرێتـەوە وەکـو ( اخـر الملـوك , الباشـا ) ئایـا هەڵسەنگاندنی تۆ چییە بۆ ئەم زنجیرانە , ئایا بـەردەوام بێـت باشـە یـان کـەم و کوری تیایدا هەبووە ؟

د . خلیل : بە بۆچوونی من ئەوانە کاری باش بوون بەتایبەتی بۆ ئەوانەی ئارەزوومەندنین بۆ خوێندنەوەی کتێبی مێژوویی لەرێگای ئەم زنجیرانەوە دەتوانین لەچەندین بابەتی مێژوویی شارەزا و ئاگادار بن بۆنموونە لەمێژووی عێراق یان لەمێژووی هاوچەرخ شتێکی لێ بزانن زۆر لەلاوانی ئەم سەردەمە ئەگەر پرسیاری ( ملك غازی ) یان ( ملك فیصل ) لێ بکەی دەربارەی ئەوان زانیاریان نییە , بەڵام ئەگەر ئەم بابەتە بکرێتە زنجیرە بەمەرجی نەشێواندنی بابەتە مێژووییەکە و ئاگاداری تەواوی مەرجەکانی تر وەکو دەرهێنان و لەهەمان کات دەبێت زنجیرەکە سەرنج راکێش بێت و بابەتی مێژوویی لە وشکی رزگار بکەن بۆ ئەوەی زۆرترین جەماوەری هەبێت , چونکە جیاوازیەکی زۆر لەنێوان بابەتی مێژوویی و زنجیرەی مێژوویی هەیە .

د . محمد : لەوەلآمی ئەوانەی شیکردنەوەی جیاواز بۆ مێژوو دەکەن بۆ نموونە هەندێکیان دەڵێت مێژوو بۆ چوونە و هەندێکی تر دەڵێت مێژوو زانستە , هونەرە , ئەگەرچی ماوەیەکە ئەم جیاوازییە لە بۆچوونەکان دەربارەی مێژوو هەیە , تۆ وەکو شارەزایەك لەبواری مێژوو و لەمیانەی تاقیکردنەوەکانی خۆت لەم چەند ساڵەی رابردوو کەچەندین بەرهەمت هەیە لەم بوارە , کام لەم لێکدانەوانە راسترە ؟

د . خلیل : لەراستیدا ئەم بابەتە بابەتی گفتو گۆو بۆچوون بوو لەنێوان مێژوو نووسان و توێژەران و بەتایبەتی لەسەدەی نۆزدەوە . و لەم رووەوە رایەکان جیاوازبوون . لەپێشتردا لەسەدەکانی ناوەراست دا لەئەوروپا نووسینی مێژوو بەهونەرێك لە هونەرەکان دادەندرا . هەروەها لە کەلەپووری مێژووی عارەبی و ئیسلامی دا مێژوونووسەکان وەکو هونەر ئاماژەیان پێدراوە لەم رووەوەش دەتوانین بگەرینەوە بۆ نووسینەکانی ( ابن خلدون ) و ( سنحاوی ) هتد بۆ ئەوەی تێبینی ئەوە بکەین . کەچی پەرەسەندنی رێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی لەسەدەی نۆزدەدا بووە هۆی وروژاندنی ئەم پرسیارە لە کۆتاییەکانی ئەو

سەدەیە و سەرەتای سەدەی بیستەم مێژوو نووسی ئینگلیز بیوری لەوانەیەکی لەساڵی ١٩٠٣ لەزانکۆی کامبرج دا وتبووی ( مێژوو زانستێکە نەزیاترەو نە کەمتر ) و هەروەها ( کولنجوو ) کە فەیلەسووفەو هاوچەرخەکانی مێژووە پێ ی وابوو کە ( مێژوو جۆرێکە لە جۆرەکانی توێژینەوەی زانستی .. و مێژوو لەبنەرەت دا دەچێتە خانەی ئەوەی ئەمرۆ ناوی دەنێین زانست ..) هەرچی ( هرنشو ) ی مێژوو نووسە وای دەبینی کە : ( ئێمە ناتوانین وەکو زانستە پراکتیکییەکان یاسای زانستی جێگیر لە توێژینەوە لەمێژوودا هەڵبهێنجین , کەچی ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی سیفەتی زانست لە مێژوو دا بماڵێ ) .

لەکاتێکدا ( ئەدواردکار ) لەکتێبەکەی ( مێژوو چییە ) دا لەگەڵ ئەو بۆ چوونە نییەکە پێ ی وایە مێژوو زانستە . لەراستیدا ئەوانەی رازی نین بەوەی مێژوو بەزانست دابندرێت پشت بەوە دەبەستن کەلەبەر ئەوەی ناکرێ رووداوە مێژووییەکان بخرێتە بەردەم بینین و پشکنین و ئەزموون بەمەش ناکرێ وەکو چۆن لە کیمیا و فیزیا و زانستە پراکتیکییەکان هەیە یاسای جێگیر هەلبهێنجرێ . ئەمەش دەخەنە سەر کە رەگەزی رێکەوت , سەرەرای بوونی رەگەزی کەسایەتی مرۆڤ و ئازادی وویست وادەکەن کەنەکرێ مێژوو بەزانست دابندرێت . وای بۆ دەچم کە مێژوو هەردوو سیفەتی زانست و هونەر لەخۆی کۆدەکاتەوە لەلایەنی زانستی مەنهەجیەتی مێژوویی هەیە کە مەبەستیەتی بگات بەراستییە مێژووییەکان لەرێگای زنجیرەیەك رێو شوێنی خاوەن مۆرکی زانستی بەدەست پێ کردن لەهەڵبژاردنی بابەت و کۆکردنەوەی ماددەی زانستی و رووبەروو کردنەوەی لەگەڵ رەخنەو شیکردنەوە , و تاوتوێکردنی رایە جیاوازەکان , و پابەند بوون بەبێ لایەنی و بابەتییەت بۆ گەیشتن بەراستی مێژوویی . و لەلایەکی تریشەوە هونەرێکە لەهونەرەکانی ئەدەب , مێژوو نووس پێویستی بەخەیاڵێکی فراوانە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ رووداوی مێژوویی , هەروەها پێویستی بەشێوازێکی ئەدەبییە بۆ ئەوەی بابەتەکەی بۆ خوێنەر بخاتە روو .. بەم شێوەیەش وای

دەبینم , و پێم واشە کە هی تریش هەن لەم رووەوە لەگەڵ من کۆکن کە مێژوو زانست و ئەدەب و هونەر لەگەڵ یەکتری کۆ دەکاتەوە .

د . محمد : ئێستا بۆچونێك هەیە کەدەبێت مێژوو تەنیا لەلایەن ئەکادیمییەکان بنوسرێت , بەلاَم لەکاتی نووسینی نامەکانی ماستەریان تێزەکانی دکتورا کەسەیری لیستی سەرچاوەکان دەکەین زۆربەی ئەونووسینانە تیایدایە کە نا ئەکادیمییەکان نووسیویانە , تۆ چۆن دەروانیتە ئەو بابەتە ؟

د . خلیل : نووسینی مێژوو ئەگەر لەلایەن ئەکادیمییەکان بێت بەمەرجێك ئەوانیش شارەزابن لەبابەتی رێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ئاگاداری سەرچاوەکانی تایبەت بە بابەتەکەبن پێموایە بەشێوەیەك دەینووسیّ باشتر لەکەسێکی نا ئەکادیمی , رەنگە نائەکادیمییەك هەبێت شارەزا بێت لە رووداوەکان یان زانیاری تایبەتی بەبابەتێك لەلابێت بەلاَم شارەزای رێبازی نووسینەوەی مێژوو نییە . دەکرێن نائەکادیمییەکان لەکاتی گرینگی دانیان بەبابەتێك یان سەرچاوەیەکی دەگمەن بکەوێتە دەستیان , کاری لەسەر بکەن بەلاَم لەکاتی نووسینەوەی بابەتەکە گرنگی بەشێوازی نووسین و مەرجە تایبەتیەکانی نووسین نادەن وەکو کەسێکی ئەکادیمی بۆیە دەکرێت مێژوو نووس لەکاتی پشت بەستنی بەسەرچاوەی نائەکادیمی رەچاوی چەند خاڵێك بکات ئایا ئەم زانیاریانە لەکویّ وەرگیراوە بۆئەوەی بگەرێتەوە سەر سەرچاوە رەسەنەکە دەکرێت بڵێین کاری نائەکادیمییەکان لە چوارچێوەی گرنگی دان دەرناچێت بۆیە ئەگەر مێژوونووس بینی سەرچاوەیەکی نائەکادیمی پشتی بەراستییەکان نەبەستووە بەکاری نەهێنێت باشترە , لەلایەکی تر هەندێك کاری نائەکادیمی هەیە ناکرێت فەراموش بکرێت بۆ نموونە کتێبەکانی ( عباس العزاوی ) کەکاری پارێزەری دەکرد بەلاَم چەندین کتێبی گرنگی هەیە وەکو ( العراق بين احتلالين ) ( عشائر العراق ) ( تاريخ النقود العراقيه ) ( تاريخ اليزيديه ) بەئاشکرا دەڵێم ئەگەر ئەوانە نەبوایە مێژوو نووسە ئەکادیمییەکان

زۆر بابـەتیان نـەدەزانی دەربـارەی مێـژووی عێراقـی نـوێ لەسـەردەمەکانی جەلائیرییەکان , مەغۆلەکان , قەرەقوینلو , ئاق قوینلـو , یـان نووسـینەکانی ( عبدالرزاق الحسنی) کە هەر کەسێك بیـەوێت لەسـەر مێـژووی عێراقـی هاوچـەرخ بنووسێت دەبێت پشت بەکتێبەکانی ببەستێت وەکو ( تـاریخ الـوزارات العراقیـە ) و ( التاریخ الوزارات العراقیە ) و ( تاریخ العـراق الـسیاسی ) ( تـاریخ الاحـزاب السیاسە فی العراق ) ..... هتد.

راستە ئەمانـە ئـەکادیمی نـەبوون بـەلام بابەتـەکانیان لەسەرچـاوەکانی تـر هێنـا بەتایبەتی ( عباس العزاوی ) زۆر شتی لەسەرچاوە فارسییەکان وەرگـرت کەچـی زۆر مێژوو نووسمان هەیە زمانی فارسی نازانێـت بـەلام ئێـستا مێـژوو نووسـەکان بەشێوازی ئەوان نانووسن بەڵکو دەکرێت سوودی گرنگیان هەبێت .

د . محمد : هەندێك بۆچوون هەیە کە دەڵێت مێژوو سوودی هەیەو زیانیشی هەیە , بۆنموونـە دەڵـێن مێـژوو وایکـردووە دیکتاتۆرەکـان سـوود لـە تاقیکردنـەوەی دیکتاتۆرەکانی پێش خۆیان وەربگرن , لەلای تۆ ئەم بابەتە چۆنە ؟

د . خلیل : مێژوو سوودێکی زۆری هەیە بەلام کەم کەس پەندی لێ وەردەگرێ ؟

# بەهەشتی شوکور مستەفا لەچەند نامەیەکدا

(بەشی یەکەم)

د. حسن جاف

مێژووی ئەدەبی و فکری کورد سەبارەت بەزۆربەی بیر مەندان و ئەدەبیانی ئەم میللەتە دواوە , یەکیك لەو بلیمەتانە کەجێی پەنجەیان لە زمان و ئەدەبی کوردیدا بەرووونی دیارە خوالێخۆشبو مەلا شوکورە ئەم زاتە بەدرێژایی تەمەنی لە تێروتەسەل کردنی زمان و وێژەو ئەدەبی کوردیدا دریغی نەکردوە ئەتوانم بڵێم بەم هەموو تەقەڵاوکۆششەوە لەپێناوی ئەدەبی کوردیدا شوکور مستەفا لەلایەن نووسەرانو ئەدەبیانی کوردەوە مافی خۆیی پێنەدراوە و ئەورێزەی کە پێویستە لە ئەدیبێکی هەڵکەوتویی کۆچ کردوو بگیرێت پێ نەگیراوە بەندە لەپەرتووکی (هؤلاء في مرايا هؤلاء) کەساڵی ١٩٨٧ چاپ کرا بەسەر دێری (شکورمصطفى الأديب الزاهر ) بەپێی توانام تیشکم هاویشتە سەرکەسایەتی و نەخشی ئەم زاتە لەئەدەب و زمان و وەرگێرانی کوردی و عەرەبیدا , و گووتوومە ئاسان نییە پردێك لە نێوان خوینەواریکی ئاسات و شوکور مستەفا دا دروست بکرێتن چونکە هەڵسەنگاندنی بیرو بۆ چوونو فەلسەفەی ناوبراو لە ژیاندا کارێکی سادە و رەمەکی نیە هەروا وتۆومە لەسەرەتای بینینیدا بە رۆشنبیرێکی سادە دێتە بەرچاو بەلام کاتی دەچیتە ناو قووڵایی بیرو بۆچوونەکانیدا دەبینی لە بەرامبەر دەریاییکی زانست دا وەستاوی ضروری خویندەواریکی بلیمەتو بە هوشو توانادایی .

ئەم زاتە لەهەموو بوارەکانی مەعریفەتدا خاوەنی بۆچوونی تایبەت بەخۆیەتی سوار چاکێکی مەزنە لەبواری زمان و ئەدەبی کوردی و عەرەبیدا , سەرەتای ناسیاریم لەگەڵ مامۆستا شوکور مستەفادا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی ١٩٥٥ — ١٩٥٦ ز لەم قۆناغەدا مامۆستای زمانی عەرەبی بوو لەقووتابخانەی ناوەندی یەعقوب ئامۆزاکانم دارا جافوو سالار جاف ماوەیەکی کورتیش د . عەلی جاف قووتابی مامۆستا شوکور بوون لەسەردانیکی دا بۆ قووتابخانەکەی سالار و دارا لە گەڵ شوکور مستەفادا ئاشنا بووم بەڵام ئەو بنەماڵەکەمانی بەچاکی دەناسی هەروەك هەڵگری بیرو باوەریکی چەپگەرا بەڵام بەرێزەوە وەلەگەڵ ئامۆزاکانمدا دەجوڵایەوە لەساڵەکانی حەفتاونۆ و هەشتادا دۆستایەتیمان دەستی پێکرد کاتی کەناوبراو ئەمینداری گشتی کۆری زانیاری کورد بوو دوای هەڵوەشانەوەی کاتێك کۆری زانیاری کورد دەستەی کورد لەکۆری زانیاری عێراقدا دامەزرا مەلا شوکور پلەی پسپۆر ( خەبیر ) سەرپەرشتی گۆڤاری دەستەی کورد دەست نیشانکرا و هەموو ئەرکێکی دەرکردنی گۆڤارەکەی کرد هەر لەو سەردەمەدا چاپکراوێکی تری کوردی هەمووی کەوتە ئەستۆی ئەو .

هاتوو چۆی کۆری زانیاری عیراقم زۆر دەکرد هاوپۆلیکم لە زانستەکەی ئەدەبیات مێژوودا بەناوی د . نەزار حەدیثي ئەندامی کارای کۆرەکە بوو هەروا یەکێ لەمامۆستاکانم بەناوی د . ئەحمەد مطلوب هەر لەویدا ئەندام بوو هەردو رێزێکی تایبەتیان لێ دەگرتم مەلا شوکوریش لەدەستەی کورد دا ئەوپەری لوتفو نەدازشتی دەنواند و هانی دەدا کە بە وتارو لێکۆڵینەوە لە گۆڤاری دەستەکەدا بەشداری بکەم .. و بەپێی توانام , چەند وتاریکم بۆ گۆڤارەکەیان نارد کە یەکێکیان بەسەردێری ( نەخشی هۆزی جاف لەمێژووی میللەتی کورددا لەسایەی چەند سەرۆکێکیەوە لە گۆڤارەکەدا بڵاو کرایەوە لەم قۆناغەدا بوومە ئەندامی

لێژنــەی مێــژوو لــە دەســتەی کــوردی کــۆڕی زانیــاری عێــراق بەســەر پەرشــتی خوالێخۆشـبوو مـەلا جـەمیل ڕۆژبـەیانی , لـەم کاتـەدا بـوو کەوتمـە ئـەوبیرەوە لـەوجودی مـەلا شـوکور ئیـستیفادە بکـەم بـۆ وەرگێڕانـی مێـژووی ئـەردەلانی ماهشەرەفخانم مەستورەی کوردوستانی لە فارسیەوە بۆ زمـانی کـوردی چـونکە لەمێــژبوو دەیوســت ســەبارەت بــەبوێری کــورد ماهــشەرەفخانم کــە نازنــاوی مەســتوورەی کوردوســتانییە . بەخوێنــدەوارانی کــورد زمــان بناســینم , چــونکە بەدەگمــەن نووســەران و ئــەدیبانی کــورد دەربــارەی ئــەم بویــژە دواون , بــەلاّم بەداخــەوە دەرفــەتم بــۆ هەڵنەدەکــەوت , دەمزانــی کەمەســتورەخانم کتێبێکــی ســەبارەت بەمێــژووی بنەماڵــەی ئــەردەلان بــەزمانی فارســی نووســیوە لەدڵــەوە دەمویــست ئــەم کتێبــە لەفارســییەوە وەرگێڕمــە ســەر زمــانی کــوردی و ئــەم وەرگێڕانە ببێتە کەرەسـەیەك بـۆ ناسـاندنی باشـتری مەسـتورە بەخوێنـدەوارانی کورد بەلاّم ئەم توانایەم لەخۆمدا نەدەبینی تا مامۆستای بەرێزم ئامادەگی خـۆی بۆ وەرگێڕانی ئەم مێژووە دەربری و بەدوو قۆڵی ناوی خوامـان لێنـاو دەسـتمان بــەکار کــرد بەزەحمــەتێکی فراوانــەوە هەرچــووین بــۆ ئــەو وەرگێڕانــە و گەیــشتە کتێبخانەی کوردی , شوکور مستەفا لەوەرگێراندا , کارامە بوو کەم جار دووبـارە وەرگێڕانەکەی دەنوسـییەوە وەیـا پیادەچـۆوە بەراسـتی وەرگێڕێکـی تەوانگـەرو دەسـترەنگین و بەسـەلیقە و لێهـاتو بـوو لـەرووبارو گـۆم و زەریـای هـەموو ئـەو زمانانەدا کەدەیزانین مەلەی دەکرد لەمیانەوە دەچوو بۆئەوەی دیکەو لەویشەوە بـۆ سـێیەمینیان و دواتـریش دەهاتـەوە بـۆ یەکـەمیان . مامۆسـتا شـوکور پـاش خانەنشین کرانی لەکۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد لە ساڵی ١٩٩٦ ماوەیـەك بە نەخۆشـی دوژ دامـان و خـەمۆکی یـەوە ناڵانـدی بەبۆچـونی مـن ئـەو دەردەی لەئەنجامی ئەودوورکەوتنەوە لە پرەیەوە بو لەکۆمەڵ و لەگشت دۆست و یـاران و

برادەرانەی کەلەکۆر سەریان لێ ئەداو بەدەوره پشتیەوە بوو لەم قۆناغەدا پەیوەندی دۆستایەتی من و خوالێخۆشبو شوکور مستەفا رۆژ بەرۆژ پتەوتر دەبوو وای لێهات زۆربەی رۆژەکان بەیەکەوە بوین کار گەیشتە ئەو رادەیە بارو بەنەی گویزایەوە ماڵەکەم وەك باسم کرد تووشی نەنەخۆشی خەمۆکی بوبو بەو پەری نەوزاشت و قەدر زانینەوە خۆم و هاوسەرەکەم گەلاوێژی داود بەگی جاف و مناڵەکانم و هەموو خزمانم لەگەلیدا رەفتارمان دەکرد دەمان زانی یەکجار هەستیارە بۆیە هەوڵمان دەدا . قسەیەك یان رەفتاریك نەکەین بیرەنجینی یا دڵگرانی بکات .

پەیوەندیەکەمان ئەوەندەتۆکمە بوبو ئەگەر رۆژیك یان شەوێك نەهاتایەتەوە بۆ ماڵەکەمان نیگەران و پەژارە دەبووین , و هەرچۆنی ببوایە دەمان دۆزییەوە و هۆی نەهاتنەکەیمان لێ دەپرسی بەکورتی بوو بووە ئەندامێکی رێزداری بنەماڵەی جاف بەگشتی و بنەماڵەکەی من بەتایبەتی .

کورتەیەك لەژیانی مەلا شوکور

مەلا شوکور کوری وەستا مستەفای چەخماچییە باوکی خەڵکی سولەیمانی یە کاروباری تفەنگ چاك کردنەوەبووە .

دایکی ناوی عائیشە بەرەسەن خەڵکی سولەیمانی یە وەکو خۆی دەیگێرایەوە ساڵی ۱۹۳۳ ز لەگوندی ( مامشە ) سەرناحیەی قەرە حەسەنی پارێزگای کەرکوك لەدایك بووە بەلاّم خوالێخۆشبو مەلا جەمیل رۆژبەیانی لەوتاریکدا سەبارەت بەناوبراو دەلێت ساڵی ۱۹۲۹ لەگوندی مامشە لەدایك بووە . تەمەنی ۹ مانگ بووە باوکی کۆچی دوایی کردووە . دایکی بەبۆنەی تەنگ دەستییەوە گوندی مامشەی جێهێلاّوەهاتوەتە کەرکوك بۆلای براکەی بە بەرژەوەندی زانیوە

کەمیرد بکات و شوی کردووەتە پیاوێك کەسەر بەبنەماڵەی سەید ئەحمەدی خانەقا بووە . و لەگوندی ( کۆوڵەدا ) ماوەی سالّ و نیوێك ماوەتەوە قورسی باری ژیان وای کردووە کە دایکی بینێرێتە ماڵی خوالێخۆشبو فەرەجی برا گەورەی شوکور مستەفا ( ۱ ) ئەو سەردەمە تەمەنی شەش ساڵێك دەبوو دوای ماوەیەك دایك و باوەپیرەکەی هاتنە کەرکوك , شوکور لەنێوان ئەم دوو ماڵەدا بەهەژاری ژیانی دەبردە سەر هەر لەمناڵیەوە نیشانەی زیرەکی و کارامەیی لەشوکوردا خۆی دەنواند ئەوەبوو نێردرایە حوجرەی مەلایان بۆ خوێندنی ئایینی و تاساڵی ۱۹٤۱ لەماڵی فەرەجی برایدا ماوەتەوە بەلاّم بەهۆی قات و قری شەری دووەمی جیهانیەوە ناچار بوو ماڵی برایەکەی جێبهێڵێ و یەکێ لەمزگەوتەکانی شۆریجەی کەرکوکدا بەناوی مزگەوتی ( نورالدین ) نیشتەجێ بووە .

و هەر لەوێدا دەستی کردە خوێندنی زانستە ئاینییەکان بە مامۆستایی (سەعدوللا هەوائی) لەو قۆناغەدا کتێبەکەی سیوطي کە شەرحێکە لەسەر ئەلفییەی ( ابن مالك ) لە نەحوی عەرەبیدا بخوێنی و لەبەری بکات و ئەم کتێبە یەکەم پلەیە بۆ خوێندنی زانستە ئاینییە کۆنەکان . ئەم خوێندنە بۆی رەخساند کە ساڵی ۱۹٤۷ – ۱۹٤۸ لە قوتابخانەی ( الهداية الاسلامية ) دا لەبەغدا وەربگیرێت ( ۲) و دوای تەواوکردنی ئەو قوتابخانەیە لە دانیشگەی شەریعەتدا وەرگیرا و بەسەرکەوتوویی ئەو دانیشگەیەی تەواو کرد و بەمامۆستای زمانی عەرەبی لەچەند قووتابخانەیەکی پارێزگاکانی عێراقدا دامەزراو سەرگەرمی خزمەت بووە مەلا جەمیل رۆژبەیانی هەر لەو وتارەدا سەبارەت بەشوکور مستەفا دەڵێت , ساڵی ۱۹٤۷ چوومە دەیدەنی یەکێ قوتابیەکانم ( ۳ ) وتاری مەلا جەمیل رۆژبەیانی بەزمانی عەرەبی بەناوی مەلا فەتاح روژبەیانی وەلەوێدا شکور مستەفام بینی و زۆر زیرەك و هۆشیار و کارامە هاتە بەرچاوم , سەیرم

کرد بیرو باوەڕێکی نیشتمان پەروەرانەی هەیە و چەند بەیاننامەیەکی دژی ئیستعمارگەرانی پێبو دوای ئەم بینینە وە تاساڵی ١٩٥٤ نەمبینیوەلەو ساڵەدا من مامۆستا و خەتیبی مزگەوتی داقوق بوم جارێکی تر یەکتریمان بینیەوە و سەبارەت بەو سەفەرەی کەلەگەڵ مام جەلال بۆ بۆ بەشداری کۆنگرەی لاواندا لە وارشۆ ساڵی ١٩٥٥ کردبوو بۆی گەراندنەوە هەروا لەوسەفەرەدا سەری لەسوریا و یەکیتی سۆڤیێت و ئەوروپایش دابوو هەروا دەڵێت ساڵی ١٩٥٦ لەزانستەکەی شەریعەتدا لە بەغدا چوومە دیدەنی قوتابیەکی زیرەك و بەفام و کارامە هاتە بەرچاوم دوای تەواو کردنی ئەو زانستگەیە , لەچەند قوتابخانەیەکی پارێزگاکانی عێراقدا , وەك سولەیمانی و کەرکوك و نەجەف و کەربەلا و حەبانییە و بەعقوبەو راوە دا دەرسی زمانی عەرەبی داوەتەوە وەکو بیستم خولێخۆشبو ( جمال الدین الالوسی ) کەبشکێنەرێکی ( مفتش ) لێزان بووە چوەتە ئەو قوتابخانەیەی کەئەو لەشاری نەجەفدا وانەی عەرەبی داوەتەوە دوای گوێراگرتنێکی یەك سەعاتە داخوازی لێدەکات بێتە هۆدەی مامۆستایان شوکور دەرواتە لای , ( جمال الدین) پێی دەڵێت مامۆستا شوکور , وانەکەت ئەوەندە دژوارو پیچیدە بۆ من بەسەختی لێی تێدەگەیشتم ئەبیت ئەم قوتابیە بەسەزمانە چۆن لێت تێ بگەن . تکایە تا ئەتوانی وانەکەت ئاسان بکەرەوە بروا بکە ئەوکاتەیە قوتابیەکانت سودت لێ وەردەگرن و حەز بەدەرسەکەت دەکەن , ساڵی ١٩٧٢ خزمەتەکەی گوێزرایەوە بۆ بەرێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی و لەو شوێنەدا سەرگەرمی وەرگێرانی پەرتووکە فەرمییەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی لەزمانی عەرەبییەوە بۆ کوردی دەبێت , و ئەو بەرپرسیاریەتییەی بەچاکی ئەنجام داوە و خزمەتێکی شایانی لەم بوارەدا نواندوە .

ساڵی ١٩٧٦ خزمەتەکەی گوێزراوەتەوە کۆری زانیاری کورد لەبەغدا وەکراوە بە ئەمینـداری گـشتی کۆرەکـە , و تاسـاڵی ١٩٧٩ لـەو کـۆرەدا ماوەیـەوە و دوای نەمانی کۆری زانیـاری کـورد کرایـە شـارەزا لـەکۆری زانیـاری عێراقـدا دەسـتەی کـورد, و سەرپەرشـتی گۆڤـاری ئـەو دەسـتەیەی گرتـە ئەسـتۆ شـوکور مـستەفا سەرەرای زمـانی زگمـاکی زمـانی عـەرەبی و فارسـی و تارادەیـەك ئینگلیسیـشی دەزانی و زمانی تورکی بە شێوەکانی ئەتاتورکی و ئازەری دەزانی زیاتر لەپـەنجا کتێبی بە بەرهەم هێنـاوە بـۆ سـەرزمانی کـوردی . شـوکور مـستەفا منداڵییـەکی سـەخت و دژواری لەسـەرەتای ژیانیـدا لـەنێوان بنەماڵەیـەکی هـەژارو نـەداردا بردوەتە سەر و ئەم هەلو مەرجەی ژیانەی کاریگەرییەکی زۆری بەسەر پێکهاتەی دەروونی ناوبراوەوە بـووە بۆیـە مرۆڤێکـی یـەکجار هەسـتیارو تارادەیـەك تـورەو شەرمۆکی لێ هاتووە بار پتر حەزی لەتەنیایی دەکرد و هەمیـشە لەخۆیـدا بـوو و لـەژیان تێـدەفکری وەکـو دەیگێرایـەوە لـە چـلەکانەوە ئاشـنایی لەگـەڵ بـیر و بۆچونی مارکسیەکاندا پەیدا کردوە بیرو بۆچوونی چەپگەرایی لـە بۆچـوونەکانیدا وە دەردەکەوت و گەیشتبووە ئەو قەناعەتە فەلـسەفەی مارکـسیەت لەروانگـەی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و رامیارییـەوە . چـارەیەکی یـەکلا کەرەوەیـە بـۆ گیروگرفتەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و رامیاری میلەتـە جـۆراو جۆرەکـانی ئـەم دونیایەدا .

بەڵام وەکو خۆی دەیگێراوە هەرگیز وەکو کۆمۆنیستە کـوردە ( کلاسـیکیەکان ) بـیری نەکردوەتـەوە تێنـەفکراوە و نەجولاوەتـەوە , و لەسـەر بەخۆیـەوە لەوبروایەدابووە کورد نەتەوەیەکە ماف رەوای سـەربەخۆیی هەیـە چ لەعێراقـدا چ لە شوێنەکانی تردا کە کـورد تێـدادەژی دوای لـەنیو چـوونی یەکیـەتی سـۆڤیەت مامۆستا شوکور تارادەیەك دووچاری دڵەراوکەیەکی فکری بوبو بەڵام روون نەبوو ئایا هێشتا بروای بە مارکسیەت وەك جاران ماوە یا وەك گۆرانکارییەکی بنەرەتی بەسەر بیرو باوەریدا هاتووە ... ؟

ئەگەر زۆرت بدواندایە هەستت دەکرد کە پەریشانیەکی دەرونـی و فکری بـاڵی بەسەر بیرو بۆچونەکانیدا راکێشاوە . دوای خانەنشینی بـوونی مامۆسـتا شـوکور بـارودۆخی دارایـی یـەکجار پەریـشان بوبـو بەتایبـەت دوای ئـەوەی خـاوەن خانگەیەکی دەعوای لەسەری تۆمار کردبوو بۆ ئـەوەی خانگەکـەی لێبـسینیتەوە بۆ نەهامەتی مەلا شوکور بریاری دادگا لەسودی خـاوەن خانگەکـە دەرچـوو لـەو قۆناغەدا حەصارێکی ئابووری یەکجار سەخت بەسـەر عێراقـدا سـەپێنرا ژیـان بـۆ دەوڵەمەند و داراکانیش تارادەیەك سەخت و دژوار بوبو چی بگاتـە هـەژار و کـەم دەرامەتەکان مەلا شوکوری منالێکی زۆری بە ئەستۆوە بوو کەزۆربەیان کچ بوون و شیعرە ناودارەکەی مەلا عەبدوللای بیتووشی لەگەڵ هەل و مەرجی ژیانی ئەودا دەگونجا کەدەڵێت :

أثقلت ظهري بنات عدة .. لم اطق منها نهوضا و قياما

و ديون بهظتني و حروب عظام أوهنت مني العضاما

سەرباری ئەم بارودۆخە نالەبارو ناخۆشە نەخۆشی خەمۆکی تەنگی پیهەڵچنیبوو و هەراسـانی کردبـوو شـەوان بـە ( فـالیومی دەیـش ) خـەوی لـێ نەدەکـەوت نەخۆشییەکەی گەیشتبوە رادەیەك شتی فەرامۆش دەکردو قسەی بـەرەوانی بـۆ نەدەکرا .

ئەوە بوو لەچلەی ماتەمینی ئەدیب و نووسەری کورد حەمە سەعید جافدا کـە لـە ٢٤ / ٣ / ١٩٩٦ کۆچـی دوایـی کـرد نـەیتوانی بەشـداری لـەو بۆنەیـەدا بکـات وتارەکەی من نووسیمو بەناوی ئەوەوە خویندمەوە ( ٤ )

لەپێش نەخۆشیەکەیدا رۆمانی ( بوف کور )ی صـادقی هیدایـەتمان وەرگێرانـدبۆ سـەر زمـانی کـوردی و لـەماڵی خۆیانـدا پیـا دەچـۆوەوە . بەداخـەوە لەنەخۆشـیەکەیدا ونـی کـرد و نـەی دەزانـی لەکویـدا دانیـاوە بـەم جـۆرە ئـەو هەوڵەمان بەفیرۆ چوو .

هەروا دیوانی خوالێخۆشبو مینە جافمان لای دانابو کەپیا بچیتەوە بەداخەوە ئەو دیوانەشی تیاچوو ئەگەر بەشێکی ئەو دیوانە لەلایەن خوالێخۆشبوو مستەفا نەریمانەوە چاپ نەکرایە کەس نەی دەزانی مینەجاف شاعیرێکی خاوەن دیوانە.
ساڵی ١٩٩٨ مامۆستا شوکور پیمیگووت دەمەوێ برۆمە کوردستانی ئازاد کراو خوی واتەنی ئەم کاولبوە کە بەغدایە بەیەکجاری جێبهێلم بەوتەی خۆی هەردوو لا دەعوەتیان کردبوو کەبێتەوە کوردستان , منیش هەروەك لەدڵەوە نارەحەتی فیراقی دەبووم , بەلام پێمراگەیاند , گوومان لەوەدا نییە رۆیشتنت بەرژەوەندی خۆتو میللەتەکەی تێدایە , ناوی خوای لێبیرە ( و اذا عزمت فتوکل ) پێش رۆیشتنی وتی ئەمانەتی تۆو مناڵەکانم ئاگات لێیان بێت , تا لەوی سەقامگیر نەبم و بارودۆخی ژیانم لەبار نەبێت مناڵەکانم ناهینمەوە کوردستان , وتم مامۆستا درێغیم نەکردووە و نایشی کەم ئەوە بوو رۆیشت نامەونامەکاری لەنێوانمادندا دەستی پێکرد ئەمەیش چەند نمونەیەکی ئەو نامانەیە کەدەیخەینە بەرچاوی خوێندەوارانی بەرێز لەهەندی لەو نامانەدا چەند دێرێکی سەبارەت بەچەند کەسایەتیەکی ناسراو ئەدویت بەپەسەندمان نەزانی وەك خۆی ودێرەکانمان لەنامەکاندا پەراندووە . ئەونامانە تیشك دەخاتە سەر بیرو بۆچوونی مەلا شوکور لەو قۆناغەدا هەروا لەئاستی ئەدەبی و هزرییەوە نایابن لەهەندێ لەم نووسراوانەیدا رونتر دەردەکەوێت کە شوکورمستەفا خوێنەوارێکی قوول و روناکبیرێکی کارامە و مرۆڤێکی هوشیار بووە هەر ئەم نامانە لەبواری زمانی کوردی و فارسیدا بۆمان دەسەلمێنی ئەو کوردیزانێکی گەورە بوو شوکورمستەفا وەك هەژار و هێمن کوردیزان بوو نەك زمانەوان پەیوەندیی وی بەزمانەوە پەیوەندیی کوردیزانێکی لێهاتو بوو نەك زانایەکی بواری زمانەوانی ( ٥ ) ئەمیش دەقی چەند نامەیەکی تر بۆ نووسەری ئەم دێرانە نووسیویەتی .. وابزانم بڵاوکردنەوە بەسوود نەبێت.

بەڕێز دکتۆر حەسەن بەگ سڵاو

نامەی یەکەم

برادەر دەمێکە لەیەك بێ خەبەرین بەراستی چابوو دەرفەتی ئەوەم بۆ ڕەخسا , کاك گەرمیانم کاك عەلی حسین بەگ بینیم , دەنگو باس حاڵو بالی هەمووتان لێ بیست , زۆر شاد بووم , پیرۆزبایی لە دیاکۆ و شەمەخانم دەکەم , بەدڵی خۆش و گۆرانێکی تازە لەژیانی هەردوولا ... کاکە بێ تۆیم پێوە دیارە هەرچەندە زۆرم لەهەمە بابەت لەدەورن خۆزگە لێرە پێکەوە دەبووین , شتی سەیر لێرە هەیە ... نازانم خەریکی چیت بەچی یەوە وەختەکەت دەکوژی ..! کاکە هەموو شتێ لێرە بەدڵی منە ... ڕەنگە بەرەو سنە قەلفری بکەم پیاوی چاك بە ژیانەکەت بگۆرە , کورد مردنە مردن .

هەردوو کتێبەکەم وا خەریکن تەواو دەبن , خەریکم کتێبێ لەسەر مەلا ئیدریسی بەدلیسی , تەرجەمە دەکەم , شتی چاکی تێدایە ... بەزۆر دیدارێکیان لە تەلەفزیۆنی گولان پێ کردم , زۆرم قسەی چاك کردووە .

سەلاو ڕێزم بۆ کاك سەردار , دارا , عەلی بەگ , دوکتۆر عەلی , سەرتیب و بارام و قادر و نەوزاد و هەلگورد و شاهو ئەلبورز و شهریار و سەرباز و سەرباس و شایان و دیاکۆ و تابان خانم و خوشکی زۆر گەورەم گەلاوێژ خانم و سەرگوڵ خانم و ڕەعنا خانم و هەرچی تر هەن لە گەورەو بچووك . ئەحواڵی کاك خوسرەو دەنێرم چاوەکانی ماچ دەکەم سەلاو کەخورشیدە خانم دەڵی دیمن خانم چۆنە ..؟ ئەحوالی دەپرسم , هیوادارم ئاقلو سەربەز بێ ... سەلاو لەماموستا جەمیل دەکەم پێی بلێ مامە زۆری لێ زیزە , نەك لەبەر عیزەدین , لەبەر شتی تر ... ڕەنگە ماوەیەك دڵی خۆش کەم ... زەحمەت نەبی تەلەفونی بۆ پەروین بکەن , بابزانی کاغەزم بۆ نووسیون حاڵ و باکم زۆر خۆشە بەلام ئاخ پشت ئیشە سەلاوم بۆ مظفر و هەموو دۆست و هاورێ یان

هەربژی بۆ برای دڵسۆزت

سەعات ٣ ماڵی کاك عەلی حسن بەگ , عینکاوە / هەولێر , پیرمام کۆشکی میدیا لە مەسیف

نامەی دووەم

بەرێز کاك د . حەسەنی دڵسۆز و پیاو کوردی رەسەن سەلاو .. برادەر زۆرتان بیر دەکەم , هەمیشە عالیجەنابی گەلاوێژخانم لەبیر ناچێتەوە ئێوە و ئامۆزا بەرێزەکانت براو پشت و پەنام بوون ... پێلاوی غەریبی و ئیختیرابم لەپەنای ئێوەی بەرێزدا کردەوە , کاکە سەرداری بەرێزم هەرگیز لەبری ناچێت کاکە خوسرەوم لەبیر ناچێ .

دوکتۆر گیان ئەوەی بە ئاواتیە بووم بۆم رەخساوە لێرە , بەو پەری رێز و ئاستی هەرە سەروەرم دەگەڵ رەفتار دەکەن , دەتوانم بڵێم , بنەماڵەکە هەژاریان لەدەست چووبوو . بەلام هەموو شتێکی هەژاریان لەمندا دۆزیەوەتەوە ... ئەگەر جێگاکەییم پتر پر نەکردبێتەوە , هێندەی ئەوم جێگە بۆ پرکردوونەوە, من هەڵوەدای ئەوەبووم , ئەوەی دەیزانم بلاوی کەمەوە , دەزگایەکی چاپەمەنی زۆر مۆدیرینیان خستووە ژێر ئیختیارم , ئەوەی پێم چاکە چاپی دەکەم , مێژووی کوردەکەم بۆ ناردی , کتێبی ( بەدرخانیان )م لەم رۆژانەدا دەکەوێتە بازارەوە , کارێکی زۆر گەورەم ئەنجام داوە . لەقاهیرە و شام خزمانی بەدرخانیان چاوەرێی دەکەن . زانایانی گەورەی بەرەچەڵە کوردی ئەیووبی و بەدرخانی , لەرێی کاك سامی و عمر بۆتانی یەوە سەلاویان بۆ ناردووم کتێبەکەیان بۆ بنێرم , دەعەتیان لێ کردووم بچم بۆ ئەو ولاتانە ... رەنگە لەم جاری دووەمی ( الحوار الكردي العربي ) یەدا بچم پێشتر وتیان بچۆ رام لێ نەبوو, نەچووم , بەلام ئەمجارە بەرنامەکە رەنگە بەدڵم بێ و بچم.

کۆر لە دروست بووندایە , وەك رۆژبەیانی بۆی نووسیم رەنگە ( هاوسارە ) کەلە مل من بکەن , رۆژبەیانی چونکە خۆی جورئەتی ئەوەی نی یە بێتە مەیدانەوە , هەروا لەدوورەوە تفەنگ بەمانگە شەو ونەنێ , نازانی دنیا بەری بەکوێ وەیە . بۆم نووسیوە چاو لەمن بداو بێ .. خزمەکانی ئێرەشی زۆر هەوڵ دەکەل دەدەن نازانم دەگا بەچی ...؟

حەمە دوو دڵە بەدیار باوکیەوەکەی بمرێ پاش ئەو نازانم , دەسپێچیك و بیانوی چی یە ...؟ ناوێری بێتە نێو مەیدانەوە .

برادەر خەریکم کتێبی ( مەلا ئیدریسی ) لەچاپ دەدەم لێرەم تەرجەمە کردووە .

مقابەلەکانم زۆرە واله کتێبێکدا هەمووم بۆ چاپ دەکەن , نوسخەت بۆ دەنێرم .

هەرچوار بەرگی کتێبەکەی کاك م . ب . دەکەم بەتورکی دەچم لەئەستەمبۆڵ لەچاپی دەدەم , سەعید ناکام کردوونی بەکوردی نوسخەت بۆ دەنێرم , مام هەژار زۆری شت نووسیوە , هەمووی لێرە چاپ دەکەین . دیوانەکەی شتەکانی دیکەی هەموویان دووای فاستیڤاڵێك بۆ لەچاپ دەدەین , هەموویانت بۆ دەنێرم .

خەریکم کتێبەکەی , ئیسماعیل بێشکچی تەواو دەکەم , چاپی دەکەم زۆری دیکەم بەدەستەوەیە ... دیراسەیەکی گەورەم لەسەر خانی نووسیوە بەعەرەبی یە , ئەویش سەر و بەری دەینم . کتێبێکم لەسەر هەژار نووسیوە , یەکی دیکەم لەسەر د . عبداللە جودت تەرجەمە کردووە , هەموویان لەچاپ دەدەم .

حرووفیەکم نارد بۆ شام , نەیان وێراوە لەوێ لەچاپی دەن ( ٦ ) رەنگە لێرە بیکەم .

دکتۆر گیان ژیان پاسۆری پێویستە پارەو بۆ ناردووە , تکات لێ دەکەم موعامەلەکەی بۆ هاسان کە , بۆی جێ بەجێ بکەن , ئەگەر توانیتان خۆت و کاك سەرداری گەورەم بەبارێکی دیکەدا کەمتری پێ بچێ بۆێ بکەن . ئیتر بەندە ئامادەی هەمو خزمەتێکتانم, من هەرگیز لەچاکەتان دەرناچم زۆر زۆر کاکە عەلی دەبینم کیسرایشم دیت , زۆر خاسن دەستی سەردار و مریم خانم ماچ دەکەم . براوە قورعان بێرتان دەکەم , دیاکۆ و دیمەن چۆنن چاویان ماچ دەکەم . سەرتیپ , هەڵگورد , شاهو , کاك عەلی , دکتور عەلی , خانمەکەی , رەعنا خانم , کاك سەرباز و خانمی دایکی , کچەکانی کاکە کەت , خێزانەکەی عەلی برات , مناڵەکانی , تابان خانم , سەرگوڵ خانم , شایان , بووکی تازەتان , سیروان , سەیران سۆما , مظفر , سەلاویان لێ

ئەکەم , سلاو لە سالم الالوسی , کاك کمال مظهر دەکەم , لێر چوومە خزمەت کاك فؤاد ... سلاو لەکاك بدرخان ئەکەم بێژە مامەی دەگەل د . محمد صالح جومعە دەعوەتی لێ کردم زۆر زۆر ئەیوینم .

ئیتر خۆشیتان برات ش

١٥ / ٦ / ١٩٩٨

دوکتۆر گیان هەرچی یەکت هەیە بۆت بخەمە سەرباری بۆ چاپ حازری کردن بیان نێرە بۆت ئەکەم و بۆت رەوانەی ئەکەمەوە .

---

( ١ ) لەژیاننامەی شەکوردا لەیادی رێزلێنانی دا رێکەوتی ٤ / ١٢ / ٢٠٠٣ کە لەلایەن بنکەی کاوەی روشنبیری کوردی بلاوکراوەتەوە هاتوە دوای شو کردنی دایکی زر براکەی بەخێویکردووە لەکەرکوك کەناردوویەتیە بەرخوێندن لەلای مەلا محەمەدی تورکمانی هەر لای ئەویش فێرەخوێندن و نووسین بووە بەزمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی بە پێی پرۆگرامی ئەوکاتەوە پەیرەو کراوە لەسالی ١٩٣٩ چووەتە لای براکەی دیکەی , کەلەشاری بەسرە لەخواروی عێراق بووە چەند مانگێك لەوێ بووە لەوێ فێرە زمانی جولفی عەرەبی خواروی عێراق بووە پاشان دەگەرێتەوە کەرکوك .

( ٢ ) وتاری مەلا جەمیل روژبیانی بەزمانی عەرەبی

( ٣ ) بەنازناوی شکور العصامی النابغ لەکۆرێکدا کەبنەماڵەی جاف بەسەرپەرشتی خوسرەوجاف لەرێکەوتی ٢٥ / ٥ / ١٩٩٧ لە بەغدا بۆ رێزلێنانی شوکور مستەفا رەخسێنرا دەسەلات رێگای نەدا جەمیل وتارەکەی بخوێنێتەوە .

( ٤ ) بروانە خوسرەوجاف , پرسە , بەغدا ١٩٩٦

( ٥ ) بروانە وتاری مامۆستا فەرهاد شاکەلی لە کۆری یادی رێزلێنانی شوکورمستەفادا کە لەلایەن بنکەی کاوەی روشنبیری کوردی بەوە بەستراوە رێکەوتی ٤ / ١٢ / ٢٠٠٣ .

( ٦ ) ئەم کتێبە بە پێشنیاری من , بەدوو قۆڵی تەرجەمەمان کرد , رەشنووسەکەی لای ئەوبوو پوختەکەی چەند لایەکی تەرجەمە نەکرابوو , لەهەولێر دۆزیمەوە لە کتێبخانەکەمدا وون بوبو .

نامەی یەکەم

# چاکسازییەکانی رەزا شا

وەرگێڕانی: د. محمد عبدالله کاکە سوور

رەزا شا زۆر سەرسام بوو بەو چاکسازییانەی کەمال ئەتاتورك پێ ی هەڵستا لەسە هەمان رەوت چووە پێش بۆ هێنانە ناوەوەی چاکسازییەکان بۆ ژیانی ئێرانی و سەرسام بوونی بەشارستانیەتی رۆژئاوایش ئەم چوونە پێشەی خێراتر کرد ئەوەبوو هەوڵی دا لەسەر حیسابی داب و نەریتی گەلانی ئێران زۆر لە دیاردەکانی شارستانیەتی رۆژئاوایی بهێنێتە ولاتەوە , ئەو کارەی کە رەنگدانەوەی لەسەر خودی چاکسازییەکانی هەبوو ئەوانەی کە ئەنجامەکانیان سنوور داربوون بەتایبەتی لەلایەنە کۆمەڵایەتییەکاندا لەبەر ئەوەی ناکرێ بەیاسایەك کە دادەنرێ یان بەچەك ئەو بەها کۆمەڵایەتییانە بگۆردرێن کە کۆمەڵگای ئێرانی لەسەری راهاتبوو , ئەگەر چی هەندێ لەو بەهایانەش دواکەوتبوون [(١)] .

پێویستی کەسێکی دواکەوتووی ئێرانی بۆ خواردن و خوێندن و کارکردنی زۆر گرنگتربوو لە پێویستی بۆ شەپقە یان جل و بەرگی رۆژئاوایی بۆیە زۆربەی چاکسازییەکانی رەزاشا رژانە سوپاو گەشەپێکردنی .

سوپا

رەزاشا گرنگی سوپای بۆ دەرکەوت نەك لەبەر ئەوەی بەهۆیەوە گەیشتە ترۆپکی شکۆمەندی بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەو کۆڵەکە ناوەراستە بوو کە رەشماڵی شاهنشاهیەتی لەسەر وەستابوو ئەوەبوو پێش ئەنجامدانی کودەتاکە و کاتێك سەرکردەی یەکێك لە تیپەکانی قۆزاق بوو سەرجەم کاتی خۆی بۆ وەزیفە سەربازییەکەی و چاکسازی کردنی هێزەکانی قۆزاق تەرخان کردبوو , دوای ئەوەی کاروبارەکەشی بۆ سەقامگیر بوو ( کاری کرد بۆرێك خستنی سوپاو بنەما پێویستیەکانی بنیات نانی بە شێوەیەکی بەهێزو یەکگرتوو دانا کە بەهۆیەوە دەتوانێ ئاسایش لە وڵات بپارێزێ [٢] . سەرەرای دابین کردنی مانەوەی لەپایەی یەکەم لەدەسەلات . ئەم راستەقینەیە زیاتر روون دەبێتەوە لەو خەرج کردنە بێ شوومارەی لە کاروباری سەربازی ئەوەی کەلەماوەی ١٩٢٨ — ١٩٣٣ , گەیشتە ٤١,٨ ٪ لەکۆی گشتی بودجەی ئەم ساڵانە [٣] .

لەدوای دەرچوونی یاسای سەربازی زۆرەملێی و گرتنەوەی هەموو ئەوگەنجانەی بیست و یەك ساڵیان تەواو کردبوو لەهەموو وڵاتدا ژمارەی سەربازانی سوپای ئێرانی زیاتر بوو , ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٢٦ لە پێنج یەکەی سەربازی زیاتر تێپەری نەدەکرد و لەساڵی ١٩٤١ گەیشتە هەژدە یەکەی سەربازی سەدو بیست حەوت هەزار کەس . هێزی ئاسمانی و کەتیبەیەکی میکانیکییان خرایە سەر کە لە سەد کەس پێك هاتبوو لە گەڵ هێزی دەریایی کە لە ژمارەیەك کەشتی لە کەنداوی عەرەبی پێك هاتبوو [٤] .

بۆ گەشەپێکردنی توانستی سوپاکەی رەزاشا ناچاربوو پشت ببەستێ بە شارەزا بێگانەکان بۆ کارکردن لە رێزە جیاوازەکانی سوپاو ئەفسەرە لێهاتوەکانی سوپای ناردە قوتابخانە سەربازییە ئەوروپییەکان و بەتایبەتی فەرەنسییەکان بۆ ئەوەی شارەزایی بەدەست بهێنن [٥] . سەرەرای گرنگی دانی بە پیشەسازی

سەربازی بۆ فەراهەم کردنی پارچەو تەقەمەنی بۆ چەکەکانی سوپاکەی بە پشت بەستن بە شارەزایی ئەڵمانی لەدوای ئەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەڵمانیا پتەو بوو ئەمەش دوای ئەوەی هیتلەر گەیشتە حوکم لە ئەڵمانیا [٦] .

رەزا شا سوپای بە هەموو ئاست و پلەکانی بەشێوەیەکی راستەخۆ بەکەسی خۆیەوە بەستەوە لە بۆنە گشتییەکاندا بەرگی سەربازی لەبەردەکرد و بەپەرۆش بوو بۆ ئەوەی کە بەخۆی کەرتە سەربازییەکان بپشکنێ و لە کاتی پشت گوێ خستنی ئەرکەکانیان خۆی لە گەورە ئەفسەرەکانی دەپێچییەوە , و کورەکەی و جێ نشینی محەمەد رەزای کردە پشکنێنەرێکی گشتی لە سوپا لەدوای ئەوەی کە ناردبوویە کۆلێجی سەربازی [٧] . رەزاشا سوپای لە چارەسەرکردنی پەشێوییە ناوەخۆکان بەکارهێنا ئەوە بوو چەندین هەڵکوتانە سەری ئاراستە کرد کەخۆی سەرکردایەتی بەشێکیانی کرد دژی هۆزەکان و دژی هەرجووڵانەوەیەک کە ئامانجی رژێمی هەبووایە [٨] . لەگەڵ هەموو ئەو گرنگی پێدانە فراوانەی رەزا شا بە سوپای دا کەچی سوپایەکەی لەکاتی هاتنەناوەوەی هێزە بیانییەکان بۆ ئێران لەشەری دووەمی جیهانی هیچ شتێکی نەکرد کە ببێتە هەڵوێستێکی شکۆدار [٩] .

لەیەکەمین رووبەروونەوەی لەگەڵ هێزەکانی هاوپەیمانان هێزەکانی ئێرانی بەبێ هەر بەرەنگاری کردنێك کەباسی لێوە بکرێ و بەهۆی جۆر بەجۆرەوە داتەپی [١٠] . شتێکی سروشتی بوو کەگرنگی دانی پتر بووی رەزا شا بەسوپا کاریگەری جیاواز جیاواز بە سەرسەلاحیەتەکانی بەجێ بهێڵێ کە ئەویش لەهەندێ رووەوە و لەبەرهەمان هۆ کۆسپی هاتەرێ .

پیشەسازی دوای سوپا پلەی دووەمی لە گرنگی پێدانی شا داگیرکردبوو, و بەیەکێك لە ئامرازە گرنگەکانی دانابوو بۆ بەدیهێنانی سەربەخۆیی وڵات لە رووی

ئـابووری و سیاسـییەوە بۆیـە حکومـەتی ئێرانـی لـەژێر سەرپەرشـتی خـودی شاکۆششی گەورەو خێرایی لە هەمان کاتدا نواند بـۆ مـسۆگەرکردنی بـەدیهێنانی ئـەم مەبەسـتە [١١] . ئەمـەش لـە رێگـای دامەزرانـدنی ژمارەیـەك لـە پیـشەسازییەسووکەکان و ئـەوەی کـە شـا بـەپارەی تایبـەتی خـۆی بەشـداری لەبەشێکیاندا کرد [١٢] . بو دامەزراندنی پیشەسازی لە ئێران کاتێك کـە وتـی : ( دەمانەوێ ئەم خولە پەرلەمانییە بزانێ لە سـاڵی ( ١٩٣٠ ) ەوە و لـە هەشـتەمین دانیشتنی کردنـەوەی ئەنجوومـەن ئاراسـتەکردنی راسـتەقینە لـە مێـژووی وڵاتـدا دەسـتی پێکـرد بـەناوی خـولی ئـابووری پەرلـەمانی [١٣]. لـە ئـەنجامی ئەمـەش حکومـەت هـانی سـەرمایەی نیـشتمانی دا بۆچـوونە نـاو پیـشەسازی لـە رێگـای پاراستنی پیشەسازییە نیشتمانییەکان و بەشداری کردن بـە شـێوەیەکی بـە هێـز تیایدا [١٤] لە ئەنجامی ئەمەش سی کارگەی حکومی و دووسـەد کارگـەی بـچووك سەریان هەڵدا کە کەرتی تایبەتی بەشدارییان تیادا کرد و حکومەت بەردەوام بوو لە هاندنی پیشەسازی و کارگەی نـوێ ی رسـتن و چـنین و شـەکر چیمەنتۆ و لـە قووتـووکردنی میـوە و پیـشەسازی کاغـەز و مـەی و کارگـەی رۆنـی رووەکـی و بەرهەم هێنانی جگەرە سەریان هەڵدا [١٥]. لـە گـەڵ ئـەوەش پیـشەسازی لـە زۆر قۆناغەکانیـدا کۆسـپی هاتـە پـێش بـەهۆی کـەمی سـەرمایە و کـەمی شـارەزایی هونـەری و پـشت بەسـتن بـە کـادری بێگانـەی پـسپۆر لـە زۆربـەی پیـشەسازییە گرنگەکان .

هەرچی لە لایەنی کشتوکاڵییە ئەوە سەرەرای ئەوەی کە کـشتوکاڵ بربـرەی پـشتی ئابووری ئێرانی پێك دەهێنێت کەچی گرنگی پێدانی بەپلـەی دووەم دەهـات لەگـەڵ ئەوەش چەندین رێوشوێن گرترایە بەر بۆ چاککردنی باردۆخی جوتیار و چـاککردنی بەرهـەمی زەوی و هـەوڵ درا کـە ئـامێری کـشتوکاڵی سـوودی لـێ وەربگـیرێ و

حکومــەت دەســتی کــرد بــە دابــەش کردنــی زۆربــەی ئــەو رووبــەرە زەوییانــەی کەبەبەیاری جێ هێڵدرابوو کەچی نـەبوونی سـەرمایەی پێویـست لـەلای جوتیـاری ئێرانی بۆ گەشە پێکردنی کشتوکاڵ رێگای خۆش کرد بۆ ئەوەی خاوەن موڵکـەکان بۆ دەست بەسەر داگـرتنی زەوییـە کـشتوکاڵییەکان ئەمـەش لەبەرئـەوەی ئـامرازە پێویـستیەکانیان هــەبوو بــۆ کرینیــان ئەمــەش رەنگدانــەوەی بەســەر بــارودۆخی جوتیارەوە هەبوو ئەوەی کە بەشێوەیەکی گشتی بارودۆخی خراپ بوو بەشێوەیەك کە نەیتوانی زیاتر لە ١/٤ بەرهەمی بەدەست بهێنێت و ئەوەی تر دەچـووە گیرفـانی خاوەن موڵکەکان و پشکەکانی باجەکان و حکومـەت کـە دەخرانـە سـەر جوتیـاران [١٦]. هــەروەها رەزاشــا گرنگــی دا بــە دووبــارە رێکخــستنەوەی دارایــی دەوڵــەت بــۆ فەراهــەم کردنــی پــارەی پێویــست بــۆ پــرۆژە گــشتییەکانی و پــشتی بەســت بەشارەزایانی بێگانە و بەشێك لەوانـە رێـك خـستنێکی بـاش و داهـاتی باشـیان بـۆ ئێران دابین کرد[١٧] . چـەند رێوشـوێنێکی تریـشی گرتەبـەر ئـەوەبوو شـا لەسـاڵی ١٩٢٦ بریـاری دا ئێرانییــەکان واز لــە جـل و بەرگــە رۆژهەلاتییەکۆنــەکان بهێـنن و سەرپۆشی لابردو سەرکۆتی سەپاند[١٨] . یاسای کاروبـاری کەسـیەتی دەرکـرد کـە لەیاســای فەرەنــسی گواســترابووەوە ئینجــا ســاڵی ١٩٢٩ یاســای جـل و بــەرگی یـەکگرتووی دەرکـرد و خێزانەکـەی یەکـەم کـەس بـوو کـە بەسـەر کـۆتی دەرچـوو لەچاوپێکەوتنەکانیدا لەگەڵ خێزانی دبلۆماسییە بێگانەکاندا[١٩]. بۆ یەکـەمین جـار لە ساڵی ١٩٣٧ تاران رووناکرایەوە و لەساڵی ١٩٣٩ یەکەم ئێزگەی ئێرانی بەناوی ئێزگەی تاران لە ئێراندا کرایەوە[٢٠] . هەرچی لە بـواری خوێندنـە ئـەوە حکومـەت کۆششی کـرد بـۆ بڵاوکردنـەوەی خوێنـدن بەقۆناغـە جـۆر بـەجۆرەکانی سـەرتۆپی کارەکانیشی لەم بوارەدا کردنەوەی زانکۆی تاران بوو لە سـاڵی ١٩٣٥ و ژمارەیـەك قوتابی ناردە زانکۆ بێگانـەکان بـۆ پـسپۆری وەرگـرتن لـەبوارە جۆربـەجۆرەکان و

گەرانەوە بۆ وانە گوتنەوە لە زانکۆی تاران و لەنێوان سالآنی ١٩٢٥ — ١٩٤١ رێژەی خوێندەواران دوازدەجار پتربوو و ژمارەی قوتابخانەکان گەیشتە (٢٣٣٠) قوتابخانە و یازدە کۆلیج لە زانکۆی تاران کە (٢٣٠٠) قوتابی تیایدا دەیانخوێند و رۆشنبیران بوونە توێژێکی کۆمەلآیەتی کە قورسایی خۆیان هەبوو لە دوای ئەوەی کە لەپێشتردا کەمایەتی بوون[٢١].

چاکسازییەکانی رەزاشا لایەنی جۆر بەجۆری لە ژیانی ئێران گرتوە و جۆش و خرۆش بەرەو چاکسازی کردن بووە مایەی نەگونجان لە نێوان توانای ولآتەکەی و قەبارەی پرۆژە جۆر بەجۆرەکانی کەمی لە شارەزایی هونەری تەکنیکی و ئیداری و کەمی پارە رەنگدانەوەی بەسەر ئابووری ولآتەوە هەبوو و بووە مایەی تەنگژەیەکی ئابووری توند پالّی بە حکومەت نا بۆ ئەوەی مولّکداریەتی زیاتر بکات و دەست بەسەر ئابووریدا بگرێ[٢٢] . بووە خاوەنی گرنگترین و گەورەترین دام و دەزگا پیشەسازییەکانی ولآت بەمەبەستی پرکردنەوەی کەم و کورتی لە شارەزایی هونەری و ئیداری و شا پەنای بردە بە راهێنانی لەدەرەوە بەمەش بواری کردەوە لەبەردەم دەستێوەردانی زیاتری بێگانە لە کارو باری ولآتدا[٢٣] .

لەلایەکی تریشەوە چاکسازییەکانی رەزاشا بووە مایەی وروژاندنی نێوەندی زۆر لەسەر ئاستی بارودۆخی ناوخۆ ئەوەبوو خاوەنداره بچووکەکانی زەوی و بازرگانەکان و هەندێ لە دەولّەمەندەکان لەوانەی بەهۆی چاکسازییەکانەوە بەرژەوندییەکانیان زیانی پێ گەیشت , دژایەتیان کرد , لە کاتێکدا رۆشنبیران و خاوەن داهاتە سنووردارەکان لەگەلّ چاکسازییەکاندا بوون[٢٤] .

هەروەها ئارەزووی هەنگاو نان بەرەو دیموکراتییەت لە دەولّەتێکدا کە پیاوانی بەرۆلّێکی گرنگ هەلّدەستن لە ژیانی کۆمەلآیەتیدا پالّی بە چەندین توێژی فراوانی کۆمەلّگانا کە دژی زۆربەی چاکسازییەکان بوەستن[٢٥] .

پیاوانی ئاینی

موسڵمانان دەوروبەری ٩٨ ٪ ی دانیشتوانی ئێران پێك دەهێنن و زۆربەشیان لەسەر ئاینزای شیعەن[٢٦] لەسەدەی شازدەوە و لەوکاتەوە کە سەفەوییەکان ئەم ئاینزایەیان کردە فەرمی لە دەستوری ئێرانی پیاوانی ئاینی دەستیان بەوە کرد کە رۆڵێکی کاراو کاریگەر لە ژیانی ئێرانی بگێرن و دەست رۆیشتوویی ئەم مەلایانە پتر بوو و هەروەها کەلێنی نێوان گەلانی ئێرانی و فەرمانرەوا زۆر دارەکانیان فراوانتر بوو بەهۆی ئەو دواکەوتنەی بە درێژایی چوار سەدە دەوری ئێرانی دا بوو ئەوە گەلانی ئێران هیچ بوارێکی تریان نەدۆزیەوە بێجگە لەکۆبوونەوە لە دەورو بەری ئەو پیاوە ئاینیانەی کە زانیان چۆن برسیەکانی ئێران بۆ بەرژەوەندی خۆیان بهاژۆن[٢٧] . بە تێپەربوونی کات پیاوانی ئاینی بوونە توێژێکی دەست رۆیشتوو لە ولاتدا لە هەردوو ئاستی کۆمەلایەتی و سیاسی بە تایبەتی کە داهاتەکانی زەکات و پارەی وەقف کە هەموو موسڵمانەکان لە ئێران دەیاندا , دەچووە گیرفانی تایبەتیانەوە بەرۆیشتن لە دوای بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان ئەوە پیاوانی ئاینی هەڵوێستی ناجێگیریان هەبوو بەرامبەر بە رووداوە ئێرانییە گرنگەکان بۆ نموونە هەندێکیان چوونە پاڵ بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم لە کاتێکدا هەندێکی تریان چوونە پاڵ دەسەلات هەندێکی تریشیان لایەنگری لایەنێکی دەرەکی دەست رۆیشتوو بوون لە ولاتدا وەکو ئەوەی لەماوەی شۆرشی دەستووری ئێرانی ١٩٠٥–١٩١١ روویدا [٢٨] .

کاتێك کە رەزاشا چووە سەرتەختی ئێرانی کاری کرد بۆ کەم کردنەوەی دەست رۆیشتووی پیاوانی ئاینی لە ولات ئەوەبوو زۆربەیان دژی چاکسازییەکانی

وەستانەوە بە تایبەتی سەربازی زۆرە ملێی و پرۆژە پیشەسازییەکان و چاکسازییە کشتوکاڵییەکانی پاساوی ئەوەشیان بریتی بوو لە دژایەتی کردنی شەریعەتی ئیسلامی بۆیە ژمارەی کەم کردنەوە لە ئەنجوومەنی دەیەم و پەنابردنە بەر مزگەوتەکان و مەزارگەکانی هەڵوەشاندەوە و خۆپیشاندانەکان و کۆبوونەوەکانی لە بۆنە ئاینییەکانی قەدەغەکرد . لە ساڵی ١٩٣٩ دەستی بەسەر زەوییەکانی ئەوقافدا گرت بەمەش پیاوانی ئاینی لە گرنگترین داهاتی دارایی بێبەش کرد و دەست رۆیشتنی ئاینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و لە وڵاتدا نەهێشت [٢٩] . تەنانەت سەفیری بریتانیاش لە تاران زۆر ئاشارام بوو بەرامبەر بەو رێو شوێنانە کاتێك وتی ( شاهێزی مەلایەکان وردوخاش دەکات ) بەم شێوەیەش پیاوانی ئاینی لە سەردەمی رەزاشادا تەنها رێورەسمی ژن هێنان و تەلاق دان و میراتیان بۆ مایەوە , لە کۆتایی سەردەمەکەی ئەمەشی لێسەندنەوە و دایە دەستی دادگا سڤیلییەکان و وایان لێهات کە مووچەی دیاریکراو لە دەوڵەت وەربگرن [٣٠] .

رەزاشا هەربەوەندە نەوەستا لە پیاوانی ئاینی بداو رۆڵییان لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەست نیشان بکات بەڵکو هەر لە دەسەڵات گرتنە دەستییەوە دەستی کرد بە لێدانێکی بەهێز دژی بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی لە هەوڵێکی تر بۆ لێدانی و دەست نیشان کردنی رۆڵی لە ژیانی ئێرانی.

## بزووتنەوەی نیشتمانی

بارودۆخی دواکەوتن لە رووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی لە کۆتاییەکانی سەردەمی قاجاری پاڵی بەنیشتمانپەروەرە ئێرانییەکان نا بۆجووڵانەوە لە پێناو

گرتنە خۆی بەرپرسیارییەتی رزگارکردنی وڵات لەو بارودۆخە ناخۆشەی کە لەو رۆژانە داپیّ ی تیّ دەپەری ئەوەبوو بزووتنەوەی کارا و بەهێز سەریان هەڵدا و رۆڵی گرنگیان لە سەرکردایەتی کردنی بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی گێرا وەکو بزووتنەوەی جەنگەڵی بە سەرکردایەتی میرزا کوچك خان و راپەرینی ئازاربیجان بە سەرکردایەتی محەمەدخیابانی . هەردووکیان لە دیارترین سەرکردەکانی شۆرشی دەستوری ( ١٩٠٥-١٩١١ ) بوون ,و راپەرینی کوردستان بە سەرکردایەتی سمکۆ و راپەرینی تریش لە عەرەبستان [٣١].

ئەگەری زۆر هەبوو کە بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی دەسەلاّتی قاجاری لەگەڵ خۆی رامالێ ئەگەر ئەودەست تێوەردانەی بێگانە نەبووایە کە باسمان کرد ئەوەبوو گۆران بە پێچەوانەی ئەوەبوو کە چاوەروان دەکرا ئەوەبوو کە رەزاخان سەرکردایەتی کودەتایە ناسراوەکەی کرد و لە ساڵی ١٩٢٥ چووە سەرتەختی ئێران لە ماوەی نێوان ( ١٩٢١ — ١٩٢٥ ) رەزاشا ئەرکی لەناو بردنی بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی گرتە ئەستۆ بۆ ئەوەی لە رێگای خۆی لایبدات , توانی بەهۆی ئەو سوپایەی کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد ئەمە بەدی بهێنێت [٣٢] .

کاتێك کاروباریشی بۆ سەقامگیر بوو , بینی کە توانای پاشماوەی دوژمنەکانی و مونافیسەکانی هەیە یەکسەر بەو کارە هەڵستا ئەوەبوو هێرشی کردە سەر ئەو رەگەزانەش کە لە قۆناغی پێشوتر لە گەڵی بوون لە وانەش پارتە سیاسییەکان بۆ نموونە پشتگیری سۆشیالیستەکانی لە ئەنجوومەن بەدەست هێنابوو بۆ روو بەروو بوونەوەی مودەریس و زاناکان و ئیتر پێویستی پێیان نەبوو , لێیان هەڵگەرایەوە و سلێمان ئەسکەندەری سەرەکی پارتی ناچار کرد کەدەست لەکار بکێشێتەوە و ئینجا لێدانی بە هێزی ئاراستەی پارتی شیوعی ئێرانی کرد [٣٣] .

بە بریارێکی حکومی هەموو ئەو سەندیکا کرێکاریانەی هەڵوەشاندەوە کە لە ئەنجامی سەرهەڵدانی کارگە نوێیەکان لە ئێران دامەزران و لەنێوان ساڵانی ١٩٢٧ – ١٩٣٢ زیاتر لە ( ١٥٠ ) کرێکاری سەندیکای گرت و هی تریانی بۆ ناوچەی دوورە دەست لە وڵات دوور خستەوە . کاتێك کە هێزی بزووتنەوەی کرێکاری لە وڵات بۆ دەرکەوت یاسای کاری ساڵی ١٩٣٨ ی دەرکرد بۆ هەڵمژینی تورە بوون و لەرێی لادانی بزووتنەوەی کرێکاری لەگەڵ زانینی ئەوەی کە یاسای ناوبراو ئەو گیروگرفتە بنەرەتیانەی چارەسەر نەکرد کە کرێکارانی ئێران بە دەستیەوە دەیان ناڵاند [٣٤] . شتێکی سروشتی بوو لە ژێر سێبەری بارودۆخی ئەوهێزەی رەزاشا بەرامبەر بە ئێرانییەکانی بەکارهێنا , سیاسەتەکەی کاردانەوەی تەنانەت بەسەر ئەو ئەنجوومەنە ئێرانییەش هەبێ ئەوەی کە بەتێپەربوونی کات بووە تەنها بوو کە شووشەیەك بە دەستییەوە وە لە رێگای دەست تێوەردانی لە کردەوەی هەڵبژاردنەکان و پێك هاتەی ئەنجوومەن توانی لاینگری ئەنجوومەن بۆخۆی بەدەست بهێنێت هەروەها رێگر دەبێ لەبەردەم سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆنێکی پراکتیکی دژی رژێمی حوکمی و ئەنجوومەنەکە وای لێهات وەکو یەکێك لە مێژوو نووسە بێگانەکان وەسفی کرد (مۆرێکی مەتاتی بوو بە دەستی شاوە [٣٥] .

بۆ ئەوەی رەنگێکی دیموکراتی بە حوکمەکەی بدات فەرمان لە ئەوەوە دەرچوو بۆ کۆمەڵێك لە دارودەستەکانی بە پێك هێنانی پارتێك بە ناوی (ئێران نو) (ئێران نوێ) لەسەر رەوتی پارتی گەلی کۆماری لە تورکیا ئەم پارتەش بووە بەرگری کەرێکی راستەقینە لە رژێم و لاینگرێك بۆ هەموو پلان و بەرنامەکانی شا [٣٦] .

بۆ ئەوەی پارتە سیاسییەکان لە گرنگترین ئامراز بۆ دەربرین لە رایەکانی و نیرەکانی بێ بەش بکات پەنای دەبردە بەرنەهێشتنی رۆژنامەگەری نیشتمانی و

رۆژنامەکانی تریشی کەم کردەوە و تەنها ژمارەیەکی کەمی لێ مایەوە کە بەپەنجەکانی دەست دەژمێردران تەنانەت ئەوەی ماشبووەوە تەنها ئامرازێك بوو بۆ بەرەو دان بە سیاسەتی حکومی [٣٧] .

سەرەرای ئەوەی کەرێوشوێنەکانی رەزاشا توند بوو کەچی بێزاربوون لەو بارودۆخەی لەکاتدا هەبوو پالّی بەژمارەیەك لەو قوتابییە ئێرانییانە نا کە لەزانکۆکانی ئەوروپی خوێندبوویان کۆنگرەیەك لەشاری کولون لە سالّی ١٩٣٠ ببەستن تیایدا داوایان کرد بەندەسیاسییەکان ئازاد بکرێن و رەخنەیان لە رەزاشا و ئەوسیاسەتە سەرکوت کەرانەی گرت کە دژی گەلانی ئێرانی پەیرەوی کرد لە سالآنی ١٩٣٤ و ١٩٣٦ کۆلێجی پزیشکی لە تاران و کۆلێجی مامۆستایان خۆپیشاندانی سەرکەوتوویان رێك خست لە سالّی ١٩٣٧ وەکو نارەزایی دەربرین بەرامبەر بەزیادکردنی کرێ ی خوێندن قوتابیانی کۆلێجی یاسا کۆلێجەکەیان داخست [٣٨]. نارەزایی تەنها لە ریزەکانی بزووتنەوەی نیشتمانی ئێرانی و بەشە جیاوەزەکانی دیار نەبوو بەڵکو نەتەوە نافارسەکانیشی گرتەوە ئەوانەی تفت و تاڵییەکی زۆریان لە سیاسەتی فارسییانەی رەزاشا چەشت .

پەراوێزەکان:

١- طلال مجذوب / المصدر السابق / ص ٣٠٠ .

٢ – ( مذكرات شاه ايران المخلوع ) ص ٢٢ .

٣ – فوزية صابر محمد / ايران بين الحربين العالميتين / تطور السياسة الداخلية ١٩١٨ – ١٩٣٩ رسالة ماجستير غير منشورة / البصرة / ١٩٨٦ / ص ٢٩٩ .

٤ – سليم واكيم / المصدر السابق , ص ١٢٧ .

٥ – فوزية صابر محمد / المصدر السابق / ص ٣٠٠ / احمد عبدالقادر الجمال / المصدر السابق / ص ٥٤٩ .

٦ – j Marlow , Iran A short political Cuide , London , ١٩٦٣ . p ٦٠

٧ – محمد كامل عبدالرحمن /

الاوضاع العامة في ايران عشية سقوط رضا شاه بهلوي ( دراسات ايرانية ) ( مجلة ) المجلد الاول / ١٩٨٧ / مركز دراسات الايرانيه / البصره / ١٩٨٧ / ص ١١٥ .

٨ – Abrahmian , O . P . Cit , P . ١٣٣ .

٩ – دونالد ولبر / ايران ماضيها و حاضرها / ترجمة عبدالمنعم محمد حسين / القاهرة / ١٩٥٨ ص ١١٧

١٠ – د . موسى الموسوي / ايران في ربع قرن / بيروت / بلا / ص ٥٥ , محمد وصفي ابو مغلي / ايران دراسة عامة / ص ٢٩٤ .

١١ – محمد كامل عبدالرحمن / الاوضاع عامة في ايران / ص ١١٧ – ١١٩.

١٢ – R . K . Ramazani , O . P .Cit , P . ٢٢٥ .

١٣ – جورج لنشوفسكي / المصدر السابق / ٢٣٧ – ٢٣٨ .

١٤ – دونالد ولبر / المصدر السابق / ص ١٤٩ .

١٥ – فوزية صابر محمد / المصدر السابق / ص ٢٣٩ .

١٦ – المصدر نفسه / ص ٢٣٩ – ٢٤٢ .

١٧ – المصدر نفسه / ص ٢٣٠ – ٢٣٧ / احمد عبدالقادر الجمال / المصدر السابق / ص ٥٥١ .

١٨ – جورج لنشوفسكي / المصدر السابق / ص ٢٣٥ .
١٩ – ( مذكرات شاه تيران المخلوع ) ص ٢٥ .
٢٠ – طلال مجذوب / المصدر السابق / ص ٣٠٢ .
٢١ – احمد عبدالقادر الجمال / المصدر السابق / ص ٢٣٦ .
٢٢ – E . Arahmian , OP .Cit , pp . ١٤٢ – ١٤٣ .
٢٣ – طلال مجذوب / المصدرالسابق / ص ٣٠٣ .
٢٤ – احمد عبدالقادر الحمال / المصدر السابق / ص ٥٥٤ .
٢٥ – دونالد ولبر / المصدر السابق / ص ٢٤٧ – ٢٤٨ .
٢٦ –جورج لنوفسكي / المصدر السابق / ص ٢٣٦ / جورج كيرك / موجز تاريخ الشرق الاوسط ترجمة عمرالاسكندري / القاهرة / ١٩٥٧ / ص ٣٩٩ .
٢٧ – محمد عبدالغني السعودي / ايران دراسة في جذور الصراع / بلا / ص ١١ و ٣١ .
٢٨ – فوزية صابر محمد / المصدر السابق / ص ٢٣٨ / مهربات فرهمند / الثورة المسروقة في ايران ترجمة \ مركز البعثون و المعلومات / ١٩٨٤ / ص ١٨ .
٢٩ – نيكي – ار – كيدي / الثورة الايرانية والجمهورية الاسلامية / مجموعة بعوث و دراسات قدمت ال معهد
الشرق الوسط المركز الدولي ( ويلسون ) للمفكرين في واشنطن عام ١٩٨٢ ترجمة مركز البعوث /بغداد
١٩٨٢ / ص ٢٣ .
٣٠ – Abrahmian , Op . Cit . pp .١٣٥ .
٣١ – E . A brahmian , Op , Cit , p . ١٣٦ .
٣٢ – فوزية صابر محمد / المصر السابق / ص ٢٨٥ .
٣٣ – د . كمال مظهر احمد / المصدر السابق / ص ٢٥١ د . مصطفى عبدالقادر النجار / التاريخ السياسي
عربستان العربية ١٨٩٧ – ١٩٢٥ / القاهرة / ١٩٧٠ / همايون كاتوزيان / الاتجات الوطنية في ايران
١٩٢١ – ١٩٢٦ / ترجمة هاشم كاتع لازم ( الخليج العربي ) ( مجلة ) البصرة / العدد الاول : ١٩٨٤ /

٥٩ – ٦٠ / ابراهيم الدسوقي / الثورة الايرانية / المجذور الايدلوجية / بيروت / ١٩٧٩ / ص ٥٣ – ٥٤ .

٣٤ فوزية صابر محمد / المصدر السابق / ص ٢٣٤ .

٣٥ – حربي محمد / تطور الحركة في ايران ١٨٩٠ – ١٩٥٣ / بغداد / ١٩٧٢ / ص ٣٨ – ٣٩.

٣٦ – E . Abrahmian , op . Cit . p . ١٣٨ .

E . Abrahmian , op . Cit . p . ١٣٩

٣٧ – جورج لنشوفسكي / المصدر السابق / ص ٢٣٨ .

.٣٨ – E . Abrahmian . op . Cit . p . ١٣٨

# رۆڵی بەریتانیا لە کێشەی مووسڵ

گیڤارا قادر

سەرەتای گرنگیدانی بەریتانیا بە ئێراق
گەلی کورد یەکێکە لەو گەلە ستەمدیدانە کەهەمیشە لەلایەن گەلانی بالادەستەوە چەوسێنراوەتەوەو غەدری لێکراوە، گەلی کورد لەباشووری کوردستان هەر لەسەرەتاو لەژێر دەستی هەموو حکوومەتە یەک لەدوای یەکەکانی ئێراقدا مافی خوراوە، خاکەکەی داگیرکراوە، بە عەرەب کراوەو هەوڵدراوە زمان و کەلتوورو فەرهەنگی رەسەنی خۆی لەبیر بکات.
ئەم کێشەیە لەسەردەمی خۆیدا کێشەیەکی جێی بایەخ بووە، نەک تەنها حکوومەتی ئێراق بەڵکو ولاتانی دیکەش دەستیان هەبووە لەنانەوەی ئەم کێشەیە وەکو تورکیاو ئەڵمانیاو بەریتانیاش کە ئەو سەردەمە ئێراق ئینتیدابی بەریتانیا بووە. هەریەکەیان بەگوێرەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان هەوڵی چارەسەری کێشەکەیان داوە، بەلام لەکۆتاییدا کێشەکە تەنها بە زەرەری کورد تەواو بووە. لەگەڵ ئەوەشدا کە بەپێی سەرژمێرییەکانی ئەوکاتە کورد زۆرینەی دانیشتوانی دەڤەرەکەی پێکدەهێنا.
هەر لەسالانی زووەوە بەریتانیەکان چاوی داگیرکاریان بڕیوەتە ئێراق و ویستویانە ئەم زەویە بەپیت و ناوچە ستراتیژیە بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوەو سودی لێ وەربگرن وەکو رێگایەکی هاتووچۆو ناوچەیەک بێت بۆ وەدەست خستنی کەرەستەی خاوو بازاڕێک بێت بۆ ساغ کردنەوەی بەرهەمەکانیان. هەر بۆیەش بەریتانیا لەم کێشەیەدا دەوریی سەرەکی بینیووە.
ئێراق وەکو دەوڵەتێک کاتێک دەرکەوت لەسەر شانۆی سیاسی نێودەوڵەتی

که جەنگی جیهانی یەکەم کۆتایی پێهات، بەڵام پێش ئەم مێژووە ئێراق بریتی بوو لە هەندێ ناوچەی دواکەوتوو کەوا لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی دابوو، دابەش کرابوو بۆ ویلایەت ئەوانیش مووسڵ، بەغدا، بەسرە، ئێراق چوار سەدە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا مایەوەو لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم ئێراق بووە مایەی گرنگیپێدانی داگیرکاری ئەوروپی. بەتایبەتی لەبوارەکانی بازرگانی و رێگەی هاتووچۆ لەکۆتاییەکانی هەمان سەدە بەریتانیا توانی لەهەموو رکابەرەکانی دەوڵەتانی ئەوروپی بباتەوە بەوەی کەوا بەرژەوەندییەکانی بپارێزێت لە ئێراقدا چونکە ئێراق باشترین هێڵی بەرگری بوو بۆ پاراستنی داگیرگەی هیندستان.

بەریتانیا بەهۆی تێڕوانینی بۆ شوێنی ستراتیژی ئێراق سەبارەت بەناوچەکانی کەنداوی عەرەب و هیندستان، هەروەها لەبەر بایەخی بازرگانی و ئابووری پێشنیاری پرۆژەی هێڵی ئاسنیی فوراتی کرد و هەروەها شەریکەی لینجی ئینگلیزی کاری دەکرد لە شەتولعەرەبو رووباری دیجلە، بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا بەشێوەیەک بوو کەوا بەشی باشووری ئێراق لەسەردەمی کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بووە، ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا بەشێوەیەک کەوا بەشی زۆری کەنداوی عەرەبی گرتەوە.

ئەوەی کەوا روون و ئاشکرابوو لەپێش جەنگی جیهانی یەکەمەوە ئێراق بوو بەیەکێک لە ناوچە گرنگەکانی دەسەڵاتی بەریتانی، بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا زیاتر قوڵ دەبووەوە، کە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانی دابوو، ئەمەش لەبەر گرنگییە ئابوورییەکەی ئێراق، بەهۆی بوونی کێڵگە نەوتییەکانی ویلایەتی مووسڵ و بەسرەو هەروەها گونجاوی و بەپیتی خاکی ئێراق بۆ کشتوکاڵ.

بەریتانیا هەڵمەتێکی دەست پێکرد بەسەرکردایەتی ژەنەڕاڵ دیلامین بۆ داگیرکردنی بەسرە، ئەم هەڵمەتە شاری فاوی گرتەوەو لە ساڵی١٩٢٤ بە ئاسانی توانیان دەستی بەسەردابگرن، دواتر تورکەکان و ئینگلیزەکان لە

چەند شەڕێکدا بەگژیەکدا چوون کە ئینگلیز توانی تێکیان بشکێنێت و شاری بەسرە داگیربکات.

لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ١٩١٤ دواتر هێزەکانی بەریتانیا توانیان دەست بەسەر باشووری ئێراقدا بگرن وەکو شارەکانی شعیبەو عەممارە و ناسریەو قرنە دواتر هێزەکە بەرەو باشوور کشان وشاری بەغدادیان لە ١١ی ئازاری ١٩١٧ داگیرکرد. لەم شەڕەدا عوسمانیەکان هیچ بەرگرییەکیان نەکردو شارەکەیان چۆڵ کرد. دواتر بەرەو شاری مووسڵ کەوتنەڕێ بەسەرکردایەتی ژەنەراڵ ولیەم مارشاڵ کە دوای مردنی ژەنەراڵ مۆد جێگەی گرتەوە، توانیان لە ٧ی تشرینی دووەمی١٩١٨ شاری مووسڵ داگیر بکەن، سەرەڕای نارەزایی سەرکردەی عوسمانی عەلی ئیحسان پاشا کە پێی وابوو داگیرکردنەکە پێچەوانەی مەرجەکانی ئاگربەستی مۆدرێسە.

ناساندنی کێشەی مووسڵ

کێشەی مووسڵ یەکەم کێشەی نێودەوڵەتی ترسناک بوو، کەوا لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست سەری هەڵدا لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەکەم کە چەندین دژایەتی لەنێوان دەوڵەتە ئیستعمارییەکان بێ چارەسەر بەجێ هێشت. ئەم کێشەیە لەنێوان دەوڵەتێکی داگیرکاری بەهێزی ئەو سەردەم کە بەریتانیا بوو لەگەڵ کۆماری تورکیاو گەلی ئێراق بەعەرەب و کوردو ئاشوورییەوە رویدا، دەوڵەمەندی ناوچەکانی ویلایەتی مووسڵ وایکرد کە بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ ببێتە مایەی چاوتێبڕینی ویلایەتە یەکگرتووەکان و فەرەنسا، شوێنی هەڵکەوتنی جوگرافی ویلایەتی مووسڵ کاری لە بەرژەوەندی ولاتانی دەوروبەری تورکیاو ئێراق کردبوو لەوانەش یەکێتی سۆڤیەت و ئێران.

هەروەها نەوت یەکێک بوو لە گرنگترین ئەو هۆکارانەی کەوا کاری لە گەشەسەندنی کێشەی مووسڵ کرد، ویلایەتی مووسڵ بەنسبەت ئێراق وەکو کێشەی ژیان و مردن بوو، هەر ئەو هۆکارەش بوو بەهۆی ئەوەی کەوا

وڵاتانی وەکو تورکیا و بەریتانیا و فەرەنسا و ویلایەتە یەکگرتووەکان هەڵویستیان لەبەرامبەر کێشەکە هەبێت. بەریتانیا ریگەی شەڕی نەگرتە بەر بۆ یەکلابوونەوەی کێشەکە، چونکە بەریگەی ئاشتیانە خەرجیەکی کەمتری دەویست، لەلایەکی دیکەوە بەریتانیا دەیویست کەوا کێشەی مووسڵ بە چارەسەر نەکراوی بمێنیتەوە لە ئێراقدا، بۆ ئەوەی وەکو کارتی فشار بەکاری بهێنێت و نەوت لە ئێراقدا بەدەست بێنێت، لەلایەکی دیکەوە بەریتانیا هەوڵی ئاشتبوونەوەی دەدا لەگەڵ تورکیا، بۆ ئەوەی دووری بخاتەوە لە یەکێتی سۆڤیەت، تورکیا داوای ئیمتیازی نەوتی کرد بەڵام بەریتانیا قبووڵی نەکرد، چونکە ئەو کات ئێراق لە ژێر ئینتیدابی بەریتانی بوو. بە ئاسانی دەیتوانی بڕیاربدات و هەڵسوکەوت بکات لە ئێراقدا.

هەریەک لە بەریتانیا و فەرەنسا و رووسیا، بەپێی ریککەوتنامەی سایکس بیکۆی ساڵی ١٩١٦ ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەلاتیان بوو دابەشیانکرد. فەرەنسا لەویلایەتی مووسڵ تاکو هەولێری بەرکەوت، ئەوەی مایەوە لە کەرکووک و سلێمانی کەوتە دەست بەریتانیا، رووسیاش بەشەکانی باکووری ویلایەتەکەی بەرکەوت، ئەو ناوچانەی کەوا باسیان کرا ویلایەتی مووسڵیان پێکدەهێنا، دواتر بەریتانیەکان دەستیان بەسەر هەموو ناوچەکەدا گرت، بووە هۆی وروژاندنی کێشەکە، کێشەی مووسڵ سەرەتا لەنێوان بەریتانیا، فەرەنسا دا ڕوویدا، چونکە بەپێی ریککەوتننامەی سایکس بیکۆی ساڵی ١٩١٦ ویلایەتی مووسڵ بەشێک بوو لەدەسەلاتی فەرەنسا، بەلام ناوچەکانی دیکەی کوردستان بەشێکی ژێر دەستی بەریتانیا بوون، دواتر لە ساڵی ١٩٢٠ گۆڕانکاریە سیاسییەکان هاتنە پێشەوە، ریککەوتنێک لەنێوان فەرەنسا و تورکیا هاتەکایەوە کە بە »اتفاقیە الفرنسیە-الترکیە« دوژمنایەتی فەرەنسا و تورکیا لەمەوە کۆتایی پێهات، سوپای فەرەنساش لەناوچەی کیتای کشایەوە، هەروەها کێشەی ناوچەکانی رۆژهەلات کۆتایی هات، تەنها کێشەی ویلایەتی مووسڵ نەبێت، لەساڵی ١٩١٨ بەریتانیا بڕیاری دا ویلایەتی مووسڵ بگرێت، چونکە پێی وابوو ئەگەر ئەمە نەکات هیچی

بەدەست نەهێناوە و ناتوانێت بەرژەوەندییەکانی بپارێزێت.

ململانێی نێوان زلهێزەکان لەسەر ویلایەتی مووسڵ

بەپێی ئاگربەستی مودریس لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ کە یەکێک لە بەندەکانی باس لەوە دەکات کەوا هەر شارێک یان ناوچەیەک ئەگەر بەنسبەت هاوپەیمانان گرنگ بێت، ئەگەر بەشەڕیش نەگیرابێت دەتوانن دەستی بەسەردا بگرن، مووسڵ یەکێک بوو لەو شارانەی کە لەلایەن بەریتانیاوە دەستی بەسەرداگیرا.

لەرۆژهەلاتی نزیک و ناوەڕاستدا بەربەرەکانێ و دووبەرەکایەتی لەنێوان دەوڵەتە زلهێزەکان دەستی پێکردبوو بەتایبەتی بەریتانیا، فەرەنسا، ئەڵمانیاو رووسیا، کوردستانیش وەک بەشێکی دەوڵەمەند و لەڕووی ستراتیژیەوە گرنگی ئەم ناوچەیە لە پیلانەکانی چ پێش شەڕو چ ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا شوێنی تایبەتی هەبووە، لە پێش شەڕی یەکەمی جیهانی بەماوەیەکی زۆر بەریتانیاو رووسیاو فەرەنسا و ئەڵمانیا بە هەموو شێوەیەک هەوڵیان دەدا جێ پێی خۆیان لەم ناوچەیەدا قایم بکەن و دەست بەسەر سامانەکانیدا بگرن، بازاڕی بە بازاڕەکانی خۆیانەوە ببەستنەوە یەکێک لە هۆیە نهێنییە گەورەکانی ئەمەش نەوت بوو.

دوای کۆتایی هاتنی جەنگ گفتوگۆ لەنێوان هەردوو لایەنی فەرەنسی و بەریتانی هاتەکایەوە لەسەررێککەوتنامەی سایکس بیکۆ، کلیمنهۆ گەیشتە لەندەن و لەگەڵ لوید جۆرج دانوستاندنیان ئەنجامدا، تانەی لە رێککەوتننامەکەدا دەدا، بەبیانووی ئەوەی کەوا لایەنی رووسی لەرێککەوتننامەکە بەبێ بەشداری رووسیاش، دوای ئەوەی کەوا لوید جۆرج بینی کلیمنهۆ سورە لەسەر رەئیەکەی خۆی باسی ئەوەی هێنایە گۆڕێ کەوا ویلایەتی مووسڵ و فەلەستین بەشێک بن لە دەسەلاتی بەریتانیاو لە بەرامبەریشدا بەشێکی زۆری نەوتی ویلایەتی مووسڵ بەر فەرەنسا بکەوێت لە ١٥ی شوباتی ١٩١٩ رووسیا لە یاداشتێکی کە بۆ حکومەتی بەریتانیای

نارد ئەمەی قەبووڵ کرد. لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢ لە کۆنگرەی لۆزان لۆردکرزن وەزیری دەرەوەی بەریتانیا و عیسمەت پاشا سەرۆکی شاندی تورکی بەشداربوون تیایدا باس لە کێشەی مووسڵ کرا.

هەردوولا خۆیان خستەڕوو، چەندین هۆکاریان خستەڕوو کە ئەوانیش بەڵگەی سیاسی و ئابووری و مێژوویی و جوگرافی و نەژادی و عەسکەری بوون، کە لەلایەن کرزن و عیسمەت ئینەنۆ خوێنرانەوە، بڕیاردرا کێشەکە بخرێتەبەردەم کۆمەڵەی گەلان و ئەوانیش بەمە رازی بوون، شاندی تورکی لە ١٧ی شوباتی ١٩٢٣ گەڕایەوە تورکیا.

ئەو بەڵگانەی کە لایەنی بەریتانی و تورکی هێنایانەوە ئەمانەن:

١- پوختەی بەڵگەی جوگرافی: لیژنەکە پێی وابوو کێشەکە لەسەر دیاری کردنی هێڵی سنووریی نەبوو، بەڵکو بۆ دیاری کردنی چارەنووسی ناوچەیەکی گەورەو ژمارەیەکی زۆری دانیشتووان بوو. هێڵی برۆکسڵ گونجاو بوو بۆ دیاریکردنی سنوور، بەڵام ئەو هێڵەی کە حکوومەتی تورکیا داوای دەکرد باشووری ویلایەتی مووسڵ باشترە لەبەشی رۆژئاوا، بەڵام لەلای رۆژهەڵاتەوە باش نەبوو، لەناوخۆی ویلایەتە کە دەکرێت دیجلەو زێی گەورەو زێی بچووک و دیالە وەکو سنوورێکی جوگرافی بەکاربهێنرێت، بەڵام باشترین هێڵ بۆ دابەشکردنی ویلایەتەکە زێی بچووک بوو.

٢- پوختەی بەڵگەی نەژادی، لیژنەکە پێی وابوو لەویلایەتی مووسڵ کوردو عەرەب و تورک و ئێزدی و مەسیحی و یەهودی نیشتەجێن، بەڵام کوردەکان رێژەی زۆری دانیشتوان پێکدەهێنن، کە ئەمانە لە نەژادی تورک و عەرەب جیاوازن و بەزمانی ئاری قسەدەکەن تورکەکانی ویلایەتی مووسڵ لە هەمان رەگەزی تورکەکانی تورکیان، ئەو کۆمەڵانەی کەوا زۆربەی دانیشتوان پێکدەهێنن کوردو عەرەبن، ئەگەر بەڵگەی نەژادی بەهۆکارێکی یەکلاکەرەوەدا دابنرێت، ئەوا دەبێت کوردەکان دەوڵەتێکی

کوردی سەربەخۆیان هەبێت.

٣- پوختەی بەڵگەی مێژوویی: لیژنەکە پێی وابوو تورکەکان رۆڵێکی باشیان گێڕا سەرەڕای ئەوەی کەوا »عەرەب و فارس و تورک و مەغۆل« فەرمانڕەوایی و سەروەریی مووسڵیان بەشێوەیەکی بەردەوام لەژێر دەستدا نەبووە، بەڵام مووسڵ لەژێر فەرمانڕەوایی سوڵتانەکانی عوسمانیدا بووە بۆ ماوەی چوار سەدە بەڵام ئەو فەرمانڕەواییە بەشێوەیەکی کاریگەرو گشتگیر نەبووە بۆ هەموو ویلایەتەکە، هەر هێڵێکی سنووری زنجیرەی مێژوویی دەپچڕێنێت.

٤- پوختەی بەڵگەی ئابووری: لیژنەکە پێی وابوو لەڕووی تێڕوانینێکی ئابووری تەواوەوە باشترین چارەسەر بۆ ویلایەتی مووسڵ ئەوەیە بە ئێراقەوە بلکێنرێت هەڵەیە ئەگەر بێتو مووسڵ لەناوچەیەک جیا بکرێتەوە کە پەیوەندیەکی ئابووری توندو تۆڵیان هەیە بەیەکەوە، بەڵام ئەگەر زۆر پێویست بوو ئەوا بەربەستێک نییە بۆ جیاکردنەوەی قەزاکانی زاخۆ، ئامێدی و دهۆک بەڵام توانای جیاکردنەوەی کەرکووک و کفری و سلێمانی لە بەغدا زۆر ئەستەمە.

٥- پوختەی بەڵگەی عەسکەری: لیژنەکە پێی وابوو، هێڵی برۆکسل هێڵێکی باشە، ئەو هێڵەی کە حکوومەتی تورکی پێشنیاری کردبوو دەبووە دووبەش:

یەکەم: درێژدەبێتەوە لەبیابانی رۆژئاوای رووباری دیجلە.

دووەم: درێژدەبێتەوە لەنێوان رووباری دیجلەو سنووری ئێران.

٦- پوختەی بەڵگەی رامیاری: لیژنەکە پێی وابوو تورکیا ویلایەتی مووسڵ دەپارێزێت لەبەر ئەوەی دەست بەرداری مافەکانیی نەبووە، لەڕووی سیاسیەوە ئێراق بۆی هەیە سنووری خۆی هەبێت و رێگەی پێ بدرێت بەمانەوەی سیاسی و ئابووری سەرەڕای ئەوەی کە چەندین جار تورکیا ئارەزووی خۆی دەربڕی کەواز لە عەرەبەکان بهێنێت بۆ ئەوەی بڕیاری چارەنووسی خۆیان بدەن، ئێراق پێشکەوتنێکی زۆری بەدەست هێنا لە

سیاسەتی ناوخۆو ئاسایش و خزمەتگوزارییەکانی تەندروستی و پەروەردە بەڵام ئەم پێشکەوتنە زیاتر بە پاڵپشتی بەریتانیا بوو.
لیژنەکە وای بەباش زانی ئینتیدابی بەریتانی بەردەوام بێت لە ئێراق، بەڵام ئەمجارەیان لەشێوەی ڕێککەوتننامەی بەریتانی-ئێراقی بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ بەڵام ئەگەر هاتوو ماوەی ئینتیدابەکەدرێژ نەکرایەوە لە دوای کۆتایی هاتنی ڕێککەوتنامەی ساڵی ١٩٢٢ واباشترە ویلایەتی مووسڵ بدرێتە تورکیا کە بارودۆخەکەی زیاتر جێگیرە لە چاو ئێراق.

پەیوەندی»بەریتانیا ـ تورکیا ـ ئێراق«لەمەڕ کێشەکە
بەپێی برگەی سێیەمی پەیمانی لۆزان کە تایبەتمەندە بە کێشەی»ئێراق ـ تورکیا« تیایدا هاتووە:»دەبێ ئێمە دەستنیشانی سنووری تورکیا ـ ئێراق بکەین لەدانیشتنێکی دووقۆلی دۆستانە لە نێوان تورکیا ـ بەریتانیا، بەلام تێبینی ئەوە دەکەین بۆ ئەوەی ڕێککەوتننامە مۆربکەین لەسەر چۆنییەتی دەستنیشانکردنی سنوور لە ماوەی ٩ مانگدا ئەگەر هاتوو لەو ماوەیەدا نەیانتوانی ڕێککەوتن مۆربکەن، ئەوکاتە دەخرێتە بەردەم کۆمەڵەی گەلان، بەڵام پێویستە لەسەر هەردووڵا ئەو بارە ئارامەی کە هەیە بەرپرس بن لێی و تێکی نەدەن. کێشەی مووسڵ لە نێوان بەریتانیا و تورکیادا بوو ئێراق هیچ کات ڕۆڵی نەبووە لەم کێشەیەدا تا ساڵی ١٩٢٦ هەرچەندە لەو کۆنگرەیەدا دانوستان کرا لە نێوان»بەریتانیا و تورکیا«بەلام»عیسمەت ئینەنۆ«ڕازی نەبوو کەوا ویلایەتی مووسڵ ببێت بە بەشێک لە ئێراق. دانوستانی دووەمی لۆزان لە ٢٣ی نیسانی ١٩٢٣ دەستی پێکرد، هەردووڵا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کەوا ئەو ناکۆکی و دووبەرەکیانەی کە هەیە دەربارەی کێشەی مووسڵ بدرێتە»کۆمەڵەی گەلان«، ئەوەبوو کە لە ماوەیەکی کورتدا لە ٢٤ی تەممووزی ١٩٢٣ تورکیا ڕازی بوو دوای ٩ مانگ کێشەکە بدرێتە»کۆمەڵەی گەلان«. بەریتانیا بڕیاریدا کەوا کۆنگرە ببەستن لە»قوستەنتەنیە«بەتایبەتی دوای ئەوەی کەوا لە ٩/٥/١٩٢٤ بەریتانیا

یاداشتێکی پێشکەشکرد،»برسی کۆکس«سەرۆکی وەفدی بەریتانی بوو لەم کۆنگرەیەدا.

یاداشتەکە بەم شێوەیە بوو:

١ ـ ویلایەتی مووسڵ ببێتە بەشێک لە خاکی ئێراق.

٢ ـ ناوچەی هەکاری بخرێتەسەر خاکی ئێراق، چونکە زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکە ئاشوورین و لە دەسەلاتی تورکی ڕازی نەبوون، لەلایەکی دیکەشەوە»مەلیک فەیسەڵ«ڕازی بوو کە ئۆتۆنۆمییان بداتێ. ئێراق لە ٣٠ی نیسانی ١٩٢٤ بەو پرۆژەیە ڕازی بوو کەوا ئۆتۆنۆمی بداتە ئاشوورییەکان، لێرەدا بەریتانیا مەبەستی ئەوەبوو کەوا حکوومەتێک دروست بکات ببێتە لەمپەر لە بەرامبەر عەرەب و تورک دوای دەستنیشانکردنی سنوور. بەلام گشت کۆنگرەکان بێ بەرهەم بوون، ئەوەبوو لە ١٦ی ئابی ١٩٢٤ بڕیاردرا کێشەی مووسڵ بدرێتە کۆمەڵەی گەلان. ئەمەش دوای ئەوەی لە ١٤ی ئاب، بەریتانیا یاداشتێکی پێشکەش بە کۆمەڵەی گەلان کرد کەوا کێشەی سنووری نێوان»تورکیا و ئێراق«لەگەڵ نەخشە لەسەر بنەمای ڕەگەز دیاری بکرێت. تەنها باس لە کێشەی مووسڵ ناکات، چونکە بەریتانیا دەیزانی ئەگەر بە تەنیا باسی ئەو کێشەیە بکات کەوا ویلایەتی مووسڵ بخرێتە سەر ئێراق، ئەوا ولاتانی وەکو»فەرەنسا و ئیتاڵیا«دەبنە بەربەست. دوای ئەوەلە ٥ی ئەیلوولی ١٩٢٤ تورکیا یاداشتێکی نارد کە لە ٢٠ کۆپی پێکهاتبوو هەروەها داوایەکیشی پێشکەش کرد کەوا نەخشەیەکیشی لەگەڵ بوو، کە بیسەلمێنێ مووسڵ ناوچەیەکی تورکیایە، تیایدا هاتبوو:

١ ـ لە ویلایەتی مووسڵ عەرەب کەمینەیە.

٢ ـ کوردەکان نایانەوێت لەگەڵ عەرەب بژین.

دوای ئەوە لە ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٢٤ لە کۆمەڵەی گەلان دا دانیشتنێک ئەنجامدرا کەوا»لۆرد پارمۆر«نوێنەری بەریتانیا بوو لەو دانیشتنەدا، هەروەها نوێنەری تورکیاش»فەتحی بەگ«بوو. نوێنەری تورکیا لە کۆمەڵەی گەلان وتی: ویلایەتی مووسڵ بەشێکە لە تورکیا و دەتوانین لە

ڕووی سیاسی و یاساییەوە بیسەلمێنین کە دوای ئاگربەستی»مۆدرێس«لە ٣٠ تشرینی یەکەمی ١٩١٨ ویلایەتی مووسڵ لە ژێردەستی ئێمەدا بووە، کوردەکانیش نایەنەوێ لەگەڵ ئێراق بن و داوای ئۆتۆنۆمی دەکەن لە ئێمە، ئەوەش بەڕوونی دیارە. لە داواکارییەکەی»شێخ عەبدولقادر«بەڵام»پارمۆر«لە وەڵامدا وتی:

١ـ کورد لە ناوچەکەدا ئەگەر دوو ئەوەندەی عەرەبە، بەڵام حەوت ئەوەندەی تورکیشە.

٢ ـ ئێمە بەپێی بەندەکانی»سیڤەر«باسمان لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی کردووە.

٣ـ کوردستانی باشوور لە ساڵی»١٩١٧«دژی ئێوە بوون و داوای دەوڵەتی سەربەخۆیان کردووە»مەبەستیان شێخ مەحمود«بووە.

لیژنەی»کینک کراین«و هەڵوێستیان لەسەر کێشەکە: کۆمەڵەی گەلان لە ٣٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٤ بڕیاریدا کە لیژنەیەک پێک بهێنرێت کە بریتی بوو لەمانەی خوارەوە:

١ ـ»مسیوایف ڤیرسن«کەسایەتییەکی سویدی بوو، کرا بە سەرۆکی لیژنەکە.

٢ ـ»کونت تیلیکی«سەرۆکی مەجەری پێشوو.

٣ ـ»کۆلۆنیل پاولس«ئەفسەرێکی خانەنشینی بەلجیکی بوو.

لیژنەکە لە ١٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٤ پێکهێنرا بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە یاخود زانیاری دەربارەی کێشەکە کۆبکاتەوە، دواتر بڕیاردرا کە بچنە لەندەن لە ٢٥ی تشرینی دووەمی ١٩٢٤، لەوێ لەگەڵ»مستەر دیڤیدسن«دانیشتن کە ئەوکات وەزیری دەرەوەی بەریتانیا و بەرپرسی داگیرگەی هیندی بووە، سەرەتا خۆشحاڵی دەربڕی بەرامبەر ئەو لیژنەیە بەڵام دواتر وتی: دەنگدان لەسەر ئەو کێشەیە، کێشەکە قوڵتر دەکات، مەبەستی ئەوەبوو کە هەڵبژاردن نەکرێت لە ویلایەتی مووسڵ»ڤیرسن«وتی: ئێمە هاتووین ڕاستییەکان کۆبکەینەوە، نەوەک کەس قسەمان بۆ بکات. دوای ئەوەی لیژنەکە بڕیاریدا

کە بچنە تورکیا لە»کانوونی دووەمی ١٩٢٥«گەیشتنە تورکیا لەوێ دوای پێشوازی لێکردنیان نوێنەری تورکیا ئەم داواکارییانەی داواکرد لە لیژنەکە:

١ ـ دەمانەوێ دانیشتوانی ویلایەتی مووسڵ ئازادییان هەبێ.

٢ ـ دەبێ ئارەزووی خەڵکەکە ڕەچاو بکرێت واتە دەنگدان بکرێت.

دواتر بڕیاردرا کەوا ئەو کەسایەتیانە ببنە یارمەتیدەر لەوانە:

ـ جەواد پاشا: پشکنینەری تورکیا بوو.

ـ کامل بەگ: نوێنەری ویلایەتی مووسڵ.

ـ نازم بەگ: نوێنەری کەرکووک

ـ فەتاح بەگ: نوێنەری سلێمانی

دواتر لە ١٦ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥ گەیشتنە بەغدا لەوێ دەستیان کرد بە کۆبوونەوە، ئەوەبوو لە ١٧ی کانوونی دووەم ئەوەیان بەرچاوخست کەوا ویلایەتی مووسڵ لە پەیوەندی ئابووری لەگەڵ بەغدا دایە. ئەوەبوو لە ١٧ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥ مەلیک فەیسەڵ پێشوازی لێکردن و بڕیارێکی خوێندەوە کە تیایدا هاتووە ئاگاداربن ئێمە لەگەڵ بەریتانیا ڕێککەوتووین بۆ بەرهەمهێنانی نەوت، مەبەستی لەو قسە ئەوەبوو کە ئێمە هەمووکات بەرژەوەندی وڵاتان ڕەچاو دەکەین، لەلایەکی دیکەوە وتی:»نازم بەگ و فەتاح بەگ«هەردووکیان ئێراقین چۆن دەبێ لەگەڵ ئەو لیژنەیەدا بن، ئەوەبوو لیژنەکە بەرپەرچی دایەوە و گوتی:»تا ئێستا نە کەرکووک و نە سلێمانی بەشێک نین لە ئێراق، ئەوکاتە دەبنە بەشێک لە ئێراق ئەگەر سنوور دیاری بکرێت«. ئەوەبوو تورکیا لە لیژنەکە ئامادەکاری دەنگدان قوڵتر دەکات، لە ٢٥ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥ بڕیاردرا لیژنەکە دابەش بکرێت بەسەر چوار دەستە بەم شێوەیە:

١ ـ میسو ڤیرسن بەهاوکاری»جەواد پاشا«و گاردل لە مووسڵ بمێنێتەوە لەوێ سەردانی شەنگارو ناوچەکانی دیکە بکەن.

٢ ـ کونت تیلیکی بە هاوکاری نازم بەگ و حاکمی سیاسی بەریتانیا مسیولیون و لەگەڵ وەرگێڕێک بەناوی کراموز دەستیان کرد بە گەڕان لە

هەولێر و شەقڵاوە و ناوچەکانی ڕۆژئاواو گەرمیان.
٣ ـ کۆلۆنیل پاولس بە هاوکاری »نەشئەت «کە نوێنەری ئێراق بووە دەستیان کرد بە گەڕان لە ناوچەکانی کەرکووک و تاڵەبان.
٤ ـ مسیو پورتالیس بەرپرسی ناوچەکانی گەرمیان بووە.
لە ٢٥ی شوباتی ١٩٢٥ هاتنە کەرکووک دوای ئەوە لیژنەکە بە یەکەوە سەردانی ناوچەکانی »زاخۆ ـ سنجار «یان کرد، دواتر گەڕانەوە بۆ دهۆک لەوێ »یاسین هاشمی «سەرۆک وەزیرانی ئێراق گلەیی لە لیژنەکە کرد، گوایە ئێوە دەچنە ناوچەکان و خەڵکی هان دەدەن لە ئێراق جیاببنەوە. »ئەدمونس «ئاماژەی بەوەدا کەوا »هەولێر و کەرکووک و سلێمانی «داوای دەسەڵاتی سەربەخۆی کوردیان کردووە، یاخود بەرژەوەندی کوردی ڕەچاو بکرێت. تەنانەت »شێخ مەحمود «یاداشتی پێشکەش کردووە کە دەسەڵاتی کوردی دەبێت سەربەخۆ بێ. هەروەها باسی ئەوە دەکات کە گوایە حکوومەتی بەریتانیا هانی رۆشنبیرانی سلێمانی داوە لە ١٢ی شوباتی ١٩٢٥ کۆمەڵەیەک دابمەزرێنن بەناوی »کۆمەڵەی بەرگری نیشتیمانی «بە سەرۆکایەتی »ئەحمەد تۆفیق بەگ «هەروەها حکوومەتی ئێراقی یارمەتی ئەو کۆمەڵەی دا چونکە لە بنچینەدا دژی تورکیا بووە، هانی خەڵکی ویلایەتی مووسڵی داوە کە لە دژی تورکیا بوەستن.
بیروڕای لیژنەکە
ـ لیژنەکە پێیان وابوو کەوا کوردستانی باشوور یاخود ویلایەتی مووسڵ پێکهاتەی سروشتی خاکەکەی وەکو چیاکانی زاگرۆسە، نە بەڵگەی تورکیا و نە بەڵگەی ئینگلیز ڕاست نین.
ـ هەروەها ویلایەتی مووسڵ بۆخۆی تەواوکەری ئابووری خۆیەتی و لە ڕووی ئابوورییەوە دەتوانێت پشت بەخۆی ببەستێت، بەڵام لە ڕووی هەڵکەوتەی جوگرافییەوە دەتوانێت پەیوەندی بازرگانی ببەستێت لەگەڵ دەوروبەرەکەی. ڕێژەی پەیوەندی کردنەکە بەگوێرەی پێویست دەبێت، واتە ناوچەکە پێویستی بەچی هەیە تەنها ئەو ئاڵوگۆڕ دەکەن.

ـ هەروەها لیژنەکە دەڵێت: کوردەکان لە بنچینەدا ئارین واتە نە دەگەڕێنەوە سەر ڕەگەزی تورک و نە عەرەب.

ـ لەڕووی پێکهاتەوە تاکی کورد جیاوازە لەگەڵ تورک و عەرەب، هەروەها کوردەکان زمانی تایبەت بەخۆیان هەیە و لە ناو کورددا هیچ لەهجەیەک ناگەڕێتەوە سەرزمانی عەرەبی و تورکی و فارسی، لەڕووی دابونەریتیشەوە لەوان جیاوازن.

ـ لیژنەکە لە ڕاپۆرتەکەیدا بە ئاشکرا ئاماژەی بەوەکردووە، ئەگەر وا دابنرێت»بەڵگەی نەژادی«هۆکارێکی یەکلاکەرەوەی کێشەکەیە ئەوا دەبێت دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ دابمەزرێت، دەکرێت لەو حاڵەتەدا»تورک و یەزیدی«تێکەڵ بکرێن لەگەڵ کوردەکان چونکە کوردەکان»٨٧٪«ی دانیشتوانی ئەوکاتەی ویلایەتەکە بوون بەگوێرەی ئەم سەرژمێرییە:

| ڕەگەز | ژمارەی دانیشتوان\ |
|---|---|
| کورد | ٤٩٤,٠٠٧ |
| عەرەب | ١٦٦,٩٤١ |
| تورک | ٣٨,٦٥٢ |
| مەسیحی | ٦١,٣٣٦ |
| یەزیدی | ١١,٨٩٧ |
| کۆی گشتی | ٧٩٩١٠٨ |

لە کۆتاییدا لیژنەکە بڕیاری ئەم خاڵانەی خوارەوەیدا:

١ ـ ویلایەتی مووسڵ بەشێکە لە ئێراق.

٢ ـ تورکیا دان بە سنووری وڵاتەکەی خۆیدا بنێت.

٣ ـ مافی دەرهێنان و بەرهەمهێنانی نەوت دەدرێت بە(ئینگلیز ـ فەرەنسا، ئەمەریکا ـ تورکیا). ئەوەبوو لە ١٩٢٥/٣/٢٥ ڕێککەوتننامەیەک مۆرکرا لە نێوان»بەریتانیا و تورکیا«سەبارەت بە نەوت، دواتر لە شوباتی ١٩٢٦ ڕێککەوتننامەی ئەنجوومەنی نەوتی ئێراقی لەگەڵ بەریتانیا مۆرکرا بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی یەکتری بپارێزن. لە تەمموزی ١٩٢٦

کۆنگرەی»ئینگلیزی ـ ئێراقی«بەسترا، لە ٥ی حوزەیرانی ١٩٢٦ ڕێککەوتننامەی سێ قۆڵی»ئینگلیز، تورکیا، ئێراق«مۆرکرا بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەیە:

١ ـ بەپێی هێڵی برۆکسل سنوور دەست نیشان بکرێت.

٢ ـ ویلایەتی مووسڵ ببێتە بەشێک لە ئێراق.

٣ ـ ڕێگە نەدرێت بە پیاو خراپان کەوا ئاژاوە لەسەر سنوورەکان بگێڕن.

دەرئەنجامی کێشەکە

١ ـ ئەگەر بە وردی سەیری ئەم کێشەیە بکەین کەوا لە سالآنی»١٩٢٦-١٩٢٣«ڕوویداوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا شوێنی ستراتیژی ویلایەتی مووسڵ و ئەو نەوتەی کە لەو ناوچەیەدا هەبووە بووەتە هۆی چاوتێبڕینی دەوڵەتانی زلهێز و تورکیای دراوسێ.

٢ ـ تورکیا لەو کاتەشدا چاوی لەو هەرێمە بڕیوە بەلآم ئەوکات بۆی نەچووە سەر ئێستاش دوای تێپەڕبوونی ئەو هەموو ساڵە، دەبینین مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە تورکیا لە کێشەی کەرکووک دا دەیەوێت خۆی بکاتە خاوەنی مەسەلەکە، بەلآم مێژوو سەلماندوویەتی کەوا تورکیا لەم دەستێوەردانانە تەنها ماندووبوون و خەمخواردن بەشییەتی چونکە بەپێی هیچ عورف و یاسایەک تورکیا ناتوانێت دەست لە کاروباری ولآتێک وەربدات کە سنوورێکی جیاوازی هەیە لە ولآتەکەی، لەلایەکی دیکەوە دەبینین تورکیا بەدەست کێشەیەکی ناوخۆییەوە دەناڵێت و کوردەکانی باکووریش داوای مافی خۆیان لە تورکیا دەکەن، بۆیە دەتوانین بڵێین ولآتێک کە بەدەست ئاژاوەی ناوخۆوە دەناڵێنێت و بەپێشێلکردنی مافی مرۆڤ تاوانبار دەکرێت ناتوانێت ببێتە ڕیش سپی ئەو هەموو هەوڵ و تەقەللایانەی تورکیا بەبێ سوود دەیدات بۆ نانەوەی ئاژاوە لە ئێراق و تێکدانی ئاسایشی هەرێمی کوردستان، ئەگەر بێت و هەموو ئەو هەولآنەی خستبایەگەڕ بۆ ئەوەی لە یەکێتی ئەورووپا وەربگیرێت لەوانەیە دڵی زۆربەی ئەندامانی ئەم یەکێتیەی بەدەست هێنابایە.

٣ ـ یەکێک لەو زوڵمە گەورانەی کەوا لە میللەتی کورد کرا لەوکاتەدا ئەوەبوو کەوا کاتێک ڕاپورسی کرا بۆ وەرگرتنی ڕای خەڵکەکە، کە گوایە دەیانەوێت لەگەڵ ئێراق بن یاخود لەگەڵ تورکیا، هەڵبژاردەی سێیەمیان نەدا بە خەڵکەکە واتە بواری ئەوەیان نەدا بە گەلی کورد کەوا سەربەخۆیی هەڵبژێرێت، واتە دەبوایە یان لەگەڵ تورکیا بن یا ئێراق.

٤ ـ لە ئەنجامی یەکلایی کردنەوەی کێشەکە سنوورێکی دەستکرد دروستکرا کە زەوییەکانی کوردستانی باشوور و باکووری لە یەکتر جیاکردەوە هێڵی برۆکسل دامەزرا لە ساڵی ١٩٢٦ لە نێوان تورکیا و ئێراقدا.

بۆیە دەبێ ئێمە سوود لە مێژوو وەربگرین و بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ دراوسێکانمان و دەوڵەتە زلهێزەکاندا بکەین، چونکە زۆرجار لە مێژوودا دەبینرێت کەوا هەموو دەوڵەتانی زلهێز پشتیان لە مەسەلەی کورد و مافە ڕەواکەی کردووە و کوردیش بە تەنها خۆی و چیا سەرکەشەکانی کوردستانی لە دەست ماوە کە بەرگری پێ لەخۆی و کێشە ڕەواکەی بکات.

هەموو لایەکمان ئارەزووی ئەوە دەکەین کەوا ئەم دەسکەوتەی کە ئێستا گەلی کورد بەدەستی هێناوە لە دامەزراندنی»پەرلەمان و حکوومەتی هەرێم«و بەدەستهێنانی فیدراڵی لە ئێراقدا بە یەکڕیزی و یەکێتی نێوانمان بیپارێزین و کار بۆ سەربەخۆیی کوردستان و پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ بکەین.

سەرچاوەکان

١ ـ تاريخ العراق المعاصر ـ د. فاضل حسين واخرون.
٢ ـ العراق فى سنوات الآنتداب البريطانى ـ البرت م. منتشا شفيلى.
٣ ـ تاريخ الوطن العربى الحديث ـ جاسم العدول واخرون.
٤ ـ الحركه الوطنيه فى العراق ـ عبدالآمير هادى الحكام.
٥ ـ الوضع القانونى لآقليم كردستان، العراق فى ضل قواعد القانونى الدولى العالم ـ الحاكم عبدالرحمن سليمان زێبارى.
٦ ـ كردستان من بدايه الحرب العالميه الآولى الى نهايه مشكله الموصل(١٩٢٦-١٩١٤«دراسه وثائقيه

# بەغداد

دروست بوونی بەغداد بە مێژووی خیلافەتی عەباسییەوە پەیوەستە, عەباسییەکان لەساڵی ٧٥٠ی زایینی دەسەلاتیان گرتە دەست دوای رووخانی دەسەلاتی بنەماڵەی ئومەوی .. و لەساڵی ٧٦٢ عەباسییەکان پایتەختیان لە دیمەشق ەوە بۆ عێراق گواستەوە و بەغدادی پایتەختیان بنیات نا .

خەلیفە ابو جعفر المنصور لە ساڵی ١٤٥ك لە کەناری راستی رووباری دیجلە بنیاتی نا , بەغداد لەکاتی بنیات نانی بازنەیی بوو چوار دەرگای هەبوو و أبوجعفر دوو شورای بۆ دروست کرد . ئینجا کۆشکەکەی و مزگەوتی لە ناوەراستی دا دروست کرد . بەغداد لەسەدەی چواردە لەناودارترین شارە رۆشنبیری و سیاسییەکان بوو, و لەسەردەمی هارون رەشیدا گەیشتە ترۆپکی شکۆی خۆی , و بەشێوەیەکی مەزن فراوان بوو , و بەغداد بەدرێژایی مێژوو بە پایە زانستییە جیا کەرەوەکەی ناسراو بوو , خەلیفە هارون رشید خانەی حیکمەتی بنیات ناو مأمون ی کوری لەسەدەی چواری کۆچی تەواوی کرد , کە بریتی بوو لەخانەی زانست و کتێبخانەیەك کە کۆری زانستی تیادا دەبەسترا , ئەوە بوو ژمارەیەکی زۆر لە زانایان و توێژەران تیایدا کۆدەبوونەوە بە مەبەستی وەرگێران و تووێژە زانستیەکان , و خەلیفە هارون رشید و لەدوای ئەویش مأمون ی کوری بەشێوەیەکی پراکتیکی بەشداری ئەو کۆرانەیان دەکرد .

ئەو کتێبخانەیە بەشداریەکی کارای کرد لە پەرەپێدانی زانستەکانی پزیشکی و کیمیا و فەلەك ئەوە بوو کە تاقیکردنەوە زانستی و توێژینەوە زانستییەکان بەخێرایی بەرەو پێشەوە دەچوون , خەلیفەکان و دەوڵەمەندەکان مایەی سوپاس کردن بوو لەرووی کارکردنیان لە بواری کۆکردنەوەی کتێبە دەگمەنەکان

و ئاسانکاریان دەکرد بۆ خەڵکی زانست خواز کە سوودیان لێ ببینن : هەروەها خەلیفە هارون رشید جێگایەکی تایبەتی لە کۆشکەکەی دروست کرد کە ژمارەیەکی زۆر لە کتێبی دەگمەنی عارەبی و ناعارەبی تیادا کۆکردبووەوە , ئینجا مأمون لەدوای ئەو هات و سامانی ئەو خەزێنەی زیاتر کرد تاکو هەزارەها بەرگی بەخۆوە گرت , هەروەها بەغداد خەزێنەی تری کتێبی تیادا بەدیار کەوت و بەو سەردەمەش وترا چاخی زێرین .

لە نیشانە مێژووییەکان :

١- قوتابخانەی موستەنسرییە

٢- کۆشکی عەباسی

٣- قوتابخانەی مەرجانی ئەمرۆ بە ( مزگەوتی مەرجان ) دەناسرێ .

٤ – خانی مەرجان

٥ – شورای رۆژهەلاتی بەغداد و دەرگاکانی / دەرگای المعظم – دەرگای الظفرية ( الوسطاني ) – دەرگای الحلبة – دەرگای البصلية .

٦ – گردی حرمل

٧ – عقرقوف

٨ – مدائن (طيسفون )

٩ – پانورامای قادسیە

کەوتنی بەغداد

بەغداد بەناخۆشی و تاقیکردنەوەی مەزن دا تێ پەریوە , ماوەیەك بەردەوام بوو کە کەم نەبوو و ئاژاوەی توند بڵاو بووەوە کە زیانی گەیاند بە ئاوەدانییەکانی و ماوەیەك ئاژاوە پەشێوی تیادا باو بوو , و دەسەلاتی

خیلافـەتی عەباسـی لاواز بـوو و خـەڵکی نـا عەباسـی دەسـتیان وەردا لـە بەڕێوەبردنی دەستەڵاتدا.

لە ساڵی ٦٥٦ك هۆلاکۆ گەیشتە بەغداد و ئابلۆقـەی داو شـەر بـەردەوام بـوو ئاژاوەیەکی ناوخۆیی رووی دا بەدەست بەسەرداگرتنی تەتەر بەسەر بەغدادا کۆتـایی هـات و خەلیفـە معتـصم و منداڵـەکانی و داروەدەستەکەی کـوژران و حورمەتی بەغداد ماوەیەکی درێژ پێشێل کـرا و خـۆری خیلافـەت لـە بەغـداد دوای بەردەوام بوونی بۆ ماوەی پێنج سەدە ئاوابوو , ئەمەش کارەسات بـوو بۆ هەموو جیهـانی ئیـسلامی ئینجـا مـەغۆل پـتر لـە جارێـك هێرشـیان کـردە سـەری دواجاریـان سـاڵی ٨٠٣ ك بـوو بەسـەرکردایەتی تیمـور لـنگ بەشـەر داگیری کرد زۆر بەتوندی کەوتـە ناوخـەڵکی بەغـداد و سـەربازەکانی مـاوەی هەفتەیەك هەموو شتێکی خراپ و ناشیرینیان لە شارەکەدا کرد .

و لەسـاڵی ٩١٤ك شـا اسماعیـل سـەفەوی هێرشـێکی کـردە سـەری و لـەژێر دەسەڵاتی سەفەوییەکان مایەوە تاکو عوسمانییەکان لـە سـاڵی ٩٤١ك لـەژێر دەستەڵاتیان دەرهێنان , ئینجا لەساڵی ١٠٣٢ك سـەفەوییەکان گەراندیانـەوە و لەژێر دەستەڵاتیان مایـەوە تـاکو سـاڵی ١٠٤٨ك سـوڵتان مـورادی چـوارەم گەراندیەوە .

ئەم رووداوانە بوونە هۆی لاواز بوون و داتەپینی بەغداد و دواکەتنی لە هەموو لایەنەکانی رۆشنبیری کە بەغداد ماوەیەکی درێژ بەرۆشنبیری ناسـرابوو . لـە ساڵی ١٣٣٥ك بەغداد کەوتە دەست ئینگلیز , و کاتێك شۆرشی عێراقـی دژی ئینگلیز بەرپابوو ئینگلیز ئینتیداب ( ماندات ) یـان لـە ئەنجوومـەنی کۆمەڵـە وەرگرت کـە تیایـدا هـاتبوو دان بـە عێـراق دا دەهێنـدرێ وەکـو دەوڵـەتێکی سـەربەخۆ بەمـەرجی رازی بـوونی بـە پـرس کردنـی ئیـداری لـە دەوڵـەتی

ئینتیداب تاکو دەگاتە ئەو رادەیەی بتوانێ خۆی بەڕێوە ببات . لە کاتەوە بەغداد بوو بە پایتەختی عێراق و تاکو ئێستاش هەروا ماوەتەوە .

## سەرچاوە

مدن لها تاريخ , اعداد ابتسام سالم , مكتبة الصور , موقع الفلق
وەرگێرانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی د . محمد عبدالله کاکە سوور

# ئەخناتون و شۆرشە ئایینەکەی
# ١٣٧٠ـ١٣٤٠ پ.ز

کەلسومە جەمیل عەبدولواحید

پێشەکی:

خۆ بە(خودا)دیتن خۆ بەخوا ناساندن و سەپاندن لە سیماو ئەدگارە بنەرەتیەکانی سیاسەتی فیرعەونەکانی میسرە .ئەو دیاردە هێندە بە هەژموون بووە هەتا بۆتە بەشێك لە بیرکردنەوەوهزرو باوەری ناو بازنەی دەسەلاتی فیرعەونیەت ودەست وپێوەنەکانی و خەڵکە عەوامەکەش .دەرکەوتنی ئەخناتون و شکاندنی خودایەتی فیرعەون و گەراندنەوەی عبودیەت و بەندایەتیبۆ فیرعەونەکان مەسەلەکە ئەوەندەهەڵدەگرێ توێژینەوەی لەسەر بکرێ.
لەم کورتە نوسینەدا هەوڵ دەدەات خوێندنەوەیەك بۆ کوشتنی سیفەتی (خودایەتی)لە دەسەلات وکەسایەتی فیرعەونەکانی میسر بکات ،چونکە ئەمنحۆتبی چوارەم (ئەخناتون)وەك شۆرشێك بناسێ ،چونکە ناوازە لە بیرکردەوەی میسریەکان و کۆششێکی دانسقە بوو لە وەرچەرخانی بزاڤی باوەڕیی _عەقیدەیی_.
سەرکەوتن یان فەشەڵ هێنانی پرۆژەکەی ئەخناتون بەقەد خودی بزاڤەکە گرنگ نین چونکەئەو ریفۆرمەی دینی وسیاسی و کۆمەلایەتیە بوو.ئەخناتون

توانی-سیفەتی خـودایی لـەخۆی و هـەر فیرعـەونێکی تـر ڕامـاڵێ ئەمەئـەخناتون نەبوایە هـەتا هـەر پێغەمبـەرێکێش بووایـە دەسـەڵاتی فیرعەونـەکان ودەسـەڵاتی کاهینـەکان زوو لـە ناویـان دەبـرد .لـەم ڕوانگـەوە ئـەم نووسـینە دەرگـا لەسـەر مەسەلەیەکی ئەوەها هەستیار بە زمانی کوردی دەکاتەوە.

سەرنج

لە بنەماڵەی هەژدەهەم کە سەردەمی دەوڵەتی نویێ لـە مێـژووی (١٥٨٠ _ ١٠٨٥ پ.ز) دەست پـێ دەکات بەتایبـەتی دوای ڕزگـار کردنـی میسر لـە ژێـر چـنگی هکسوّس بۆماوەی نزیکـەی دوو سـەدە دەسـەڵاتدار بـوون، بـە سـەرکردایەتی ( ئـوحمس پاشـا١٥٧٠ _ ١٥٤٥ پ.ز_یەکـەم پاشـای بنەماڵـەی هـەژدە)، چـەند ڕووداوێکـی گرنگـی تێـدا هاتـە ئـاراوە وەك یەکـەم /سـەرهەڵدانی سـەردەمی ئیمپراتۆریەت .دووەم /شۆرشـە ئایینەکـەی ئـەخناتون .لـەم بابەتـە مەبەسـتمان باس کردنی سەردەمی ئەخناتون و بارودۆخی سیاسی و کاریگەری ئایینەکەیەتی (الاتونیە) لە ڕەوشی ئایینی وسیاسی ودەرئەنجامی لە کۆمەڵگای میسر.

ژیان وکەسایەتی ئەخناتون:

ئەخناتون ناوی ڕاستەقینەی( ئەمنحوّتپ )ی چوارەمە کوری ئەمنحوّتپی سێیەمە کـە خـاوەنی کەسـایەتیەکی بـە توانـاو لێهـاتوو بوو،میـسر لـە سـەردەمی ئـەودا گەیشتە ئەو پەری بەرفراوانی پێشکەوتن لەڕووی سیاسـی و شارسـتانێتی،دایکی ئافرەتێکی خاوەن پێگەیەکی بەهێز بوو لـە کۆشـك بـەناوی شـاژن (تـی) ،بـەڵام ئەمنحوّتپ چوارەم تەواو پێچەوانەی باوکی بوو بەوەی حەزی بـە شـەڕو کوشـتن

نـەدەکرد بـەڵکو زیـاتر لـە کەسێکی شـاعیرو خـەیالی وچاکـسازێکی ئـایینی دەچوو،لەتەمەنی پازدە ساڵی دا لە گەل ئەمنحوتبی سێیەمی باوکی بەشداری لە بـەڕێوەبردنی کاروبـاری دەوڵـەت دەکـرد وەکـو نـەریتێکی بـاوی ئـەوکات بـوو جێنشنەکان لەگەڵ فیرعەون دەبوون تا شارەزاو ئاگاداربن لە فەمانرەوایی، دوای کۆچی دوایی باوکی بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ ئەمنحوتبی چوارەم مایەوە لەگـەڵ خێزانە جوانەکەی (نەفەرتیتی ،جوانێ گەیشت) نەفەرتیتی ئافرەتێکی بە ڕەگـەز میتانی بووە وەك دیارییەك پێشکەشیبە فیرعەونی میـسر کـراوە،وەك هاوژینێـك توانی هاوکـاری ئـەمنحۆتبی چـوارەم بکـات لـە بـەڕێوەبڕدنی کاروبـاری سیاسـی وئـایینی وولات ، نزیکـەی حەڤدەسـاڵ فـەرامانڕەوایی میـسریان کـرد لێـرەدا جیاوازی لە مێژووی حوکم کردنە بەدەردەکەوێ ئایا لـە سـاڵی ١٣٧٢ _ ١٣٥٤ پ.ز یـان ١٣٦٧ _١٣٥١ پ.ز ئەمـەش بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە پاشـایانی ئـەو بنەماڵەیـە هەرلـە سـەردەمی ناوەنـد٢٠٠٠ _١٧٨٧ پ.ز بنەماڵـەی (دوازدە)ەوە کورەکانیان لە گەڵ خۆیان بەشداری پێ دەکرد لە دەسەلات دیـارە ئەمـەش بـۆ ئاشنابوون وشارەزایی بووە لەبارەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت لەلایەکی تر مسۆگەرکردنی دەسەلات بوو بۆ کورە گەورەکەی.

ڕەوشی سیاسی وئایینی لە سەردەمی ئەخناتون

لەسـەردەمی ئـەمنحۆتنی چـوارەم نزیکـەی دووسـەدەی بەسـەر دروسـت بـوونی ئیمپراتۆریەت تێپەڕیبوو دەسـەلاتیان بەسـەر بەشـی زۆری ناوچـەکان دا گرتبـوو وەك سـودان(وولاتـی نـەوبا) و لیبیـا و وولاتـی شـام بـەلام لەماوەیـەدا زۆربـەی بەشەکانی ئیمپراتۆری هەڵوەشایەوە کاتێ کە زانیان فیرعەونی نـوێ ئـەمنحوتبی چوارەم خەریکی داهێنانی بیروباوەڕی تازەیە بووەتە مامۆستایەکی ئـایینی نـەك پاشایەکی جەنگاوەر بۆیە حاکمی هەرێمەکان لە ناوچەکانی خۆیان لە دژی پاشـا

بەرپاکرد ئەمەش وەك نەریتێك هەرکاتێ حاکمی هەرێمەکان هەستیان بەوە کردبایە پاشا بێ هێزە توانای ئەوەی نییە ڕووبەرویان ببێتەوە ئەوا جیادەبوونەوە سەربەخۆی خۆیان ڕادەگەیاند زۆربەی هەرێمەکانی ئاسیا جیابوونەوە زیانێکی ئابووری زۆریان بەدەولەت گەیاند بەهۆی نەمانی باج وسەرانە .لەلایەکی تر مەترسی دەسەلاتی حیسیەکان لەئارادابوو،نەیان توانی لەدژیان بووەستن بەهۆی هەبوونی کێشەی ناوخۆ . هەروەها لاوازبوونی سوپاو ڕێکخسنەکانی ئەمەش لەبەر مژووڵبوونی فیرعەون بە ریفۆرمە ئاینیەکەی دەگەرێتەوە .لەبارەی ڕەوشی ناوخۆی ئیمپراتۆریەت بەرەو ئالۆزی هەنگاوی دەنا بە هۆی زۆربوونی دەسەلاتی (کاهینەکانی خوداوەند ئامون ) لەکۆتایی سەردەمی ئەمنحوتبی سێیەمەوە تا سەردەمی ئەمنحوتبی چوارەم توانی بوویان چەند پۆستێکی سیاسی و ئایینی بەرز وەربگرن (خوداوەند ئامون) ئامۆن بە مانای شاراوەدێت، کە خوداوەندی ڕۆژ وبا و پیتێن بووە لەسەردەمی بنەماڵەی یازدەوە بەدەرکەوت پەرستگای تایبەتیان بۆ دروست کرد لە( کەرنەك)، لەسەردەمی بنەماڵەی حەڤدەمەوە بەتایبەتی کە پاشاکانی ئەو بنەماڵەیە توانیان هکسۆس دەربکەن لەو ساوە بووبە خوداوەندی سەرەکی و پارێزگاری میسر ، بەهۆی ئەو پلەو پایە بەرزەی ئامون هەیبوو کاهینەکانی پەرستگاکەی ڕۆژ( تیبە) لە دوای ڕۆژ پێکەیان بە هێزتر دەبوو بەلام ئەمنحوتبی چوارەم دژایەتی کردن ئەمەش زیاتر پەیوەندی بە کەسێتی خۆی هەبوو کە دەیویست دەسەلاتێکی ڕەهای هەبێ بۆئەوەی بتوانێ بەسەر کاهینەکان زالبێ پێویستە ڕۆڵیان کەم بکاتەوە ئەویش بە بێ بایەخ کردنی ئامون چونکە دەسەلاتێکی سیاسی زۆریانیان هەبوو جا بۆ کەیشتن بەم مەبەستە پێویستە ریفۆرمێکی ئایینی ئەنجام بدات بۆیە هەموو پەرشتەکانی تری میسری لەکارخست تەنیا

بریـاری پەرسـتنی یـەك خوداوەنـد( ئـاتون) دا بـەوەی تـەنیا یـەك پەرسـتراو (التوحید)هەبێت.

ئایینی ئاتون (الاتونیة)

ئەو ئایینەی کە ئەمنحوتیی چوارەم بانگەوازی بۆ دەکرد پەرستنی(رۆژ) بەناوی ئاتون ،ئایینێکی نامۆ نەبوو لە مێژووی میسری کۆن بەڵکو(رۆژ)بە ناو وشێوازی جیاواز پەرستراوە برگەیەك لەناوی زۆربەی پاشاکانی پێکدەهێنا بەناوی (رەع) (خەفرەع_مەنکرەع)پاشایانی بنەماڵەی چوارەمن یان بەناوی (هـور اختـی)یـان (ئـاتوم).پەرسـتنی خوداوەنـدی رۆژ لـە سـەردەمی بنەماڵـەی پێنجـەم چـووە قۆنـاغێکی تـر ئـەویش بـاڵا دەسـت بـوونی کاهینـەکانی ئـەو خوداوەنـدە لـەم سەردەمەدا لەگەڵ ناوی خوداوەندەکانی تریـان ئاوێتـە کردبـوو وەك بـۆ نموونـە حۆریس بوو بە حـۆریس رەع ..دیـارە رۆژ کاریگـەری زۆری لـە ژیـانی ئـادەمیزاد هەبووە دەبینین لەمێژووی کۆنی زۆربەی گەلان وەك خوداوەند سەیریان کـردووە حۆریەکان یان خۆرپەستەکان دانیشتوانە هەرە کۆنەکانی عێراق بوونە هەرەوەها (میتانیەکان)هەمان پەرسـتراویان هـەبووە هـەروەها چـەندەها نمونـەی تـر هەیـە ئامـاژە بـەوە دەکـەن کـە رۆژ پەرسـتراوەلە قورئـانی پـیرۆز ئامـاژە هەیـە رۆژ پەرسـتراوە لــە سـەردەمی ئیـبراهیم پێغەمبـەر دیاریـدەی رۆژپەرسـتن هەبووە،میسریەکان رۆژیان پەرستووە و بووە بە خوداوەندی سەرەکیان چونکە کاریگەری راستەوخۆی لە سەر ژیانیان هەبووە بەوەی کەژیان رووناك دەکاتەوەو کشتوکاڵ گەشەدەکات و هێزێکە تـاریکی لـەناو دەبـات و خۆشـی و بەختـەوەری رووناکی دەبەخشێ ،میسریەکان هێماو ناوو شـێوازی جۆراوجۆریـان بـۆ رۆژ دانـا بوو وەك (خەفرەع )خوداوەندی رۆژ لەکاتی بـەیانی بـووە ،(رەع) خوداوەنـد رۆژ لەکاتی ئێوارانە .....تێروانین وشێوازی جۆراوجۆریان بۆ کێشابوو وەك شێوەی

ئاژەڵ(گوڵك )یا باڵندە لەشێوەی (باز یا هەڵۆ) یا وێنەی پیاوێك سەری شێوەی( باز).لە کرداری ڕۆژ ئاوابوون هەروەها دووبارە هەڵاتنی لەکاتی بەیانی سەریان سورمایە مەندەهۆش بوونە بۆیە وایان لێکداوەتەوە (رەع) گەشتێکی ڕۆژانە ئەنجام دەدات لە بەرزایی ئاسمان بە بەڵەمە زێرینەکەی دەست پێدەکات بەرەو ڕۆژئاوا (بیابان)هەرێمەکانی ژێرەوە (ناخی زەوی)دەچێت جارێکی تر لە ئاراستەی رۆژهەلات دووبارە رووناکی وبەختەوەری وخۆشبەختی بۆ دانیشتوانی جیهان دەهێنێت .بەڵام ئەوەی ئەخناتون بانگەوازی بۆ دەکرد پەرستنی تەنیا یەك خوداوەند ڕۆژ بوو بەناوی (ئاتون)جیاوازی لە گەڵ هەموو پەرستراوەکانی تر لەبەرجەستەکردنی وێنەو شێوەوئاکاردا هەبوو،هیچ جۆرە شێوەیەك یان وێنەی بۆ ئەنجام نەدەدا چونکە هەموو خوداوەندەکانی میسر وێنەیان لە شێوەی ئاژەڵ یا ئاوێتە لە نێوان ئاژەڵ و ئادەمیزاد یان لە شێوەو ڕەمزی ئەفسوناوی وخەیاڵی بۆ دەکێشرا بەڵام ئەمنحۆتبی چوارەم ڕێگەی نەدا وێنە و شێوە بۆ خوداوەند ئاتون بەجەستە بکرێ چونکە ئەو لەتێروانینی ئەخناتون بەدیهێنەرەو ژیان دەبەخشێتە دروستکراوەکانی وبونەوەر هەڵدەسورێنێ ئاسودەیی بە خەڵك دەبەخشێ وخێرو خۆشیان بەسەر دەبارێنێ .خوداوەندی راستی وراستگۆی ودادوەرییە،هێماکەی لەشێوەی چەند تیشکێك ناوجەرگەی ئاتونە یان لە ئاتونەوە بەدەستی مرۆڤ کۆتایی دێ کە نیشانەی ژیانە بە پەرستشکارانی دەبەخشێت رەمزی بەختەوەری بێ کۆتایيە ،ئەوەی رەچاو دەکرێ ئەو ئایینە تاك ڕەهەندیە بەوەی خوداوەند ئاتون هاوسەری نەبووە هەتا( نەفەرتیتی)کە کۆلەگەیەکی بنەرەتی ئەم ئایینە بووە هیچ پایەکی کاهینی نەبووە لە پەرستگای( ئاتون).

**بانگەواز بۆ ئاتون وگواستنەوەی پایتەخت:**

ئەخناتون ئایینە نوێیەکەی ڕاگەیاند ئەویش پەرستنی ئاتون بوو دیارە چەند فاکتەریك لە پشت داهێنانی ئەم بیروباوەرە تازەیە بووە وەك ئەوەی پێشتر ئامازەمان پێدا خودی ئەخناتون خۆی بوو وەهەروەها بە بۆچونی ئێمە ئەوەی زیاتر هاندەر بووە کە ئەخناتون ئەم شۆرشە بهێنێتە ئاراوە ئەویش کرانەوەی میسر بووە بەرووی دەرەوە بەتایبەتی لەدوای بەرفراوان بوونی سنوری دەوڵەت دروستکردنی ئیمپراتۆریەت تێکەڵاو بوونی لە گەڵ کۆمەڵێ رەگەزو گەلانی جیاواز، پەرستنی ئامون بیروباوەری تایبەتی (تیبە) میسریەکان بوو هێماوئامازەی شاراوەی تێکەڵاوی هەبووە ئەستەم بوو خەڵکانی بەشە جیاجیاکانی ئەمپراتۆریەت تێی بگەن بۆیە ئەخناتون ویستی لە ڕێگای یەك پەرستراو (ئاتون)خوادوەندێکی جیهانی بێنێتە ئاراوە چونکە ئاتون خوداوەندێکی جیهانگیرە پەروەردگاری هەموو بونەوەر و نەتەوەیەکە کە ڕۆژ پێیان دەگات ئاتونیش جیاوازی ناکات لە بەخشینی ژیان وڕووناکی وبەختەوەری ،بۆیە یەکێ لە ئامانجەکانی ئەخناتون لە پەرستنی ئاتون بە جیهانی کردنی پەرستن بەوەی پەرستراوی گشت نەتەوەکانی جیهانە . فاکتەرێکی تر بۆ سەرهەڵدانی ئاتون ئەنجامی پەیوەندیە سیاسیەکانی میسر لە گەڵ میللەتەکانی تر بەتایبەتی میتانیەکان بووبێ لە ڕێگای نامەکانی (تەڵ عەمارنە) لەساڵی ١٨٧٧ ز دۆزراوەتەوە ئامازە بە پەیوەندیەکانی میسریەکان لەگەڵ میتانیەکان دەکات هەروەها هاوسەرگیری سیاسیش ئەنجام دراوەوەك (تادۆخیپا)ناسراو بە نەفەرتیتی شوو بە ئەمنحۆتەب دەکات ئەوانیش واتامیتانیەکان ڕۆژیان پەرستووەو لەلایان پیرۆز بووە دەتوانین بڵێین نەفەرتیتی کاریگەری لە سەر گۆرانی بیروباوەری ئەخناتون هەبووبێ چونکە خاوەنی کەسایەتیەکی بەهێزبووە

لە خێزانە سەرەکیەکانی ئەخناتون بووە،پاش داهێنانی ئایینە نوێیەکە(ئاتون) ئەخناتون ناوێکی نوێی بۆخۆی دانا لە ئەمنحۆتبەوە بۆ ئەخناتون واتا (گیانی ئاتون یا بەسوود بۆ ئاتون یا دڵسۆز بۆ ئاتون)لە ساڵی چوارەمی بریاریدا دەسەلآتی سیاسی وئایینی لە تیبە بۆشوێنێکی تربگوازێتەوە پاك بێت و دووربێت لە بیروبۆچونی کاهینەکانی ئامون و پیلانەکانی لە دژایەتی کردنی (ئاتون) وڕێگا گرتن لە بلاوکردنەوەی ئاتون پەرستی لەئاکام شوینێکی هەڵبژارد کە پێشتر هیچ خوداوەندێکی تری تێدا نەپەرسترابێت لە (تەڵ عەمارنەی) ئێستا ناوی نا (ئەخیتاتون)واتا ئاسۆی ئاتون یان دەرکەوتنی ئاتون)دیارەئامانجی لە گواستنەوەی شوێنی نیشتەجێبوونی دروستکردنی قەلآیەکی پتەوبوو بۆ ئاتون تا بیکاتە پەرستراوێکی جیهانی لە هەموو شوێنەکانی تر ،ئەخناتون بۆ ڕاگەیاندنی بانگەوازەکەی سێ مەڵبەندی سەرەکی دامەزراند لە سودان(نەوبە) سوریا وفەلەستین دەستی کرد بە بلاوکرنەوەی بیروباوەڕەکەی لە ڕێگای لۆژیك وگوفتاری جوان و ڕەفتاری ئاشکرا و دیار وەك خۆی و خێزانەکەی و کچەکانی لەبەرچاوی کۆمەڵگا ودانیشتوانی پایتەخت بۆ پەرستگا دەچوون بەمەش لەو دابونەریتە داخراوەو وابەستەیە دەرچوو پێشتر کەسی ئاسایی ئەستەم بوو پاشاو خێزانەی ببینن ئەم شێوازە بوو بە داهێنانێکی نوێ لە هونەری(ریالیزم).

### کاریگەری بیروباوەری ئاتونیەت لە میسر:

هەرچەند ئەخناتون سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا لەو شۆرشەی بەرپای کرد بەلآم توانی کاریگەریەکی زۆری لە زۆر بواری هونەر وئایین وسیاسی میسر بەجێبهێڵێ.

هـەوڵ دەدەیـن هەنـدێکیان بخەینـە روو::هونـەر لەماوەیـەدا شـێوازێکی نـوێی بەخۆوە بینی ،بریتی بوو لە واقعیەت یان ریالیزم واتا شێوەو سیمای پاشـا وەك خـۆی وێنـە دەکێـشرا ،پێـشتر شـێوازی ئەیـدیالی بوو،ئـەخناتون رێگـای دا بـە هونەرمەندان خۆیو خێزانەکـەی کـچەکانی وەکـو شـێوەی ڕاستەقینەی خۆیـان بکێـشرێن.ئـەخناتون رەچەشـکێنێکی دەسـەڵات و ژیـانی فیرعەونیـەت بـوو.بـە پێـــچەوانەی ئەوانـــەی پـــێش خـــۆی لەچـــوار چـــێوەی کۆشـــکەکەی دەرچوو.هونەرمەنـدان وێنـەی ئـەخناتۆنتیان وەك مرۆڤێـك کێشاوە هـیچ سـیما وئەدگارێکی خوداوەندیان بۆ زێدە نەکرد ئەخناتون شێوەی راستەقینەی خـۆی چـۆن بووئـاوا نـەخش دەکـرا وەك دەم چـاو لاوازو سـك دەرپـەریوو ... چـونکە ژیـانی فیرعـەون گوزارشـتی لـە ژیـانی مـرۆڤ دەکـرد نـەك خوداوەند،هـەوەها ئەخناتون لە خێزانەکەی نەفـەرتیتیی وکـچەکانی رۆژانـە سـەردانی پەرسـتگایان دەکرد لەبەرچاوی خەڵکی ئاسایی بۆ ئـەنجام دانـی پەرسـتش. سـروود شـێوازی پەرستن بە زمانێکی سادەو ساکار دەردەبران لەمەدح کردن وپیاهەڵدانی ئـاتون .بەڵام ئەم شۆرشەی ئەخناتون کاریگەری زۆر خراپی لە رەوشـی سیاسـی وولاَت کرد چونکە مژووڵبونی فیرعەون بە ئاین ودژایـەتی کردنـی کاهینـەکان فـەرامۆش کردنـی رەوشـــی سیاســـی نـــاوخۆ و دەرەوە، لەئـــەنجام دا مەترســـی هێرشـــی هۆزەکانی دەوروبەر زیاتر بوو بەتایبەتی (حیـسیەکان) هێرشـیان هێنـا بۆسـوریا داگیریان کرد،هەروەها وولاَتـی (میتانیـەکان)کەوتـە ژێـر دەسەلاَتیان،هەرچـەندە حاکمی هەرێمی سوریا داوای یارمەتی لە ئەخناتون کرد بە ناردنی سـوپا وهێـزی زیـاتر بـۆ بەرهەڵستی هێرشـی حیـسیەکان بـەلاَم فیرعـەون وەلامـی نەدانـەوە لەلایەکی تر شەڕی ناوخۆ لەنێوان خۆیان واتا لـە نێـوان لایـەن گیرانـی فیرعـەون وئەمیرەکانی سـوریا بەتایبـەتی کـاتێ زانیـان فیرعـەون خـاوەنی کەسـایەتیەکی

دوورەشەر بوو خەریکی فەلسەفەوداهێنانی بیروباوەر ئاتون بوو ئەوانیش ئەم هەڵەیان قۆزتەوە دەستیان بەسەر زۆربەی ناوچەکانی سوریا وفەلەستین داگرت، ئابوری دەوڵەتی میسر زۆرخراپ بوو چونکە باج وسەرانە هیچی تر نەدرا بە میسر ،بارودۆخی سیاسی ناوەوەش زۆر ئالۆزببوو بەهۆی دروست بوونی بۆچوونێکی نوێ لەرووی بیروباوەڕی میسر لەنێوان یەک پەرستراو(ئاتون)پەرستراوی زۆر ،کاهینەکانی ئامۆن خەڵکیان هاندەدا بۆ دژایەتی و بەرهەڵستی کردنی بیرباوەرە نوێیەکەی ئەخناتون وتاوانبارکردنی بە زەندیق وهەڵگەراوە لە دین ،لەبەر ئەوە بۆمان دەردەکەوێ چاکسازیەکانی ئایینی ئەخناتون سەری نەگرت بەڵگەش هەر دوای مردنی ئەخناتون شێوازی ئاسایی ژیانی میسریەکان گەڕایەوە دۆخی جارانی خۆی دووبارە ئامۆن بوو بە خوداوەندی سەرەکی و فرەپەرستراو خوداوندی زۆر پەرستنی ئاژەڵان وهیتر دەستی پێکردەوە،لەبەر ئەوەی ئەم کارەی ئەخناتون لەم ماوە کورتەدا رووکەشی بوو بۆیە لە ئەنجامدا نەیتوانی گۆرانکاری بنەرەتی لەژیانی خەڵکەکە بێنێتە ئاراوە وێرای ئەمانەش ئەم شۆرشەش نەیتوانی ببێتە شۆرشێکی جەماوەری ،بەڵکو تەنها پیاوانی ئایینی_کاهینی نوێی ئاتون نەبێ ئەوانە بەشێکی زۆر زەوی کشتوکالیان دەستکەوت ،بەلاّم چینی هەژراو جوتیاران رەوشی ژیانیان هیچ گۆرانێکی ئەرێی بە خۆوە نەبینی ،هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن ژیانی ئاسایی ئەخناتون بەجۆرێ ئالۆز ببوو خێزانەکەی(نەفەر تیتی)لە گەڵی جیاببۆو بەتەنیا لە کۆشکێك لەباکوریەناوی کۆشکی ئاتون دەژیا ئەمەش لەبەر ئەوەبووە کەپاشا لە کۆتاییەکانی ژیانی پاشەگەز بووەتەوە،هەرچەند چۆنیەتی کۆتا هاتنی تەواوی ژیانی ئەخناتون روون نیە تا ئێستا توێژینەوە لەم بارەیەوە بەردەوامە ،دوای ئەو زاواکەی (هەندێ دەڵێن

کوری بووە لەژنی دووەمی بەناوی کیا )تـوت عـنخ ئـامون(١٣٣٢ _١٣٢٢ پ.ز )
بوویـە فیرعـەونی میـسر بـارودۆخی وولآت وەك پێـشتری لێهاتـەوە پایتـەخت
گوازرایـەوە بـۆ تیبـە کاهینـەکانی ئـامۆن پێگـەو شـوێنی جارانیـان بـۆ
گەرایەوە،دووبارە پەرستنی پەرستراوەکانی پێشتر برەوی پێدرایەوە بۆئەوەی
ناوی (ئاتون) لە ژیانی سیاسی وئایینی نەمینێ ئەوە فیرعەونی نوێ لە توت عنخ
ئاتون بۆ توت عنخ ئامۆن گۆری پێناچێ ئەمەخۆهێشتی ولە خۆوەبووبێ بەڵکو
تەمەنی بچوك بووەو نەیتوانیە بەهەرڵستی کاهینەکانی ئامون بکات .

ئەنجام :

هەرچـەندە ئـەخناتون بـە ریفـۆرمی بیروبـاوەڕی هـەژماردەکرێ تـوانی دژایـەتی
کاهینەکانی ئامون بکات داوای پەرستنی یـەك پەرسـتراوی بکـات ئـەویش ئـاتون
خودای خۆر یان خۆر خودا بووا بە بەهانەی ئەخناتون بۆ ئەو گۆڕانە بنەرەتیە لە
ژیانی ئایینی میسری ئەوەبوو ئامون تەنیا خوداوەندی (تیبـە)میـسریەکان بـووە
نەك تەواوی سەراپای ئەمپراتۆری میسر بەتایبەتی پاش ئـەوەی میـسر گەیشتە
قۆناغی ئیمپراتۆریەت (١٥٨٠ _١٠٨٥ .پ.ز)سنوری دەوڵەتەکـەیان زۆر بـەرفروان
ببوو سوریاو فەلەستین و بەشێکی ئاسیا هـەتا ڕووبـاری فـورات گرتبـۆوە بۆیـە
ئەخناتون ویستی لە رێگای یەك خوداوەنـد جیهـان یـەکبخات ئـەویش ئـاتون ڕۆژ
یـان قورسـی رۆژ زۆریـەی میللـەتان شـارەزاییان هەیـە لەبارەیـەوە پەیوەنـدی
راستەوخۆی بـە ژیـانی ئـادەمیزادەوە هـەبووە بەتایبـەتی گـەلانی ئاسـیا دیـارە
ئەمـەش لـە پەیوەنـدی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی کاریگـەری لـە فیرعەونـەکان
بەتایبـەتی سـەردەمی ئـەمنحۆتبی چـوارەم بەدەرکـەوت هـەروەها رۆڵـی شـاژن
نەفـەرتیتی لـەو گۆڕانکـارە دیـارە ،بـەلآم ئـەخناتون نـەیتوانی دەوڵـەت بـە

شێوەیەکی دروست وئاسایی بەڕێوەبەرێت چونکە لەبارەی ناوخۆەوە زۆر ئالۆز ببوو لە نێوان لەیەنگیری ودژایەتی ،ئەخناتون هەوڵی دا بەلاّم هەردوای نەمانی لەدەسەلاّت وازیان لە پەرستنی ئاتون هێنا چونکە ئەخناتون ڕەمزی ئەو پەرستراوە بوو .

سەچاوەکان:

١ _ابراهيم نمير وزكى على واحمد نجيب هاشم :مصر فى العصور القديمة،راجعه:الاستاذ محمد شفيق الغربال،القاهرة ،١٩٩٨ م.

٢ _برهان الدين دلو:حضارة مصر والعراق التاريخ الاقتصادى والاجتماعى والثقافى والسياسى،بيروت،١٩٨٩ م.

٣ _جيمس هنرى برستد:تاريخ مصر من اقدم العصور الى العصر الفارسى ،ترجمة،حسن كمال،مصر،١٩٧٧م.

٤ _سامى سعيد الاحمدواخرون:تاريخ الشرق القديم،بغداد ،١٩٨٨م.

٥ _عامر سليمان واحمد المالك الفتيان:محاضرات فى التاريخ القديم ،بغداد ،١٩٧٨م.

٦ _محمد ابو المحاسن العصفور:معالم التاريخ الشرق القديم بيروت،١٩٨١.

٧ _محمد البيومى مهران:دراسات فى التاريخ الادنى القديم (الحضارة المصرية)،دارالمعرفة الجامعية،١٩٨٤م.

٨ _کەلسومە جەمیل :کورتەیەك دەربارەی میتانیەکان ،ڕامان،ژ،١٥٨ ،هەولێر ،٢٠١٠ ز.

چەند پێگەیەکی ئەلیکترۆنی:

٩-الديانة الاتونية _ويكبيديا الموسوعة الحرة.

١٠-اخناتون _ويكبيديا الموسوعة الحرة.

# پرسیار و وەڵام

ئامادەکردنی د.محمدعبدالله کاکە سوور

پ١ — مێژوو نووسە موسڵمانەکان بە چ شێوەیەك ناوی کەرکوکیان هێنابوو ؟

و : کەرخێنی

پ٢ — بەپێ ی چ مەرسومێك و لە چ رێکەوتێك ناوی کەرکوك بۆ پارێزگای تەئمیم (التأميم ) گۆرا ؟

و : بەپێی مەرسوومی کۆماری ژمارە (٤١) , لە ٢٩ / ١ / ١٩٧٦ .

پ٣ — بەرزی خاکی کەرکوك لە ئاست رووی دەریاوە چەندە ؟

و : ( ١١٦٠ پێیە ) .

پ٤ — لە چ ساڵێك ناوی سەنجەقی شارەزوور بۆ سەنجەقی کەرکوك گۆرا ؟

و : لە ساڵی ١٨٩٣ .

پ٥ — لە چ سالێك یەکەم رۆژنامە لەشاری کەرکوك دەرچوو ؟

و : لەساڵی ١٩١١

پ٦ — ئەورۆژنامەیەی بۆیەکەم جار لەشاری کەرکوك دەرچوو چ مۆرکێکی هەبوو ؟

و : رۆژنامەیەکی سیاسی هەفتانە بوو .

پ٧ — یەکەم رۆژنامە کەلەساڵی ١٩١١ دەرچوو بە چ زمانێك بوو ؟

و : تورکمانی .

پ٨ — لە چ رێککەوتێك بۆ یەکەم جار بریتانییەکان کەرکوکیان داگیر کرد ؟

و : لە ٧ ئایاری ١٩١٨ .

پ٩ – دوای یەکەم داگیرکردنی کەرکوك لەلایان ئینگلیزەکان و بەهۆی لۆجستی لە چ ڕێککەوتێك ئینگلیزەکان لەشاری کەرکوك کشانەوە ؟

و : لە ٢٤ ی ئایاری ١٩١٨ .

پ١٠ – لە چ ڕێککەوتێك شاری کەرکوك بۆ جاری دووەم لەلایان سوپای بریتانیاوە دەستی بەسەر داگیراوە ؟

و : لە ( ٢٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ ) .

پ١١ – ئینتیداب ( مەندات ) ی بریتانی بۆ سەر عێراق چەندی خایاند ؟

و : لە ( ٢٥ ی نیسانی ١٩٢٠ تاکو ٣٠ ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٢ ) .

پ١٢ – دوای داگیرکردنی کەرکوك لەلایان بریتانیەکان لە ١٥ ی کانوونی یەکەمی ١٩١٨ , بریتانیەکان چ ڕۆژنامەیەکیان لە شارەکە دەرچوواند ؟

و : ڕۆژنامەی نەجمە .

پ١٣ – ڕۆژنامەی نەجمە بە چ زمانێك دەرچوو ؟

و : بە زمانی عەرەبی بەڵام هەر زوو زمانەکەی بۆ تورکمانی گۆڕا .

پ١٤ – لە چ ساڵێك بۆ یەکەم جار وزەی کارەبا گەیشتە شاری کەرکوك ؟

و : لەساڵی ١٩٢٧ .

پ١٥ – ئەو قوتابخانەیەی کچان کە بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٢١ لە شاری کەرکوك دامەزرا ناوی چی بوو ؟

و : ئاوچی .

پ١٦ – لە چ ساڵێکەوە خانەوادەی نەوتچی بەشێوەیەکی فەرمی جیاوکی دەرهێنانی نەوتیان لە چاڵە نەوتەکانی کەرکوك , لەلایان سوڵتانی عوسمانی پێدرابوو ؟

و : لەساڵی ( ١٨٨٩ ) ەوە .

پ١٧ – لە چ ساڵێك سەید محەمەدی جەباری لە دایك بوو ؟

و : ١٨٧٨ .

پ١٨ – لە چ ساڵێك سەید محەمەدی جەباری مردووە ؟

و : ١٩٣٦ .

پ١٩ – لە ساڵی ١٩٥٥ دا عێراق پلەی چەندەمی لەبەرهەم هێنانی نەوت لە جیهاندا بەدەست هێنا ؟

و : پلەی شەشەم .

پ٢٠– لە چ ساڵێك خەلیل پاشای مەنگور لە دایك بوو ؟

و : لە ساڵی ١٨٧٦ .

پ٢١ – لە چ ساڵێك خەلیل پاشای مەنگور مردووە ؟

و : لە ساڵی ١٩٥٧ .

پ٢٢ – خەلیل پاشای مەنگور سەر بە چ تەریقەتێكی سۆفیگەری بوو ؟

و : تەریقەتی نەقشبەندی .

پ٢٣ – لە چ ساڵێك راپەرینی خەلیل پاشای مەنگور دژی رەزا شای پەهلەوی دەستی پێكرد ؟

و : لە ساڵی ١٩٢٨ .

پ٢٤ – لە چ ساڵێك یاسای قەدەغەكردنی جل و بەرگی میللی لە ئێران و سەپاندنی لەبەر كردنی جل و بەرگی فەرەنگی و لەسەرنانی شەبقەی پەهلەوی دەرچوو ؟

و : كانوونی یەكەمی ساڵی ١٩٢٨ .

پ٢٥ – لە چ ساڵێك كاربەدەستانی عێراق هەڵستان بەهەڵوەشاندنەوەی خوێندن بەزمانی توركمانی لە عێراق دا ؟

و : لە ساڵی ١٩٣٧ .

پ٢٦ – لەساڵی ١٩٣٢ دا لەهەموو عێراقدا چەند پزیشکی عێراق هەبووە ؟

و : ٨١ .

پ٢٧ – ناوی ئەوتاکە پزیشکە ئافرەتە چی بوو کە ساڵی ١٩٥٤ لە لیوای کەرکوکدا بووە ؟

و : دکتۆرە مارگریت بەشیر رەسام .

پ٢٨ – جەمالەدین ئەفغانی لەسەر چ مەزهەب ( ئاینزا ) یەك بووە ؟

و : ئاینزای شیعە .

پ٢٩ – ناوی پەیمانامەی پورستمۆس لە چییەوە هاتووە ؟

و : لە بەندەری پورستمۆس کە پەیمانامەکەی تیادا مۆرکرا .

پ٣٠ – لە چ رێککەوتێك پەیمانامەی پورستمۆس مۆرکرا ؟

و : لە ١٥ ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ .

پ٣١ – لەلایەنی عێراقییەوە کێ پەیمانامەی پورستمۆرس مۆرکرد ؟

و : ساڵح جەبر .

پ٣٢ – لەلایەنی بریتانییەوە کێ پەیمانامەی پورستمۆسی مۆرکرد ؟

و : سکرتێری دەوڵەتی بریتانی بۆ کاروباری دەرەوە ( ئەرنست بیڤن ) .

پ٣٣ – شێخ حەبیبی تاڵەبانی چ پەیوەندییەکی بە پارتی نەتەوەیی سۆشیالیزمی ( حزب الامه الاشتراکی ) بوو ؟

و : لە دەستەی دامەزرێنەری پارتەکەبوو .

پ٣٤ – لە چ ساڵێك پارتی نەتەوەیی سۆشیالیزمی بە سەرۆکایەتی ساڵح جەبر دامەزرا ؟

و : لەساڵی ١٩٥١ .

پ٣٥ – ژمارەی موتەسەریفەکانی کەرکوك لەسەردەمی پاشایەتی چەندبوو ؟

و : ( ٢٤ ) موتەسەریف .

پ٣٦ – لەساڵی ١٩٢٢ – ١٩٢٤ کێ موتەسەریفی کەرکوك بووە ؟

و : فەتاح پاشا .

پ٣٧ – فەتاح پاشای موتەسەریفی کەرکوك رەگەزی چ بووە ؟

و : کورد .

پ٣٨ – لە ساڵی ١٩٢٤ – ١٩٢٧ کێ موتەسەریفی کەررکوك بووە ؟

و : عەبدولمەجید یەعقوبی .

پ٣٩ – عەبدولمەجید یەعقوبی موتەسەریفی کەکوك رەگەزی چ بووە؟

و : تورکمان .

پ٤٠ – لەساڵی ١٩٢٧ – ١٩٣٠ کێ موتەسەریفی کەرکوك بووە ؟

و : عومەر نەزمی وەنداوی .

پ٤١ – عومەر نەزمی وەنداوی موتەسەریفی کەرکوك نەتەوەی چ بووە ؟

و : تورکمان .

پ٤٢ – لە ساڵی ١٩٣٠ – ١٩٣١ کێ موتەسەریفی کەرکوك بووە ؟

و : تەحسین عەسکەری .

پ٤٣ – تەحسین عەسکەری موتەسەریفی کەرکوك نەتەوەی چ بووە ؟

و : کورد .

پ٤٤ – لە ساڵی ١٩٣١ – ١٩٣٢ کی موتەسەریفی کەرکوك بووە ؟

و : عەبدولحەمید عەبدولمەجید .

پ٤٥ – عەبدولحەمید عەبدولمەجید موتەسەریفی کەرکوك نەتەوەی چ بووە ؟

و : عەرەب .

پ٤٦ – لەساڵی ١٩٣٢ – ١٩٣٦ کێ موتەسەریفی کەرکوک بووە ؟

و : جەمیل پاشا ئەلراوی .

پ٤٧ – جەمیل پاشای ئەلراوی موتەسەریفی کەرکوک نەتەوەی چ بووە ؟

و : عەرەب .

پ٤٨ – لە ساڵی ١٩٣٦ – ١٩٣٨ کێ موتەسەریفی کەرکوک بووە ؟

و : حوسامەدین جومعە .

پ٤٩ – حوسامەدین جومعەی موتەسەریفی کەرکوک نەتەوەی چ بووە ؟

و : عەرەب .

پ٥٠ – لە ساڵی ١٩٣٨ – ١٩٣٩ کێ موتەسەریفی کەرکوک بووە ؟

و : ئەحمەد ئەلراوی .

پ٥١ – ئەحمەد ئەلراوی موتەسەریفی کەرکوک نەتەوەی چ بووە ؟

و : عەرەب .

پ٥٢ – لە ساڵی ١٩٣٩ – ١٩٤٠ کێ موتەسەریفی کەرکوک بووە ؟

و : عەبدولحەمید عەبدولمەجید .

پ٥٣ – عەبدولحەمید عەبدولمەجید موتەسەریفی کەرکوک نەتەوەی چ بووە ؟

و : عەرەب .

پ٥٤ – لە ساڵی ١٩٤٠ – ١٩٤١ کێ موتەسەریفی کەرکوک بووە ؟

و : فایەق شاکر .

پ٥٥ – فایەق شاکری موتەسەریفی کەرکوک نەتەوەی چ بووە ؟

و : عەرەب .

پ٥٦ – لە ساڵی ١٩٤١ – ١٩٤٤ کێ موتەسەریفی کەرکوک بووە ؟

و : مەکی ئەلشەربەتی .


چاپخانەی ڕۆژهەلات/هەولێر

میرانی صالح بەگی خۆران    میرانی قادر بەگ    میرانی رشید بەگ